


# ئەو پێنج کەسەی لە بەهەشت دەیانبینیت






میچ ئەلبوم • وەرگێڕانی جوتیار ژاژلەیی




# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

**بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید**

**بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود**

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە
سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم
http://www.endeshe.net
andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com
http://www.facebook.com/Andeshalib
07501026400

**زنجیرەکتێبی فیکر و ئەدەب**

**سەرپەرشتیاری زنجیرە**
**سیروان مەحمود**

ناوی کتێب: ئەو پێنج کەسەی لە بەهەشت دەیانبینیت
ناوی نووسەر: میچ ئەلبوم
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: جوتیار ژاژڵەیی
بەراوردکردن و پێداچوونەوەی: لۆنا دڵشاد مەریوانی
بابەت: ڕۆمان
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٧
چاپخانە: ئەندێشە
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
نرخ: (٦٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٥٢٩)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە.

ئەم کتێبە پێشکەشە بە مامی خۆشەویستم، ئێدوارد بێچمان، کە یەکەمین کەس بوو چەمکی *بەهەشتی* پێ ناساندم. هەموو ساڵێک، کاتێک بۆ نانی *جەژنی سوپاسگوزاری* کۆ دەبووینەوە، باسی ئەو شەوەی بۆ دەکردین، کە لە نەخۆشخانە خەبەری بووەتەوە و بینیویەتی ڕووحی هاوڕێ و خۆشەویستە کۆچکردووەکانی لەدەوری قەرەوێڵەکەی دانیشتوون و چاوەڕێی دەکەن. هیچکات مامم و چیرۆکەکەیم بیر ناچێتەوە.

هەریەکەمان تێڕوانینی خۆی بۆ بەهەشت هەیە، ئایینەکانیش بە هەمان شێوە، پێویستیشە ڕێز لە هەریەکێک لەو تێڕوانینانە بگیرێت. ئەو تێڕوانینەی لەم کتێبەدا خراوەتە ڕوو، تەنیا ئەگەرێکە، لە هەمان کاتیشدا خۆزگەیەکە بەو هیوایەی مامم و ئەوانەی وەک ئەو لە ژیاندا هەستیان بە گرنگیی خۆیان نەکرد، دواجار تێبگەن چەندە گرنگ و خۆشەویست بوون.

میچ ئەڵبوم

# کۆتایی

ئەمە چیرۆکێکە دەربارەی پیاوێک بە ناوی ئێدی. چیرۆکەکە لە کۆتاییەوە، بە مردنی ئێدی لەژێر تیشکی خۆردا، دەست پێ دەکات. ڕەنگە لات سەیر بێت چیرۆکێک لە کۆتاییەوە دەست پێ بکات، بەڵام هەموو کۆتاییەکان سەرەتاشن، تەنیا ئەوەیە ئێمە لە کاتی خۆیدا درکی پێ ناکەین.

دواکاتژمێری ژیانی ئێدی، وەک زۆربەی کاتژمێرەکانی تر، لە *شاری یاریی ڕووبی* تێپەڕی. ڕووبی شارێکی یاریی گەورە بوو، لەسەر زەریایەکی خۆڵەمێشیی بەرین. وەک هەر شارێکی یاریی تری هاوشێوە، ڕێگەیەکی دەستکردی دارینی بۆ پیاسە و هاتوچۆ تێدا دروست کرابوو. جگە لەمەش، چەرخوفەلەکێکی بەرز و *یاریی ڕەوڕەوەی مەرگ* و *سەیارەی پاکەوتن* و چەندین مێزی فرۆشتنی *نوقولی تۆفی*شی تێدا بوو، هۆڵێکی داخراویشی هەبوو بۆ یارییە جۆراوجۆرەکان و تیایدا دەتتوانی بە دەمانچەی ئاو، ئاو هەڵبدەیت بۆ ناو دەمی لێبووکێکی گاڵتێنە، کە بە جلی سەیر و پێکەنیناوییەوە بەرامبەرت دەوەستا و بەشێک بوو لە یارییەکە. شاری یاریی ڕووبی یارییەکی تازەی بۆ هاتبوو، بە ناوی *یاریی*

*کەوتنەخوارەوەی سەربەست*. ئەمە ئەو یارییە بوو، کە ئێدی بە هۆیەوە دەمرد و دواتریش هەواڵی مردنەکەی بە وڵاتدا بڵاو دەبووەوە.

ئەو ڕۆژەی مردن گەیشتە سەری، ئێدی پیاوێکی سەرسپیی پیری باڵاکورت بوو، ملێکی کورت و سینگێکی پانی هەبوو، قۆڵەکانی ئەستوور بوون، تاتۆیەکی سەربازیی کاڵبووەوەش لەسەر شانی ڕاستی نەخشێندرابوو. قاچەکانی باریک بوون و دەمارەکانیان دەر کەوتبوون، ئەژنۆی چەپیشی - کە لە جەنگدا بریندار بووبوو – بە هۆی هەوکردنی جومگەکەیەوە، تەواو پەکی کەوتبوو، بۆیە بۆ ڕۆیشتن، گۆچانی بەکار دەهێنا. پیری و تیشکەکانی خۆر دەموچاوی ئێدییان چرچ کردبوو، سمێڵە بابرەکەی و چەناگە دەرپەڕیوەکەشی خۆبەزلزانتر، لەوەی هەبوو، دەریان دەخست. زۆر جار، ئێدی جگەرەیەکی دەخستە سەرگوێی چەپی، چەند کلیلێکی بە قاییشەکەیەوە دەکرد، پێڵاوی بنتەختی لەپێ دەکرد و کڵاوێکی خامی کۆنیشی دەکردە سەری. بە جلە قاوەییە کاڵەکەیدا وا دەر دەکەوت، کارمەندی شاری یارییەکە بێت، هەر بەڕاستییش کارمەندی شاری یارییەکە بوو.

کاری ئێدی ئەوە بوو ئاگای لە یارییەکان بێت و دڵنیا ببێت لەوەی هیچ مەترسییەکیان تێدا نییە. هەموو پاشنیوەڕۆیەک، بە شاری یارییەکەدا دەگەڕا و لە نزیکەوە سەیری هەموو یارییەکانی دەکرد، هەر لە *یاریی کورسیی خولاوەوە* تا یارییە ئاوییەکان. ئێدی دەگەڕا بزانێت هیچ کورسییەک

نەشکاوە، هیچ بۆلتێک شل نەبووەتەوە، یان هیچ سکەیەک نەخوراوە. هەندێک جار دەوەستا و سەیری دەورووبەری خۆی دەکرد. ئەوانەی بەلایدا تێدەپەڕین، وایان دەزانی کێشەیەک هەیە، بەڵام ئێدی تەنها گوێی دەگرت و تەواو. دوای ئەو هەموو ساڵە لە کارکردن لەو شاری یارییە، ئێستا ئێدی دەیتوانی تەنها بە گوێگرتن لە تەقەتەق و خڕەخڕەکان، بزانێت یارییەکان کێشەیان تێدایە یان نا.

ئێدی، لەو پەنجا خولەکەدا کە لەسەر زەوی مابووی، دواپیاسەی خۆی بە شاری یاریی ڕووبیدا کرد. بەلای ژن و مێردێکی بەساڵاچوودا تێپەڕی، دەستێکی برد بۆ کڵاوەکەی و لەژێر لێوەوە پێی گوتن، "ها، چۆنن؟"

ژن و مێردەکە، بەڕێزەوە سەرێکیان بۆ لەقاند. ئەوانەی سەردانی ئەو شوێنەیان دەکرد – لانی کەم ئەوانەی زووزوو دەهاتن – ئێدییان دەناسی و لە خەیاڵی خۆیاندا ئەو شاری یارییە و ڕوخساری ئێدییان پێکەوە گرێ دابوو، بۆیە هاوین دوای هاوین دەر دەکەوتنەوە و ئێدییان لەوێ دەبینییەوە. ئەو کراسەی ئێدی بۆ ئیش لەبەری دەکرد، باجێکی پێوە بوو، لەسەری نووسرابوو *ئێدی* و لەخوار ناوەکەشیەوە، نووسرابوو *چاودێر*. هەندێک جار خەڵک بانگیان دەکرد و دەیانگوت، "چۆنی ئێدی چاودێر" بەڵام ئێدی، هیچ کاتێک، ئەمەی بەلاوە شتێکی پێکەنیناوی نەبوو.

بەڕێکەوت، ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی هەشتاوسێ ساڵەی ئێدی بوو. هەفتەی پێشوو پزیشکێک پێی گوتبوو، کە تووشی

نەخۆشیی شینگڵ* بووە. ئێدی هەر نەیدەزانی *تلۆق* چییە. سەردەمانێک ئەم پیاوە ئەوەندە بەهێز بوو، لە یەک کاتدا بە هەر دەستە ئەسپێکی *یاریی بابەخولێ*کەی هەڵدەگرت، بەڵام ئیتر ئەوە جاری جاران بوو.

"ئێدی! دە با منیش بێم! لەگەڵ خۆت سەرم بخە."

ئێدی چل خولەکی ماوە. بەرەو بەشی پێشەوەی *یاریی ڕەوڕەوەی مەرگ* ڕۆیشت. ئێدی بە لایەنی کەمەوە هەفتەی جارێک، بۆ ئەوەی دڵنیا ببێت لەوەی باش دەجووڵێن و بەبێ مەترسی دەوەستنەوە، سواری هەموو یارییەکان دەبوو. ئەمڕۆ سەرەی تاقیکردنەوەی یاریی ڕەوڕەوەی مەرگ بوو- ئەو یارییەی ناویان نابوو *ڕەوڕەوەی کیانکێشان*. ئەو منداڵانەی ئێدییان دەناسی، هاواریان دەکرد و داوایان لە ئێدی دەکرد لەگەڵ خۆی سەریان بخات.

منداڵان ئێدییان خۆش دەویست، بەڵام هەرزەکاران نا. هەرزەکار سەرئێشەیان بۆ دروست دەکرد. لە ماوەی ساڵانی کارکردنیدا لە شاری یاریی ڕووبی، ئێدی هەموو جۆرە هەرزەکارێکی بێئیشی مڕومۆچی بینیبوو، بەڵام منداڵان جیاواز بوون و کاتێک سەیری ئێدییان دەکرد – کە بە شەویلگە داکەوتووەکەیەوە وا دەر دەکەوت دۆلفین بێت و زەردەخەنەی کردبێت – متمانەیان پێ دەکرد، بۆیە هەر کە دەر دەکەوت، بەرەو ڕووی دەچوون، باوەشیان پێدا دەکرد و یارییان بە کلیلەکانی دەکرد، ئێدییش تۆزێک خۆی

---

* نەخۆشیی شینگڵ: نەخۆشییەکە و دەبێتە هۆی دروستبوونی تلۆق لەسەر پێست.

مۆن دەکرد و هیچی نەدەگوت. ئێدی دەیزانی منداڵان بۆیە خۆشیان دەوێت، چونکە زۆریان لەگەڵ ناڵێت.

ئێدی دەستی کێشا بە شانی دوو کوڕی منداڵدا، کە کڵاوی یاریی بەیسبۆڵیان بەپێچەوانەوە لەسەر کردبوو. کوڕەکان دەستبەجێ ڕایان کرد شوێنێک بۆ خۆیان بگرن و بچنە ناو یەکێک لە کورسییەکانی یارییەکەوە و بەئاقڵی دابنیشن. ئێدی گۆچانەکەی دایە دەست ئەو کارمەندەی لێپرسراوی یارییەکە بوو، ئینجا بەهێواشی خۆی نزم کردەوە و چووە نێوان کوڕە بچووکەکانەوە دانیشت.

یەکێک لە کوڕەکان لە خۆشییان هاواری کرد، "دەڕۆین، ئێستا دەڕۆین،" ئەوەی تریشیان دەستی ئێدیی گرت و خستیە سەر شانی خۆی. ئێدی دەسکی پێشەوەی کورسییەکەی بۆسەر باوەشی خۆی و کوڕەکان دادایەوە و خڕەخڕ یارییەکە بەرەوسەر کەوتە ڕێ.

ئێدی، کە خۆی لەم شاری یارییەدا گەورە بووبوو، قسەی ئەوەی لەسەر بوو، کە گوایە لە هەرزەکاریدا لە کۆڵانی خۆیان شەڕی کردووە. چیرۆکەکە بەم شێوەیە هاتبوو: پێنج منداڵی گەڕەکی پیتکین شەڕیان بە جۆی برای فرۆشتبوو، ئێدییش لەو ناوە، لەسەر پلیکانەکانی بەردەگای ماڵێک خەریکی لەفەخواردن بووبوو، لەناکاو قیژەی جۆ هاتبوو، بۆیە ئێدی دەستبەجێ ڕای کردبوو بۆ کۆڵانەکە و لەوێ بە یەک سەرەتەنەکەخۆڵی گەورە، هەردوو منداڵەکەی ڕەوانەی نەخۆشخانە کردبوو.

دوای ئەوەش جۆ، لە شەرمەزاریدا، دوو مانگ قسەی

لەگەڵ ئێدی نەکردبوو. جۆ نۆبەرەی خێزانەکە بوو، کەچی ئێدی لەسەر ئەوی کردبووەوە.

"ئێدی، توو خوا با یەک جاری تر تازەی بکەینەوە، باش؟"

ئێدی سیوچوار خولەکی مابوو. دەسکەکەی بەردەم خۆی و منداڵەکانی بەرز کردەوە و مەساسەیەکی بە هەریەک لە منداڵەکان دا، ئینجا بەشەلەشەل چوو بۆ وەرشەی ئامێر و یارییەکان، تا لەوێ تۆزێک خۆی فێنک بکاتەوە. ئێدی، ئەگەر بیزانییایە مردنەکەی ئەوەندە نزیک بووەتەوە، ڕەنگە بچووایە بۆ شوێنێکی تر، بەڵام ئەوەی کرد، کە هەریەکێکمان دەیکرد: لەسەر هەمان شتە ڕۆتینییەکانی ڕۆژەکەی بەردەوام بوو، وەک ئەوەی هەموو ڕۆژەکانی دونیا هیی ئەو بن و جارێ نەهاتبن.

یەکێک لەو کارمەندانەی لە وەرشەکەدا کاری دەکرد، کوڕێکی سیسەڵە بوو بە ناوی *دۆمینگێز*. دۆمینگێز ئەوەندە سیس بوو، ئێسقانەکانی ڕوومەتی دەر پەڕیبوون. بۆخۆی لای بەرمیلی ڕۆنە ڕەشەکەوە خەریک بوو گریسی تایەیەکی دەسڕی.

گوتی، "هاااا ئێدی!"

ئێدی وەڵامی دایەوە، "هاااا!"

وەرشەکە بۆنی وردەداری لێ دەهات، تاریک و قەرەباڵغ بوو، بنمیچەکەشی زۆر نزم بوو. بە یەکێک لە لادیوارەکانیەوە تەختەیەکی کونکونی گەورە هەڵواسرابوو، کە سەرتاپای دریڵ و مشار و چەکوش و شتی وای پێدا هەڵواسرابوو. پارچەی

یارییەکان، هەر لە کۆمپرێسەر و مەکینە و قاییش و گڵۆپ و بەشی سەرەوەی جەستەی چەتەیەکی دەریا، لەو ناوە بڵاو بووبوونەوە. لەپاڵ یەکێک لە دیوارەکاندا، قووتووی بەتاڵی قاوە دانرابوون و پڕ کرابوون لە بزمار و برغوو، بەردەم دیوارەکەی ئەوبەریش، هەمووی سەتڵە گریس بوو.

ئێدی هەموو جارێک دەیگوت، قاپشتن چەندەی ئەقڵ دەوێت، گریسکردنی زنجیر و پارچەی یارییەکانیش هەر ئەوەندە، تەنیا ئەوەیە لە دووەمیاندا لەجیاتیی ئەوەی دەستت پاک ببێتەوە، پیس دەبێت. ئێدی خۆشی ئەم جۆرە ئیشانەی دەکرد: گریسکردن، تایمدانی ئیستۆپی یارییەکان، توندکردنەوەی بۆڵتەکان و سەیرکردنی بۆردی کارەباییی یارییەکان. لە ڕاستیدا، ئێدی زۆر جار ئاواتی خواستبوو ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت و ئیشێکی تر بدۆزێتەوە و ژیانێکی تازە بۆ خۆی پێکەوە بنێت، بەڵام شەڕ نەیهێشتبوو، بۆیە پلانەکانی ئەویش هەرگیز سەریان نەگرتبوو. لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا، ئێدی تێبینیی کرد سەری خەریکە سپی دەبێت و پانتۆڵی فشتر لەبەر دەکات. هەرچۆنێک بێت، بەناچاری ئێستای ژیانی خۆی قبوڵ کرد، بەڵام دەیزانی داهاتووشی هەر وا دەبێت، دەیزانی دەبێت ئەوەی کە لە تەمەنی ماوەتەوە – بە هەمان شێوەی ئەوەی لە تەمەنی ڕۆیشتبوو – هەر لەسەر ڕۆخی دەریا و لەنێو بۆنی سۆسجی سوورکراوە و پێکەنینی ساختەدا بەسەر بەرێت.

ئێدی، وەکوو باوکی، کارمەندی *بەشی وەرشە* بوو، لەسەر پینەکەی سەرسینگی کراسەکەشی نووسرابوو *چاودێر.* لە ڕاستیدا، ئێدی *لێپرسراوی چاودێران* بوو، یان

وەک منداڵەکان دەیانگوت، ئێدی "کابرای یارییەکانی شاری یاریی ڕووبی" بوو.

ئێدی سی خولەکی ماوە.

دۆمینگێز گوتی، "ئەرێ بیستوومە ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونتە! بەخۆشی، بەخۆشی."

ئێدی هیچی نەگوت.

"ئەی ئاهەنگێک، شتێکمان بۆ ناکەی؟"

ئێدی بە شێوەیەک سەیری دۆمینگێزی کرد، وەک ئەوەی بە شێتی بزانێت. بۆ ساتێک بیری لەوە کردەوە کە چەند سەیرە لە شوێنێکدا پیر ببێت، کە یەکپارچە بۆنی پەشمەکی لێ بێت.

"ئێدی گیان، من هەفتەی داهاتوو لە دووشەممەوە لێرە نابم، دەڕۆم بۆ مەکسیک."

ئێدی سەرێکی لەقاند و دۆمینگێز سووکەسەمایەکی کرد.

"لەگەڵ تێریسا، دەڕۆین کەسوکار بەسەر دەکەینەوە... بۆخۆمان دەیکەین بە بەزم و جەفەنگ."

کاتێک دۆمینگێز زانیی ئێدی بەوردی لێی دەڕوانێت، لە سەماکەی وەستا، ئینجا گوتی، "تۆ قەت چووی؟"

"بۆ کوێ؟"

"مەکسیک."

ئێدی، بە لووت هەناسەیەکی دایەوە، "کاکی خۆم، من بەس چووم بۆ ئەو شوێنانەی بە چەکەوە نێردراوم بۆیان."

دۆمینگێز خەریک بوو دەگەڕایەوە بۆ لای بەرمیلی ڕۆنە ڕەشەکە. ئێدی سەیرێکی کرد و بۆ ساتێک بیری

کردەوە، ئینجا سەفتەیەکی بچووک پارەی دەر هێنا و ئەو دوو بیستدۆلارییەی دەر کێشان، کە تێیدا بوون، "ها، بگرە. شتێکی جوانی پێ بکڕە بۆ ژنەکەت."

دۆمینگێز سەیری پارەکەی کرد، زەردەخەیەکی قووڵی کرد و گوتی، "ئەوە بەڕاستتە؟"

ئێدی پارەکەی خستە ناو مستی دۆمینگێز و ڕۆیشت بۆ کۆگەی هەڵگرتنی ئامێرەکان. چەند ساڵێک لەوەوبەر کونێکی بچووکی ماسیگرتن لەسەر ئەو ڕێگە دارینەیە دروست کرابوو، کە خەڵک پیاسەیان بەسەردا دەکرد. ئێدی سەرقاپی پلاستیکیی سەر کونەکەی لا برد و سەیرێکی خوارەوەی کرد. هێشتا هەویرەکە هەر بە قولاپەکەوە مابوو.

دۆمینگێز بە دەنگی بەرز گوتی، "چییە، هیچمان نەگرتووە؟ توو خوا بڵێ گرتوومانە!"

ئێدی پێی سەیر بوو کە دۆمینگێز ئەوەندە گەشبین بوو بەو ڕاوەماسییە، چونکە ئەوان هەمیشە قولاپەکەیان بەبەتاڵی هەڵکێشابووەوە سەرەوە.

دۆمینگێز دووبارە هاواری کردەوە، "هەر ڕۆژێک دێ ماسییەکی *هەلبووت** بگرین."

ئێدی لەژێر لێوەوە گوتی، "بەڵێ، بەڵێ، دەیگرین." هەرچەندە باش دەیزانی ماسیی وا گەورە هەرگیز بەو کونە بچووکەدا نایەتە سەرەوە.

ئێدی بیستوشەش خولەکی ماوە. بەرەو کۆتاییی ڕێگە

---

* هەلبووت گەورەترین جۆری ماسیی پانە و بۆ خواردن دەشێت. بەزۆری لە زەریای بەستەڵەکی باکووردا دەژی.

دارینەکە ڕۆیشت. ئەو ڕۆژە شوێنەکە زۆر جانجاڵ نەبوو. کچی پشت مێزەکە بۆخۆی ئانیشکی دادابوو، گلۆپی بە بنێشتەکەی دەکرد و دەیتەقاند.

جاری جاران، شاری یاریی ڕووبی خۆشترین شوێن بوو لە وەرزی هاویندا. فیلی لێ بوو، یاریی ئاگرینی لێ دەتەقێنرا، پێشبڕکێی سەمای تێدا دەکرا، بەڵام ئێستا ئیتر خەڵک ئەوەندە نەدەچوون بۆ ئەو شاری یارییانەی لەسەر دەریا بوون، بەڵکوو لەجیاتیی ئەوە، دەچوون بۆ ئەوانەی تیایاندا بە حەفتاوپێنج دۆلار بلیتێکت دەکڕی و وێنەیەکت لەگەڵ کارەکتەرێکی گەورەی ناو فیلم کارتۆنەکانیش دەگرت. ئێدی بەشەلەشەل خۆی گەیاندە یاریی سەیارەی پیاکەوتنەکە و بینیی کۆمەڵێک هەرزەکار خۆیان بەسەر محەجەرەکەدا شۆڕ کردووەتەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی، "بە خوا جوانە! هەر لە ئەمەمان کەم بوو."

ئێدی بە گۆچانەکەی بە محەجەرەکەیدا کێشا و گوتی، "وەرنە دواوە، ئەو خۆشۆڕکردنەوەیە سەلامەت نییە."

هەرزەکارەکان بەمۆنی سەیرێکی ئێدییان کرد. سەیارەکان شیشێکی درێژیان پێوە بوو، کە لە سەرەوە لە تەلی کارەبایی دەدا و قرچەقرچی دروست دەکرد.

ئێدی لێی دووبارە کردنەوە، "سەلامەت نییە، کاکە گیان."

هەرزەکارەکان سەیرێکی یەکتریان کرد. یەکێکیان، کە تۆزێکی قژی پرتەقاڵی کردبوو، خێسەیەکی لە ئێدی کرد و بازی دایە ناو مەیدانی سووڕانەوەی سەیارەکان.

کوڕەکە دەستی بۆ شۆفێرەکان ڕادەوەشاند و بە دەنگی بەرز دەیگوت، "دەی، دەی لێم بدەن، لێم..."

ئێدی ئەوەندە بەقاییمی گۆچانەکەی بە محەجەرەکەدا

کێشا، خەریک بوو گۆچانەکەی دوولەت ببێت.
"وەرە دەرەوەەەەەە!"
هەرزەکارەکان قووچاندیان.

ئێدی قسەیەکی تریشی لەسەر بوو. ئەو کاتەی سەرباز بووبوو، چەندین جار بەشداریی شەڕی کردبوو، ئازایانەش جەنگابوو، تەنانەت مەدالیایەکی ئازایەتییشی پێ بەخشرابوو، بەڵام لە ماوەی کۆتاییی خزمەتەکەیدا، لەگەڵ یەکێک لە سەربازەکانی خۆیان کردبووی بە شەڕ، بەو هۆیەشەوە بریندار بووبوو. کەسیش نەیزانی چی بەسەر ئەو سەربازە هات، کە ئێدیی بریندار کرد.
لە ڕاستیدا کەس لە هەواڵی نەپرسییەوە!

ئێدی، لەو نۆزدە خولەکەدا کە مابووی، بۆ دواهەمین جار لەسەر کورسییەکی ئەلەمنیۆمی کۆن دانیشت. قۆڵە کورتە بەهێزەکانی وەک دەستی سەگی دەریا خستبووە سەر سینگی. تیشکی خۆر قاچەکانی سوور کردبووەوە، ئەژنۆی چەپیشی هێشتا نیشانەی برینداربوونی پێوە مابوو. لە ڕاستیدا، زۆربەی ئەندامەکانی جەستەی ئێدی بەئاشکرا پێیان دەگوتی، کە ئەو پیاوە زۆر شتی قورسی بەسەر هاتووە و ڕزگاری بووە. بە هۆی ئەو هەموو شکاوییانەشەوە کە لە کاتی چاککردنەوەی مەکینە و ئامێرەکاندا تووشیان بووبوو، پەنجەکانی بە گۆشەی سەیر خوار بووبوونەوە. لەو شەڕانەدا کە ئێدی پێی دەگوتن *شەڕی هەرزەکارانە*، چەند جارێک لووتی شکابوو. ڕەنگە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو

دەموچاو و شەویلگە پانەی قۆز دەریان خستبێت، هەر وەک یاریزانێکی یاریی بۆکسێن، پێش ئەوەی بەرامبەرەکەی بەر بۆکسی بدات.

ئێدی ماندوو دیار بوو. لەسەر ڕێگە دارینەکە و لە جێگە تایبەتییەکەی خۆی، کە دەکەوتە پشت *یاریی ڕەوڕەوەی کەروێشکەوە*، دانیشت. هەر ئەو شوێنە لە هەشتاکاندا *یاریی هەورەتریشقە* بوو، لە حەفتاکانیشدا *یاریی ماری ستیل* و لە شەستەکاندا *یاریی بابەخولی مەساسە* و لە پەنجاکاندا *یاریی تونێلی ترس* و پێش ئەوەش، سەکۆیەکی گۆرانیگوتن و نمایش بوو بە ناوی *سەکۆی ستاردەست*. ئا لەم سەکۆیەدا بوو، کە ئێدی بۆ یەکەمین جار *مارگرێتی* بینی.

ژیانی هەموو کەسێک، یەک دیمەنی خۆشەویستیی ڕاستەقینەیی تێدایە. لە ژیانی ئێدیدا، ئەو دیمەنە لە دوانیوەڕۆیەکی گەرمی مانگی ئەیلولدا هات، ئەویش دوای گەردەلوولێک، کە ڕێگە دارینەکەی وەک ئیسفنج خووساند. مارگرێت عەزییەکی لۆکەی زەردی لەبەردا بوو، تەوقەیەکی پەمەییش بە قژیەوە بوو. ئێدی زۆر قسەی نەدەکرد، ئەوەندە نائارام بوو، دەتگوت زمانی بە مەڵاشوویەوە نووساوە. ئێدی و مارگرێت پێکەوە بۆ ئەو مۆسیقایە سەمایان کرد، کە گرووپی بەناوبانگی *لۆنگ لێک دیلانێی و ئۆرکستڕای ئێڤەرگلەید* لەسەر سەکۆکە لێیان دەدا. ئێدی شەربەتێکی لیمۆی بۆ مارگرێت هێنا. مارگرێت گوتی، کە دەبێت پێش ئەوەی دایک و باوکی توورە ببن، بڕوات، بەڵام لەگەڵ ڕۆیشتنیدا، ئاوڕێکی دایەوە و دەستێکی بۆ ئێدی بەرز کردەوە.

ئەمە دیمەنەکەی ناو ژیانی ئێدی بوو. ئێدی، تا کۆتاییی ژیانیشی، هەرکاتێک بیری لە مارگرێت دەکردەوە، ئەو دیمەنەی دەهاتەوە بەرچاو: دەست بەرزکردنەوەکەی و قژە ڕەشەکەی - کە بەسەر چاوێکیدا هاتبووە خوار- لە دڵیشیدا/ هەمان هەستەکانی ئەو ساتەی بۆ دەگەڕایەوە.

ئێدی، هەر ئەو شەوە، دوای ئەوەی گەیشتەوەماڵەوە، برا گەورەکەی خەبەر کردەوە و پێی گوت، ئەو کچەی بینیوە، کە دەبێتە هاوسەری.

براکەی بەپەستی گوتی، "باشە تۆش! دە بڕۆ بخەوە، دەی."

*وششششش!* شەپۆلێک خۆی بە کەنارەکەدا دا. ئێدی کۆکی و شتێک لە دەمی هاتە دەرە، بەڵام نەیویست بزانێت چییە. تفێکی کرد و ئاسایی بووەوە.

*وششششش!*

ئێدی جاران زۆر بیری لە مارگرێت دەکردەوە، بەڵام ئێستا کەمتر. لای ئێدی، مارگرێت وەک برینی ژێر لەفافێکی کۆنی لێ هاتبوو. ئێستا ئیتر بە لەفافەکە ڕاهاتبوو.

*وششششش!*

نەخۆشیی شینگڵ؟

*وششششش!*

ئێدی شازدە خولەکی مابوو.

هیچ چیرۆکێک تەنیا نییە، هەندێک جار چیرۆکەکان لە پەناوپەساردا یەکتر دەبینن و یەک دەگرن، هەندێک جاریش

وەک چەوی بنی ڕووبارەکان، تەواو تێکەڵی یەکتر دەبن.

کۆتاییی چیرۆکەکەی ئێدی لەگەڵ چیرۆکێکی تر - کە ئەو کاتە زۆر سادە دەر دەکەوت - تێکەڵ بوو. سەرەتای ئەم چیرۆکەی تر دەگەڕایەوە بۆ چەند مانگێک لەوەوپێش کاتێک لە شەوێکی هەوردا، کوڕێکی گەنج و سێ هاوڕێی هاتبوون بۆ شاری یاریی ڕووبی.

کوڕە گەنجەکە - کە ناوی *نیکی* بوو - تازە فێری شۆفێری بووبوو، بۆیە جارێ زۆر باش نەیدەزانی ئاگای لە مەدالیای کلیلەکانی بێت و هەڵی بگرێت، لەبەر ئەوە سویچەکەی لێ کردبووەوە و بە جیا لە گیرفانی چاکەتەکەیدا هەڵی گرتبوو، چاکەتەکەشی بە ناوقەدیەوە گرێ دابوو.

لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا، نیکی و هاوڕێکانی هەموو یارییە خێراکانی شاری یاریی ڕووبییان تاقی کردەوە: *هەڵۆ فڕیوەکە، یاریی هەڵگەڕانەوە، کەوتنەخوارەوەی سەربەست،* لە کۆتاییشدا، *یاریی ڕەوڕەوەی مەرگ.*

یەکێک لە هاوڕێکانی نیکی هاواری کرد، "دەستتان بەرز بکەنەوە، ئاوا زۆر خۆشە."

هەموو دەستیان بەرز کردەوە.

دواتر، کاتێک دونیا تاریک بوو، نیکی و هاوڕێکانی بەشەکەتی و بەدەم پێکەنین و بیرەخواردنەوەوە هاتنەوە بۆ گەراجەکە. نیکی دەستی بە گیرفانی چاکەتەکەیدا کرد، بۆ سویچەکە گەڕا و لەبەر خۆیەوە جنێوێکی دا؛ سویچ نەمابوو!

ئێدی چواردە خولەکی مابوو. بە دەستەسڕێک برۆکانی سڕی. تیشکە ئاڵتوونییەکانی خۆری ئەو پاشنیوەڕۆیە لەسەر

ڕووی زەریاکە سەمایان دەکرد و ئێدییش بەوردی سەیری جوولە خێراکانیانی دەکرد. ئێدی لە سەردەمی سالآنی جەنگەوە لەسەر قاچەکانی خۆی قنجوقیت نەوەستابوو، بەلام کاتی خۆی، تا ئەو کاتەش کە مارگریتی لە سەکۆی ستاردەست بینی، چالاک و سووکەڵە مابووەوە. ئێدی چاوەکانی نووقاند و ئەو گۆرانییەی هێنایەوە بیری خۆی، کە ئەو و مارگریتی پێکەوە گرێ دەدا. *جوودی گارلاند* گۆرانییەکەی لە فیلمێکدا گوتبوو. ئێستاش، لەگەڵ دەنگی شەپۆلەکان و قیژەی ئەو منداڵانەی سواری یارییەکان ببوون، گۆرانییەکە لە مێشکی ئێدیدا تێکەڵ بووبوو.

"وات لێ کردم خۆشم بوێت..."

*شششششش*

... " مەهێڵە. من نەمدەویست...."

*شلااااااپ*

"خۆۆۆشم بوێێێت."

*مێێێێی*

..." دەتزانی و هەموو شتێک..."

شششششش

..." خۆم دەمزانی..."

ئێدی هەستی بە دەستەکانی مارگرێت کرد لەسەر شانی. بۆ خاتری ئەوەش کە یادگارییەکە بەتەواوی زیندوو بکاتەوە، چاوەکانی توند نووقاند.

یازدە خولەک ماوە.

"بە یارمەتیت."

کچێک، کە تەمەنی هەشت -نۆ ساڵێک دەبوو، لە بەردەم ئێدیدا وەستا و بەری خورەکەی لێ گرت. کچەکە قژی زەرد و لوول بوو، شۆرتێکی کاوبۆی کورت و تیشێرتێکی سەوزی کاڵی لەبەردا بوو - وێنەی مراوییەک لەسەر بەشی پێشەوەی تیشێرتەکەی بوو-جووتێک نەعلی یەکتاڵیشی لەپێ کردبوو. ئێدی وای بۆ دەچوو، ناوی *ئەیمی* یان *ئانی* بێت. دڵنیا نەبوو. تا ئەو کاتە، ئێدی ئەو کچەی لەگەڵ دایک، یان باوکی نەبینیبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو هاوینە کچەکە زووزوو دەهات بۆ شاری یارییەکە.

کچەکە دووبارە گوتی، "بە یارمەتیت، کاک ئێدیی چاودێر."

ئێدی هەناسەیەکی دایەوە و گوتی، "بڵێ *ئێدی* و تەواو."

"ئێدی؟"

"فەرموو، چی؟"

"دەتوانی هێنێکم بۆ دروست..."

کچە، وەک ئەوەی نزا بکات، دەستەکانی بەیەکەوە نووساند و بەرەو ئێدی بەرزی کردنەوە.

"دەی، ڕۆڵە، بیڵێ، درەنگمە."

"دەتوانی ئاژەڵێکم بۆ دروست بکەی؟"

ئێدی، وەک ئەوەی بیر لە وەڵامێک بکاتەوە بۆ پرسیاری کچەکە، سەرێکی بەرز کردەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا، ئینجا دەستی کرد بە گیرفانی کراسەکەیدا و سێ دانە لەو پارچە تەلە باریکانەی دەر هێنا، کە بەرگێکی قوماشیان تێ گیرابوو. لە بنەڕەتدا، تەلەکان زیاتر بۆ پاککردنەوەی سەبیلی جگەرەکێشان بەکار دەهاتن، بەڵام ئێدی تەنیا بۆ ئەم بەزمی

ئاژەڵدروستکردنە هەڵی دەگرتن.

کچەکە لە خۆشییان دەستی کرد بە چەپڵەلێدان، "هێبی، بۆم دروست دەکا."

ئیدی دەستی کرد بە نووشتانەوە و هێنان و بردنی تەلە باریکەکان.

"ئەی دایک و باوکت کوان؟"

"چوون سواری یارییەکان ببن."

"ئەی بۆ تۆیان نەبردووە؟"

کچە شانێکی بەرز کردەوە و گوتی، "دایکم لەگەڵ خۆشەویستەکەیەتی."

ئیدی سەرێکی بەرز کردەوە. لە شتەکە تێگەیشت.

ئیدی چەند جارێک تەلەکانی نووشتاندەوە و تێکهەڵکێشی کردن. ئێستا دەستەکانی دەلەرزین، بۆیە دروستکردنی ئاژەڵ و ئەو شتانە کاتی زۆرتری لە جاران دەویست، بەلام هەر زوو تەلەکان سەرێک و گوێچکە و لەش و کلکێکیان لێ دروست بوو.

کچە بچووکەکە گوتی، "هێبی، کەرویشک!"

ئیدی چاوێکی لێ داگرت.

"سوپاااااس."

کچەکە ڕای کرد بۆ لای یارییەکان و خۆی لەو ناوەدا ون کرد. ئەو شاری یارییە شوێنێک بوو، تیایدا منداڵان خەریک بوو لە خۆشییاندا باڵیان دەگرت. ئیدی دووبارە برۆکانی سڕی و چاوەکانی داخست، ئینجا خۆی دایەوە بە کورسییەکەدا و هەوڵی دا گۆرانییەکە بهێنێتەوە ناو مێشکی. نەورەسێک قیڕەیەکی کرد و بەرەو سەرەوە لە شەقەی باڵی دا.

باشە خەڵک چۆن وشەکانی دواساتی ژیانیان هەڵدەبژێرن؟ تۆ بڵێی خۆیان هەست بکەن ئەوەندەیان لە ژیاندا نەماوە، بۆیە وا ژیرانە دەدوێن و مامەڵە دەکەن؟

ئێدی، تا ئەم ساتە، تەمەنی گەیشتبووە هەشتاوسێ ساڵ، زۆربەی زۆری خۆشەویست و کەسوکارەکەی نەمابوون. هەندێکیان هەر بەگەنجی مردبوون، هەندێکی تریان دەرفەتیان درابوو پیر ببن و دواتر نەخۆشییەک یان ڕووداوێک لەگەڵ خۆی بردبوونی. لە کاتی مەراسیمی بەخاکسپاردن و پرسەکاندا، ئێدی گوێی لێ دەبوو ئامادەبووان دەربارەی دواگفتوگۆی خۆیان لەگەڵ مردووەکە دەدوان و دەیانگوت، "بڕوا بکەن، دەتگوت دەزانێ کە دەمرێ!"

ئێدی هەرگیز بڕوای بەم جۆرە قسانە نەدەکرد، ئەو دەیگوت هەرکاتێک سەرەت هات، دێت و تەواو. دەشێت چەند ساتێک پێش مردنەکەت، شتێکی ژیرانە بڵێیت، بەڵام خۆ دەشێت شتێکی بێمانا و هیچیش بڵێیت.

با هەر لێرەوە پێتان بڵێم، کە دوایین دوو وشەی ئێدی ئەمانە دەبن، "وەرنە دواوەەەە!"

ئەمانە ئەو دەنگانەن، کە لە دواساتەکانی ژیانی ئێدیدا دەبیسترێن: دەنگی شەپۆلەکان - کە دەیدەن بە کەنارەکەدا - دەنگی مۆسیقای ڕۆک، دەنگی فڕەفڕی مەکینەی فڕۆکەیەکی بچووک، کە ڕیکلامێکی گەورەی بە کلکەکەیەوە بەستووە و دەسووڕێتەوە، ئەم دەنگەش، "ئەی هاوار! سەیر بکەن!"

چاوەکانی ئێدی لەژێر پێڵووەکانیانەوە خێراخێرا دەجووڵان. بەدرێژاییی چەندین ساڵ کارکردن لە شاری یاریی ڕووبی،

ئێدی وای لێ هاتبوو هەموو دەنگەکانی ئەوێی لە یەکتر جیا دەکردوە و وەک لایلایە پێیان دەخەوت.

بەڵام ئەم جارەیان ئەو دەنگەی کە دەیگوت، "ئەی هاوار! سەیر بکەن!" بەشێک نەبوو لە لایلایەکە!

ئێدی قنج بووەوە. ژنێکی قۆڵئەستوور بە خۆی و عەللاگەکەی دەستیەوە، دەستی بۆ شتێک ڕادەکێشا و هاواری دەکرد. دەستبەجێ خەڵک لە ژنەکە کۆ بوونەوە و هەموو چاویان لە ئاسمان بڕی. ئێدییش سەیری کرد و شتەکەی بینی. لەسەری سەرەوەی *یاریی کەوتنەخوارەوەی سەربەستدا*، یەکێک لە کورسییەکان - وەک ئەوەی بیەوێت نەفەرەکانی هەڵبڕژێت – بە لایەکدا لار بووبووەوە. کورسییەکە چوار نەفەری تێدا بوو: دوو پیاو و دوو ژن. تەنیا یەک شیشی ئاسن هەرچوار نەفەرەکەی ڕاگرتبوو، بۆیە نەفەرەکان هەموو هەوڵێکیان دەدا، تا شتێکی تر بدۆزنەوە و دەستی پێوە بگرن و نەکەونە خوارەوە.

ژنە قەڵەوەکە هاواری دەکرد، "ئەی هاوار، فریای ئەو خەڵکە بکەون، دەکەونە خوارەوە."

قیڕەیەک لە ڕادیۆکەی سەر کەمەری ئێدییەوە بەرز بووەوە، "ئێدی! ئێدییی!"

ئێدی پەنجەی بە دوگمەی وەڵامدانەوەدا نا، "چاوم لێیەتی! خێرا تیمی فریاکەوتن بنێرن، خێراا."

خەڵک لە کەناردەریاکەوە بەڕاکردن - وەک ئەوەی پێشتر خۆیان بۆ ئەم جۆرە ڕووداوانە ئامادە کردبێت - بەرەو شوێنەکە دەهاتن. هەموو ئەوانەی لەوێ خڕ بووبوونەوە بە یەکتریان دەگوت، "سەیری سەرەوە بکە! چۆن ئەو یارییە

لەو خەڵکە کەر بوو." ئێدی گۆچانەکەی هەڵگرت و بەقاییمی کێشای بەو محەجەرە ئاسنەدا، کە لە خوارەوە، لەدەوری یارییەکە دروست کرابوو. کلیکەکانی سەر کەمەری لەرینەوە. دڵی ئێدی زۆر خێرا لێی دەدا.

لە *یاریی کەوتنەخوارەوەی سەربەستدا*، دەبوو دوو کورسی بەیەکەوە، بەخێراییەکی زۆر، بێنە خوارەوە و لە ساتی کۆتاییدا بە ئیستۆپێکی هایدرۆلیکی بوەستنەوە، ئێستا چۆن بوو تەنیا یەک کورسی بەو شێوەیە لار بووبووەوە؟ کورسییەکە - وەک ئەوەی ویستبێتی بکەوێتە خوارەوە و لەناکاو رای گۆڕیبێت - تەنیا چەند پێیەک هاتبووە خوار ئەو شوێنەی نەفەرەکان لێوەی سواری یارییەکە دەبوون.

ئێدی خۆی گەیاندە دەرگای یارییەکە. هەناسەی لەبەر براببوو. دۆمینگێز بەڕاکردن گەیشتە لای ئێدی و خەریک بوو خۆی پێدا بدات.

ئێدی ئەوەندە بەتوندی شانی دۆمینگێزی گرت، دەموچاوی دۆمینگێز لە ئازاردا گرژ بوو. ئێدی پێی گوت، "گوێ بگرە! چ کارمەندێک لە سەرەوەیە؟"

"ویلی."

"باشە، ڕەنگە دەستی نابێ بە دوگمەی وەستانی کتوپڕدا، بۆیە کورسییەکە وەستاوەتەوە. هەر ئێستا بە پەیژەکەدا سەر بکەوە و بە ویلی بڵێ قاییشی نەفەرەکان بکاتەوە و پێکەوە، یەکەیەکە، دەریان بهێنن، باشە؟ قاییشی سەلامەتییەکە لە بەشی پشتەوە دەکرێتەوە، بۆیە تۆ دەبێ ویلی بگری، ئەویش خۆی شۆڕ بکاتەوە و قاییشەکان بکاتەوە، باشە؟ ئینجا... ئینجا هەردووکتان، هەردووکتان نەک یەکێکتان، دەستیان

بگرن و بیانهێننە دەرەوە، تێدەگەی؟ هەریەکەتان و ئەوەی تر بگری، تێگەیشتی؟ تێگەیشتیی؟"

دۆمینگێز بەخێرایی سەری لەقاند.

"ئینجا ئەو کورسییە قۆڕە بخەنە خوارەوە، بزانین بۆ وای لێ هاتووە."

ئێدی دەماری سەری بەرز بووبووەوە. هەرچەندە لە ماوەی خزمەتی ئەودا هیچ ڕووداوێکی خراپ ڕووی نەدابوو، بەڵام ئێدی مەترسییەکانی ئیشەکەی خۆی چاک دەزانی. جارێکیان لە برایتن*، لە *یاریی گەندۆلا*کەدا، بۆڵتێک شل بووبووەوە و دوو کەس تێدا چووبوون. جارێکی تر لە *پارکی خەونەکان*، پیاوێک ویستبووی بەسەر ڕێگەی ئاسنینی *یاریی ڕەورەوەی مەرگ*ەکەدا بپەڕێتەوە، بەڵام قاچی کەوتبووە ناو ئاسنەکانەوە و لەوێدا گیری خواردبوو، دواتریش نەیتوانیبوو بێتە دەرەوە و هەر هاواری کردبوو، بەڵام پاش کەمێک، عەرەبانەکە بە خۆی و نەفەرەوە بەرەو ڕووی هاتبوو... ئیتر ئاوا!

ئێدی ئەو بیرکردنەوانەی لە مێشکی خۆی دەر کرد. ئێستا تەواوی چواردەوری خەڵک بوو، هەموو دەستیان خستبووە سەر دەمیان و سەیری دۆمینگێزیان دەکرد، کە بە پەیژەکەدا سەر دەکەوتە سەرەوە. ئێدی هەوڵی دا بیری بکەوێتەوە پارچەکانی یارییەکە چین: مەکینەیەک، سلندەرێک، هایدرۆلیک، بۆربڕێنێک و کێبڵێک. بیری دەکردەوە بزانێ

---

* شارێکە لە باشووری بەریتانیا و دەکەوێتە سەر کەناری کەنداوی ئینگلیزی. شارێکی یاریی گەورە لەسەر کەنارەکە دروست کراوە، کە بە زمانی ئینگلیزی پێی دەگوترێت "Pier".

چۆن ئەو کورسییە وای لێ هاتووە. لە دوورەوە، هەر بە چاو لە یارییەکە ورد بووەوە و لە چوار کەسە تۆقیوەکەی سەرەوەوە، تا بەشی خوارەوە، سەیری مەکینە و سلندەر و بۆربڕین و کێبڵ و هەموو شتێکی کرد.

دۆمینگێز گەیشتە سەرەوە و ئەوەی کرد، کە ئێدی پێی گوتبوو: ویلیی گرت و ویلییش خۆی شۆڕ کردەوە و قاییشەکەی کردەوە. یەکێک لە ژنەکان خۆی بۆ ویلی هەڵدا و خەریک بوو بیخاتە خوارەوە. لە خوارەوە خەڵکەکە هاواریان لێ بەرز بووەوە.

ئێدی لەژێر لێوەوە گوتی، "نەکەی، پەلە نەکەی!"

ویلی دووبارە هەوڵی دایەوە و ئەم جارەیان قاییشی سەلامەتییەکەی کردەوە.

ئێدی بەهێواشی گوتی، "دەی، دەی ئینجا کێبڵەکە."

شیشی بەردەمی نەفەرەکان بەرز بووەوە و خەڵکەکەی خوارەوە ئاهێکیان بەبەردا هاتەوە. خێرا نەفەرەکان گوێزرانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی سواری یارییەکە بووبوون.

"کێبڵەکە پێچی خواردووە."

ئێدی ڕاستی دەکرد. چەند مانگێک بوو لەو بەشەی ناوەوەی یارییەکەدا، کە لە چاو دیار نەبوو، کێبڵی کورسیی ژمارە دوو لەسەر خلۆکەکەی باش نەدەخولایەوە. بەهۆی ئەوەشەوە، وردەوردە خورابوو - وەک ئەوەی گەنمەشامی بێت و پەلکەکەی لێ کرابێتەوە. کێبڵەکە ئەوەندە خورابوو، کە خەریک بوو دەپچڕا. کەس تێبینیی ئەوەی نەکردبوو. جا چۆن تێبینیی بکەن؟ تەنیا ڕێگە بۆ ئەوەی پێشوەخت بەو کێشەیە بزانرێت، ئەوە بوو کەسێک بچێت مەکینە و

پارچەکانی ناوەوەی کورسییەکان بپشکنێت.

ئەو خلۆکەیەی کێبڵ و ددانەکانی کورسییەکەی لەسەر بوو، بە هۆی شتێکی بچووکەوە، کە لە ساتێکی زۆر هەستیاردا کەوتبووە ناوی، تێک چوو بوو. ئەو شتەش، سویچێکی سەیارە بوو.

ئێدی هەردوو دەستی بۆ ویلی ڕاوەشاند و هاواری لێ کرد، "کورسییەکە مەخەرە خوارەوە. خەتای کێبڵەکەیە. مەیخەرە خوارەوە، دەپچڕێ."

دەنگی ئێدی لەناو دەنگی ئەو هەموو خەڵکەدا ون بوو. هەر کە دۆمینگێز و ویلی دوانەفەریان هێنایە دەرەوە، هەموو ئەو خەڵکەی لەوێ خڕ بووبوونەوە، لە خۆشییان دەستیان کرد بە هاوارهاوار. هەرچوار نەفەرەکە سەلامەت دەر چوون و لەسەر سەکۆکەی سەرەوە باوەشیان بەیەکدا کرد.

کەسێک خۆی کێشا بە کەلەکەی ئێدیدا و ڕادیۆکەی لێ خستە خوارەوە. ئێدی نووشتایەوە هەڵی بگرێتەوە، ویلییش ڕۆیشت بۆ بەشی کۆنترۆڵ و پەنجەی خستەسەر دوگمە سەوزەکە. ئێدی سەری بەرز کردەوە.

"نا!نا! نەکەی پەنجەی پێدا نەنێی."

ئێدی گەڕایەوە بۆ لای خەڵکەکە و هاواری کرد، "وەرنە دواوەەە."

ڕەنگە شتێک لە دەنگی ئێدیدا هەبووبێت، کە سەرنجی خەڵکەکەی ڕاکێشابێت، بۆیە خێرا لە هاوارهاوار وەستان و بڵاوەیان لێ کرد. بۆشاییەک کرایەوە و ئێدی سەیرێکی ژێر یارییەکەی کرد، لەو سات و شوێنەدا بوو، کە ئێدی

دوادەموچاوی ناو ژیانی بینی.

کچێک لەسەر بنکەی یارییەکە دانیشتبوو، لەوە دەچوو خۆیان پێدا کێشابێت و لەوێدا خستبێتیان. لووتی ئاوی کردبوو، چاوەکانیشی پڕ بووبوون لە فرمێسک، ئەو کچەش بوو کە پێشتر ئێدی کەروێشکەکەی بۆ دروست کردبوو، *ئەیمی یان ئانی!*

کچەکە، کە گریا و هەنسک جەستەیان ڕەق کردبوو، لەسەر یەک ئاواز هاواری دەکرد، "دایە! دایکە، دایە، دایکە."

چاوەکانی ئێدی لەسەر کچەکەوە چوونە سەر کورسییەکە. ئایا ئەوەندەی کات لە بەردەستدا بوو شتێک بکات؟ کچەکە زۆر لە کورسییەکەوە...

گیففففف! تازە زۆر درەنگ بوو! کورسییەکە بەرەو خوار دەهات.

"ئەی هاوار! کورسییەکەی خستە خوارەوە."

هەموو جووڵەیەک لە بەرچاوی ئێدیدا خاو بووەوە. گۆچانەکەی فڕێ دا و زۆری لە قاچە ناساغەکەی کرد بەدوایدا بێت. ئازارێکی پێ گەیشت، کە خەریک بوو بیدات بە زەویدا. هەنگاوێکی گەورەی نا، هەنگاوێکی تریش، لە سەرەوە، لەناو مەکینەی یارییەکەدا، دوایین سیمی کێبڵەکە پچڕا. کورسیی ژمارە دوو، وەک گوللە دەهاتە خوارەوە و هیچ شتێک نەبوو بەری پێ بگرێت، وەک ئەوەی تاوێرێکی زۆر گەورە بێت و بە خەرەندێکدا سەرەوخوار خلۆریان کردبێتەوە.

لەو دواساتانەدا، وا دەر کەوت ئێدی گوێی لە هەموو دەنگەکانی دونیا بێت: دەنگی قیژەیەکی دوور، دەنگی شەپۆلەکان، دەنگی مۆسیقا و گۆرانی، گڤەی بایەک،

دەنگێکی بەرزونزمی ناخۆش، کە تێگەیشت دەنگی خۆیەتی و لە سینگیەوە دێتە دەر. کچە بچووکەکە دەستەکانی بەرز کردنەوە. ئێدی خۆی بەرەوڕووی فڕێ دا و قاچە ناساغەکەی نووشتایەوە. ئێدی نیوەی ڕێگەکەی بە فڕین و نیوەکەی تریشی بەسینگەخشکێ بڕی و خۆی گەیاندە بنکەی یارییەکە. لەناکاو، کورسییەکە بە ئێدیدا درا و کراسەکەی و پێستەکەی و جەستەی - لە ئاستی ئەو باجەوە کە لەسەری نووسرابوو ئێدی/ چاودێر - بەقووڵی بڕی.

ئێدی هەستی بە زەبرێکی قورس و

ڕووناکییەکی بەهێز و

دوو دەستی بچووک کرد لەناو دەستەکانیدا.

دوای ئەوە، هەستی بە هیچی تر نەکرد.

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

ساڵی بیستەکانە و شوێنەکە نەخۆشخانەیەکی جەنجاڵی یەکێك لە هەژارترین گەڕەکەکانی شارە. باوکی ئێدی و باوکەکانی تر لە ژووری چاوەڕوانی دانیشتوون و جگەرە دەکێشن. پەرستارەکە، بە خۆی و فایلێکەوە، کە چەند پەڕە کاغەزێکی تێدایە، خۆی دەکات بە ژووردا. بانگی دەکات و ناوەکەی بەهەڵە دەڵێت. پیاوەکان فیشکەی جگەرەیان دێت.

دەستی بەرز دەکاتەوە.

پەرستارەکە دەڵێت، "پیرۆزە."

بەدوای پەرستارەکەدا دەچێتەوە خوارەوە بۆ ژووری منداڵە تازەبووەکان. پێڵاوەکانی لەسەر کاشییەکان تەقەتەقیان دێت.

پەرستارەکەی پێی دەڵێت، "لێرە چاوەڕێ بکە."

لە پەنجەرەکەوە سەیر دەکات و دەبینێت پەرستارەکە بەلای قەرەوێڵە بچووکەکاندا دەڕوات و سەیری ژمارەکانیان دەکات. دانەیەکیان تێدەپەڕێنێت، ئەمەیان نییە، دانەیەکی تریش، ئەمەشیان نییە، دانەیەکی تریش، ئەمەش نییە، دانەیەکی تر، ئەمەش هەر هیی ئەو نییە.

پەرستارەکە دەوەستێت. *ئەوەتا!* لەژێر بەتانییەکەدا،

سەرێکی بچووك لەژێر کڵاوێکی شینەوە دیارە. پەرستارەکە دووبارە سەیرێکی فایلەکەی دەستی دەکاتەوە، ئینجا هەر بە ئاماژەی دەست بانگی باوکی دەکات.

باوکی هەناسەی سوار دەبێت و سەرێك دەلەقێنێت، بۆ ساتێك، دەموچاوی تێك دەچێت، وەك پردێکی ڕووخاو دێتە بەرچاو، کە خەریك بێت بەر ببێتەوە بۆ ناو ڕووبارێك.

"خۆیەتی، ئەمەیانە."

# گەشتەکە

ئیدی هیچ شتێکی دواساتی ژیانی خۆی نەبینی: نە شاری یارییەکە، نە ئەو خەڵکەی لەژێر یاریی کەوتنەخوارەوەی سەربەستدا خڕ بووبوونەوە، نە کورسییە فایبەرگلاسەکەش، کە دواجار بەر زەوییەکە کەوت و بوو بە هەزار پارچەوە.

لەو چیرۆکانەدا کە دەربارەی ژیانی دوای مردنن، زۆر جار ڕووحی مردووەکە بەسەر ئەو شوێنەدا دەسووڕێتەوە، کە کەسەکە تیایدا گیانی سپاردووە، بۆ نموونە، لەسەر ڕێگەیەکی دەرەوەی شار، ڕووحێک بەسەر سەیارەکانی پۆلیسەوە دێت و دەچێت، یان لە ژوورێکی نەخۆشخانەیەکدا، وەک جاڵجاڵۆکە خۆی بە سەقفەکەوە هەڵدەواسێت. ئەمانە ئەو کەسانەن، کە دەرفەتی دووەمیان پێ دەدرێت - جا بۆ هەر مەبەستێک بێت - تا لە ژیان بەردەوام ببن و شوێنیان چۆڵ نەبێت.

وا دیار بوو ئیدی ئەو دەرفەتی دووەمەی پێ نەدەدرا.

*چوو بۆ کوێ...؟*

*چوو بۆ کوێ...؟*

*چوو بۆ کوێ...؟*

ئاسمان تەم بوو، ڕەنگیشی، سەرەتا، پرتەقاڵییەکی کاڵ بوو، بەڵام دواتر گۆڕا بۆ پیرۆزەیییەکی تۆخ، پاش کەمێک، ئەویش بوو بە سەوزێکی زەق. ئێدی بەسەر هەواوە بوو، قۆڵەکانیشی بۆ پێشەوە درێژ کردبوو.

*چوو بۆ کوێ...؟*

زۆر باشە! کورسییەکە کەوتە خوارەوە، کچە بچووکەکەش، کە ناوی *ئەیمی* یان *ئانی* بوو، دەگریا. ئێدی ئەمانەی بیر بوو. بیریشی بوو چۆن خۆی بۆ کچەکە فڕێ دا، ئەوەشی بیری بوو کە دەستەکانی بەر دوو دەستی بچووک کەوتن.

*ئی ئەی دوای ئەوە؟*

*تۆ بڵێی ڕزگارم کردبێ؟*

ئێدی تەنیا دەیتوانی بە خەیاڵ بیر لەو دواساتەی بکاتەوە، وەک ئەوەی ڕووداوەکە چەندین ساڵ بێت ڕووی دابێت. لەوەش سەیرتر، ئەوە بوو کە هیچ هەستێکی تایبەت بەو یادگارییە لە ناخیدا نەبوو. تەنیا هەستێک لەو کاتەدا ئێدی هەیبوو، هەستی منداڵێک بوو، کە بەئارامی لە باوەشی دایکیدا پاڵ کەوتبێت.

*چوو بۆ کوێ...؟*

دووبارە ڕەنگی ئاسمانەکە گۆڕایەوە و ئەم جارەیان بوو بە زەردێکی نارنجی، ئینجا بە سەوزێکی گیایی، دواتریش بە پەمەییەک، کە ئێدی بە بینینی، زیاتر لە هەموو شتێک، پەشمەکی بیر هاتەوە.

*تۆ بڵێی ڕزگارم کردبێ؟*

*بڵێی ئێستا بژی؟*

*ئەی بۆ کوێ چوو... نیگەرانییەکەم؟*

*بۆ کوێ چوو ئازارەکەم؟*

ئێستا ئێدی نە نیگەران بوو، نە ئازاریشی هەبوو. هەموو ئەو ئازارانەی بەدرێژاییی ژیانی چەشتبوونی، هەموو ئەو ناڕەحەتییانەی بەرگەی گرتبوون، وەک هەناسەی دەم با ڕۆیشتبوون و نەمابوون. ئێدی هەستی بە هیچ ئازارێک نەدەکرد، هەستی بە بێتاقەتی و دڵتەنگی نەدەکرد. ناخی بەتاڵ بووبووەوە و لە ئارامی بەولاوە، هیچی تری تێدا نەبوو. لەخوارییەوە ڕەنگەکان دووبارە گۆڕانەوە. شتێک بەنەرمی دەجوولایەوە. ئاو بوو، ئاوی زەریا. ئێدی بەسەر زەریایەکی بەرینی زەردەوە وەستابوو. زەریاکە ڕەنگی کاڵەکی وەر گرت و پاش ساتێک، گۆڕا بۆ شینێکی کاڵ. ئێدی وردەوردە بەرەو خوارەوە بەر دەبووەوە و بەخێرایی بەرەو ڕووی ئاوەکە دەچوو. خێراییەکەی زیاتر بوو لە خێراییی هەرشتێک کە بینیبووی، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ نەدەترسا و تەنیا شنەیەکی شەماڵ لە دەموچاوی دەدا. ئێدی لمی سەر کەنارە ئاڵتوونییەکەی بینی و لەساتێکدا کەوتە ژێر ئاوەکەوە. ئیتر هەموو شتێک خامۆش بوو.

*باشە نیگەرانییەکەم بۆ کوێ چوو؟*

*ئازارەکەم چیی لێ هات؟*

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

تەمەنی پێنج ساڵە. دوانیوەڕۆیەکی گەرمە و شوێنەکە شاری یاریی ڕووبییە. بەدرێژاییی ڕێگە دارینەکە - کە بەسەر کەنارە سپییەکەدا دەڕوانێت - مێز ڕیز کراون. کێکێکی ڤانێلای لێیە و مۆمی شینی بەسەرەوەیە، بتڵێك شەربەتی پرتەقاڵیش دانراوە. ئەوانەی لە شاری یارییەکە ئیش دەکەن لەو ناوە دێن و دەچن: هەندێك لە بەردەم یارییەکاندا دەوەستن و هاوار بۆ یارییەکە دەکەن، تا سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشن، هەندێك خەریکی نمایشی سەرنجڕاکێشن، هەندێك ڕاهێنەری ئاژەڵەکانن، هەندێکیش ئەوانەن، کە ڕاوەماسی دەکەن. باوکی ئێدی، وەك هەمیشە، خەریکی کۆنکەنە. ئێدی لەلای قاچیەوە یاری دەکات، جۆی براگەورەشی لە بەرچاوی کۆمەڵێك ژنی بەتەمەندا شناو دەکات. ژنەکان وا خۆیان دەر دەخەن، کە حەزیان بە نمایشەکەی جۆیە و چەپڵەی بۆ لێدەدەن.

ئێدی کڵاوێکی تەکساسیی سووری لەسەردایە و دەمانچەیەکی منداڵانەشی بە دەستەوەیە، هەردوو شتەکەشی وەك دیاریی یادی لەدایکبوونەکەی بۆ هاتوون. ئێدی هەڵدەستێت و لەم مێزەوە ڕا دەکات بۆ ئەو مێز،

دەمانچەکەیـان لــێ دەر دەهێنێــت و دەڵێــت، "تــاااق، تــاااق."
میکــی شــی لەســەر کورســییەك دانیشــتووە و هــاوار لــە ئێــدی دەکات، "وەرەوە، کــوڕە."
ئێدی هەر دەڵێت، "تاااق، تاااق."
میکــی شــی لەگــەڵ باوکــی ئێــدی کار دەکات و یارییــە شــکاوەکان چــاك دەکاتــەوە. کابرایەکــی قەڵــەوە و شــەیالە دەبەستێت، هەمیشـەش گۆرانیـی ئایرلەنـدی بەسـەر دەمەوەیـە. ئێـدی پێـی وایـە شـی بۆنێکـی سـەیری لـێ دێـت، کـە لـە بۆنـی شـروبی کۆکـە دەچێـت. ئێـدی حـەزی لـەو بۆنـە نییـە.
شــی دەڵێــت، "وەرە بــا بــە هەمــان شــێوەی نەریتــە ئایرلەندییەکــەی خۆمــان، قاچــت بگــرم و ســەرەوخوارت بکەمــەوە."
میکـی شـی دەسـتە گەورەکانـی دەخاتـە ژێـر باڵـی ئێـدی و بـەرزی دەکاتـەوە، ئینجـا قاچەکانـی دەگرێـت و سـەرەوخواری دەکاتـەوە. ئێـدی کڵاوەکـەی دەکەوێتـە خـوارەوە.
دایکــی ئێــدی هــاواری لــێ بــەرز دەبێتــەوە، "ئــاگات لێــی بــێ، میکــی." باوکـی ئێـدی سـەرێك هەڵدەبڕێـت و پێکەنینێکـی لـە دۆخەکـە دێـت، ئینجـا دەچێتـەوە سـەر کۆنکەنـی خـۆی.
میکــی دەڵێــت، "خەمــت نەبــێ، ئــاگام لێیەتــی. ئێســتا بــا بــۆ هــەر ســاڵێکی تەمەنــت، جارێــك شــۆڕت بکەمــەوە و بــەرزت بکەمــەوە."
میکــی، ئێــدی لەســەرخۆ نــزم دەکاتــەوە، تــا ئــەو کاتــەی قــژی بــەر زەوییەکــە دەکەوێــت.
"ئەمە یەك."
میکــی، ئێــدی بــەرز دەکاتــەوە. ئەوانــی تــر هەمــوو ســەیر

دەکـەن و پێدەکەنـن. هەمـووش پێکـەوە هـاوار دەکـەن، "دووووو... سـێێێێ."

ئێـدی، کـە ئێسـتا سـەرەوخوار شۆڕ کراوەتـەوە، سـەیرێکی دەموچـاوەکان دەکات و نازانێـت کـێ کێیـە. سـەری قـورس دەبێـت.

ئامادەبووان هاوار دەکەنەوە، "چواااار... پێێێنج."

شـی، ئێـدی ڕێـك دەکاتـەوە و دەیخاتـەوە سـەر قاچی خۆی. هەمـووان چەپڵـە بـۆ ئێـدی لـێدەدەن. ئێـدی دەنووشـتێتەوە و کڵاوەکـەی هەڵدەگرێتـەوە. قاچـی لـە شـتێك هەڵدەنگوێـت و دەکەوێـت، ئینجـا هەڵدەسـتێتەوە و بەخواروخێچـی دەچێـت بـۆ لای میکـی شـی و قۆڵـی بـەر بۆکـس دەدات.

میکـی دەڵێـت، "ئـای! ئـای! ئـەوە بـۆ وام لێـم دەدەی، پیـاوە چکۆل."

هەمـوو پێدەکەنـن. ئێـدی دەسـووڕێتەوە و ڕادەکات. سـێ هەنـگاو دەنێـت و دەگاتـە نـاو باوەشـی دایکـی.

دایکـی، کـە هەمـووی یـەك - دوو ئینجێـك لـە دەموچـاوی ئێدییـەوە دوورە، دەڵێـت، "باشـی کـوڕە جـوان و پێنـج ساڵانەکەی خـۆم؟"

ئێـدی سـووراوە سـوورە تۆخەکـەی دایکـی و کوڵمـە ئـاڵ و نەرمەکانـی و شـەپۆلی قـژە قاوەییەکـەی لـە نزیکـەوە دەبینێت، ئینجـا بـە دایکـی دەڵێت، "سـەرەوخواری کردمـەوە."

"چاوم لێ بوو."

دایکـی کڵاوەکـە دەکاتـەوە سـەری ئێـدی، پاشـان دەیبـات پیاسـەیەکی بـە شـاریی یارییەکـەدا پـێ دەکات، دەیبـات بـۆ سـواری یاریـی فیـل، بـۆ تەماشـاکردنی ڕاوچییـەکان و بینینـی

**ئـەو سـاتەی لـە سـەرلەئێوارەدا تۆڕەکانیـان دەر دەهێننـەوە و ماسـییەکان وەك پـارەی ئاسـنی تـەڕ و بریسـکەدار هەڵدەبەزنـەوە. دایکـی ئێـدی دەسـتی کوڕەکـەی دەگرێـت و پێـی دەڵێـت، کـە خـوا ئێدیـی خـۆش دەوێـت و شانازیی پێـوە دەکات، چونکـە، لـە ڕۆژی یـادی لەدایکبوونەکەیـدا، کوڕێکـی ئاقـڵ و ژیـر بـووە. ئـەوە دڵـی ئێـدی دەداتـەوە و دونیـا لـە بەرچـاوی دەگەڕێتـەوە سـەر بـاری ئاسـاییی خـۆی.**

# گەیشتنەجێ

ئیدی خەبەری بووەوە و بینیی لە کووپێکی چایی زۆر گەورەدایە. کوپەکە یارییەک بوو لە یارییەکانی ناو پارکێک، لە تەختەی بۆیاخکراو دروست کرابوو، کوشنێکی بۆ دانیشتن تێدا بوو، دەرگایەکیشی هەبوو، کە بە نەرمادە بە تەختەکەوە قاییم کرابوو. قاچەکانی ئیدی بەقەراغەکانی کوپەکەدا شۆڕ بووبوونەوە. ئاسمان بەردەوام ڕەنگی لە قاوەییییەوە بۆ سووری تۆخ دەگۆڕا.

ئیدی هەر دەیوست دەستی بگاتە گۆچانەکەی. ئەوە چەند ساڵێک بوو کە دەخەوت، گۆچانەکەی لەپشت سەری خۆیەوە دادەنا، چونکە زۆر بەیانی بەبێ گۆچان نەیدەتوانی هەستێتە سەر پێ. ئیدی زۆر شەرمی دەکرد، کە ئاوای لێ هاتبوو، چونکە ئەو، جاری جاران، هەمیشە کە هاوڕێکانی دەبینی، بەدەم سڵاوکردنەوە لێیان، دەستێکی بە شانیاندا دەکێشا.

گۆچانەکە لەپشت سەرییەوە نەبوو. ئیدی هەناسەیەکی هەڵمژی و هەستایە سەر پێ. ئەوەی بەلایەوە سەیر بوو، ئەوە بوو لەگەڵ هەستانەکەیدا پشتی نەئێشا و جومگەکانی قاچی کرەیان نەهات. ئیدی خۆی قیت کردەوە و بەئاسانی بەسەر لێواری کوپە گەورەکەدا خۆی هەڵدایە خوارەوە و

تۆزێک بەسەیری لەسەر پێی وەستایەوە. ئێدی، هەر لەو سات و شوێنەدا، هەستی بە سێ شت کرد.

یەکەم، زۆر دڵی خۆش بوو.

دووەم، بەتەنیا بوو.

سێیەم، هێشتا هەر لە شاری یاریی ڕووبی بوو.

بەڵام ئەم شاری یاریی ڕووبییە، هەمان ئەوەی پێشوو نەبوو. هەندێک چادری مشەمای تێدا هەڵدرابوو، پارچەزەویی چۆڵ و فراوانیشی تێدا بوو، کە بە گیا داپۆشرابوون. ئاوەکەی – بە هۆی ئەو بەربەستانەوە کە بۆی دروست کرابوون – ئەوەندە مانگ و ڕوون بوو، بەئاسانی قەوزەی ژێرەکەیت دەبینی. ڕەنگی یارییەکان سووری ئاگری و سپیی کرێمی بوو – سەوز و مارۆنییان تێدا نەبوو – هەر یارییەکیش، شوێنێکی بلیتفرۆشتنی تەختەی تایبەت بە خۆی هەبوو. ئەو کوپە گەورەیەی ئێدی تیایدا خەبەری بووبووەوە، لە بنەڕەتدا بەشێک بوو لە یارییەکی سادە بە ناوی *سپین ئۆ ڕاما*، ئەم ناوەش – شانبەشانی ناوی چەندین شوێن و یاریی تر و دوکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگە سەرەکییەکە، لەسەر پارچەتەختەی ئەستوور نووسرابوو.

*جگەرەی ئێل تیمپۆ، تامی جگەرەی ڕاستەقینە!*

*شۆربای ماسی و پەتاتە/ دە سەنت*

*یاریی بابەخولێ/ خۆشترین یاریی سەدە!*

ئێدی بەتوندی چاوی تروکاند. شوێنەکە شاری یاریی ڕووبیی سەردەمی منداڵیی ئێدی بوو. حەفتاوپێنج ساڵ

لەوەوبەر بوو، تەنیا ئەوە بوو، ئێستا هەموو شتەکان نوێ بوون. لە سەرەوە *یاریی ڕەوڕەوەی بازنەییی* لێ بوو، کە چەندین ساڵ بوو لا برابوو، لەولاترەوە شوێنێکی خۆگۆڕین و مەلەوانگەیەک، کە ئاوەکەی سوێر بوو، هەردوو شوێنەکەش لە ساڵانی ١٩٥٠ەوە بەتەواوی ڕووخێندرابوون. لە لایەکەی ترەوە، چەرخوفەلەکەکەی یەکەم جاری شاری یاریی ڕووبی بە بۆیە سپییەکەی جارانیەوە چووبوو بە ئاسماندا. لەودیویشیەوە، ئێدی شەقام و سەربانی خانووە جەنجاڵ و خشتسوورەکانی گەڕەکە کۆنەکەیانی بینی و تێبینیی کرد تەنافی جل بە پەنجەرەی خانووەکانەوە شۆڕ بووبوونەوە.

ئێدی هەوڵی دا هاوار بکات، بەلام دەنگی دەر نەهات، تەنیا گوتی، "سلاو،" بەلام هیچ دەنگێک لە قورگیەوە نەهاتە دەرەوە.

ئێدی دەستی لە قۆڵ و قاچەکانی دا: ئەوەی لێ دەر بچێت، کە دەنگی نەمابوو، زۆر ساغ و دڵخۆش بوو. کەمێک بەدەوری خۆیدا خولایەوە و یەک - دوو جار بەرز بووەوە. هیچ ئازارێکی نەبوو. لە دە ساڵی ڕابردوودا، ئێدی بە چاوی خۆی نەیدیبوو بەپێ بڕوات و نەکەوێتە ناڵەناڵ، یان دابنیشێت و پشتی ئازاری پێ نەگات. ڕوخسار و شێوەی دەرەوەی، هەر وەک هیی ئەو نیوەڕۆیە بوو، کە تیایدا دونیای بەجێ هێشتبوو: پیاوێکی کەتەی سینگپان، بە کلاوێک و شۆرتێک و کراسێکی قاوەییی کاڵەوە، کە ڕێک هیی کارمەندەکانی شاری یاریی ڕووبی بوو. بەلام جومگەکانی نەرمتر و لەشی سووکەڵەتر بوو، بەشێوەیەک، کە دەیتوانی بەپێوە خۆی بنووشتێنێتەوە و دەست لە پاژنەی پێیەکانی بدات، یان تا ئاستی سکی، قاچ بەرز بکاتەوە. ئێدی، وەک منداڵ، لە

جەستەی خۆی ورد دەبووەوە و زۆر دڵخۆش بوو بەو هێز و توانا تازەیەی هەیبوو. ئیدی بووبوو بە پیاوێکی سووکەڵە و وەک لاستیک دەکشا.

ئینجا ڕای کرد.

ڕاکردنەکەی زۆر بەلاوە خۆش بوو! شەست ساڵ زیاتر بوو ڕای نەکردبوو، یان ڕاستتر، لە سەردەمی ساڵانی جەنگەوە، بەڵام ئێستا دەیتوانی ڕابکات، سەرەتا بەهێواشی و بە هەنگاوی کورت، دواتریش خێرا و خێراتر - کتومت وەک ڕاکردنەکانی سەردەمی گەنجی. ئیدی بەدرێژایی ڕێگە دارینەکەدا بۆی دەر چوو. سەرەتا بەلای مێزێکی فرۆشتنی کەلوپەلی ڕاوەماسیدا - کە شتەکانی سەری، هەریەکە بە پێنج سەنت بوون - ڕای کرد، دواتریش بەلای مێزێکی بەکرێدانی جلی مەلەدا - کە خاوەنەکەی بە سێ سەنت جلی مەلەی بەکرێ دەدا - تێپەڕی. ئیدی هەر بەڕاکردن *یاریی ڕەورەوەی ناو ئاوی* تێپەڕاند و دواتریش بەناو کووچەکانی شاری یاریی ڕووبی و بە بەردەم ئەو بینا جوانانەشدا دەر چوو، کە لەسەر شێوازی بیناسازیی ئەندەلووسی دروست کرابوون و منارە و گومەزی جوانیان هەبوو. پاشان بەلای *یاریی بابەخولێی ئەسپـ*ـدا تێپەڕی - کە ئەسپە دارینەکانی و پیانۆکەی و شووشە و ئاوێنەکانی ئەوەندە پاک بوون، لە دوورەوە دەبریقانەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە لەوە دەچوو هەمووی کاتژمێرێک لەوەوپێش بووبێت، کە ئیدی خۆی لە وەرشەکەدا پارچەکانی هەمان یاریی پاک دەکردەوە و تۆزەکەی سەریانی دەتەکاند.

ئیدی بە ناوجەرگەی ڕێگە کۆنەکەدا - کە ڕۆژانێک

تیایدا هەرزەکار، هەر بەمەزەندە کێشی خەڵکیان دەگوت و بەختگرەوەکان بەختیان دەگرتەوە و قەرەجەکانیش سەمایان تێدا دەکرد - تێپەڕی. ئێدی چەناگەی نەرم کردەوە و باڵەکانی وەک هێی فڕۆکە فش کرد، ئینجا بەو هیوایەی ڕاکردنەکەی ببێت بە فڕین، لەگەڵ هەر چەند هەنگاوێکدا، وەک منداڵ بازی دەدا و خۆی بەرز دەکردەوە. ئەگەر کەسێک ئەمەی ببینیایە، ڕەنگە گاڵتەی بە ئەقڵی بهاتایە: چاودێرێکی سەرسپی، بە تاقی تەنیا دەیەوێت لاسایی فڕۆکە بکاتەوە و بفڕێت. بەڵام شتەکە ئاسایی بوو، چونکە لە ناخی هەموو پیاوێکدا - جا تەمەنی هەرچەندە بێت - منداڵێک هەیە کە دەیەوێت ئاوا ڕابکات.

ئێدی لە ڕاکردن وەستا. گوێی لە دەنگێکی بەرزی زیقن بوو، کە دەتگوت لە موکەبەرەیەکی گەورەوە دێتە دەرەوە.

"ئامادەبووانی ئازیز، ئەی ئەمەیانتان پێ چۆنە؟ تا ئێستا دیمەنی وا ناشیرین و ترسناکتان بینیوە؟..."

ئێدی لە بەردەم شانۆیەکی گەورەدا و لەتەنیشت کابینەیەکی بلیتبڕینەوە وەستابوو. شانۆکە پارچەتەختەیەکی پێوە کرابوو، کە لەسەری نووسرابوو:

*سەیروسەمەرەترین مرۆڤەکانی دونیا!*
*نمایشی شاری یاریی ڕووبی!*
*قەلەو و لاوازەکان!*
*وەرن و پیاوە سەیرەکە ببینن!*

شانۆکە بە *خانووی تۆقێنەر* و *هۆڵی هەراوهوریا*ش ناوی

ڕۆیشتبوو. ئێدی بیری کەوتەوە، کە پەنجا ساڵێک پێش ئێستا ئەو شوێنە داخرابوو، ڕێک ئەو کاتەی ئێتر تەلەڤزیۆن داهێنرا و خەڵک پێویستییان بە شوێنی لەو جۆرە نەما بۆ جووڵاندنی خەیاڵیان.

"سەیری ئەم وەحشییە بکەن، کە لە زگماکەوە بە نەخۆشییەکی زۆر سەیرەوە لەدایک بووە و..."

ئێدی بەرەو دەرگای چوونەژوورەوەی شوێنی نمایشەکە ڕۆیشت. هەر لەو شوێنەدا کاتی خۆی چەندین کەسی سەیری بینیبوو. لەوانە، جۆلی جەین، کە نزیکەی ٢٣٠ کیلۆ دەبوو و دەبووایە بە دوو پیاو بیخەنە سەر پلیکانەکان، دوو خوشکی دووانەش هەبوون، کە لە پشتەوە بەیەکەوە نووسابوون و مۆسیقایان لێدەدا. نمایشەکان پیاویان تێدا بوو، شمشێری قووت دەدا، ژنی ڕیشدار، هەروەها دوو برای هیندی، کە ئەوەندە لە نەوتدا مابوونەوە، پێستیان، وەک لاستیک، دەکشا و بەسەر چوار پەلیاندا شۆڕ دەبووەوە.

ئێدی بەمنداڵی بەزەیی بە ئەندامانی نمایشەکەدا دەهاتەوە، چونکە ئەو ئەندامانە ناچار دەکران لە کوخی بچووکدا دابنیشن، یان هەر لەسەر شانۆکە بمێننەوە، هەندێک جار دەیانخستنە قەفەسەوە و ئەندامانی تری نمایشەکە بە بەردەمیاندا دەهاتن و بەگاڵتەپێکردنەوە پەنجەیان بۆ ڕادەکێشان. چەند کەسێکیش لە دەرەوەی شوێنەکە هاتوهاواریان دەنایەوە و خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ نمایشەکە. ئەو دەنگەی ئێدی گوێی لێ بوو، دەنگی یەکێک لەو کەسانە بوو!

"ئەوەی بەسەر ئەم پیاوەی ئێمە هاتووە، تەنیا بەسەر پیاوی نەگبەتدا دێ! لەوپەڕی دونیاوە هێناومانە تا ئێوە

سەیری بکەن و لێی ورد ببنەوە."

ئێدی خۆی کرد بە هۆڵەکەدا. تاریک بوو. دەنگەکە بەرزتر بووەوە.

"ئەم ڕووحە داماوە لێرەدایە و گۆڕانێکی قورس بەسەر جەستەیدا هاتووە..."

دەنگەکە لە لایەکەی تری تەختەی شانۆکەوە دەهات.

"تەنیا لێرە، لە شوێنی سەیروسەمەرەترین مرۆڤەکانی دونیا، دەتوانی ئەوەندە لەم کەسە نزیک..."

ئێدی پەردەکەی لا دا.

"ببیتەوە و سەیرترین شت ببینی..."

دەنگی ئەو کابرایەی هاواری دەکرد، نەما و ئێدی بەحەپەساوییەوە چەند هەنگاوێکی بۆ دواوە نا.

لەسەر تەختەی شانۆکە پیاوێکی تەمەن مامناوەند، کە شانە باریکەکانی کەمێک بەپێشدا هاتبوون، بەتەنیا لەسەر کورسییەک دانیشتبوو. پیاوەکە لە کەمەر بۆ سەرەوە هیچی لەبەردا نەبوو، ورگیشی بەسەر قاییشەکەیدا شۆڕ بووبووەوە و چین چین چووبووە سەر یەک. قژی کورت بوو، لێوەکانی باریک بوون و دەموچاوی درێژ و ماندوو دەینواند.

جەستەی کابرا تایبەتمەندییەکی جیاکەرەوەی هەبوو، کە ئەگەر ئەو تایبەتمەندییە نەبووایە، لەوانە بوو ئێدی هەر بیریشی نەکەوێتەوە کێیە. تایبەتمەندییە جیاکەرەوەکەش ئەوە بوو، کە کابرا هەموو گیانی شین بوو!

پیاوەکە سەیرێکی ئێدی کرد و گوتی، "چۆنی ئێدوارد، چاوەڕێم دەکردی."

# یەکەم کەس، کە ئێدی لە بەهەشت دەیبینێت

پیاوە شینەکە لەسەرخۆ لەسەر کورسییەکەی هەستا و بە ئێدیی گوت، "مەترسە، مەترسە."

دەنگی زۆر ئارامکەرەوە بوو، بەڵام ئێدی هەر لێی ورد دەبووەوە. ئێدی ئەم پیاوەی بەئەستەم ناسیبوو، ئەی ئێستا بۆچی دووبارە هاتبووەوە سەر ڕێی؟ لەلای ئێدی، ئەم پیاوە شینە وەک ئەو دەموچاوە سەیرانە بوو، کە دێنە خەونەکانتەوە و تۆش کە سبەینێ هەڵدەستیت، بە دەوروبەرەکەت دەڵێیت، "تۆ بڵێی دوێنێ شەو خەوم بە کێوە بینی؟"

پیاوە شینەکە بە ئێدیی گوت، "هەست دەکەی جەستەت وەک جەستەی منداڵ وایە، ڕاستە؟"

ئێدی سەری لەقاند.

"ئەوە چونکە ئەو کاتەی منت ناسی، منداڵ بووی. ئێستاش بە هەمان ئەو هەستانەوە دەست پێ دەکەیتەوە."

ئێدی لە خۆی پرسی، "دەست بە چی دەکەمەوە؟"

پیاوە شینەکە چەناگەی بەرز کردەوە. ڕەنگی پێستی وەک ڕەنگی هەڵوژەڕەشەی گەییو وا بوو، پەنجەکانیشی چرچ بووبوون. بەرەو دەرەوەی هۆڵەکە ڕۆیشت و ئێدییش بەدوایدا هەنگاوی نا. شاریی یارییەکە کەسی تێدا نەبوو،

کەنارەکەش چۆلوهۆل. تۆ بڵێی تەواوی هەسارەکە چۆڵ بوو بێت؟

پیاوە شینەکە گوتی، "دە قسەیەک بکە،" ئینجا بە دەست ئاماژەی بۆ یاریی ڕەوڕەوەی مەرگەکە- کە لە تەختە دروست کرابوو - کرد. ئەو یارییە پێشی دەگوترا *یارییە تەمبێکەرەکە*، لەبەر ئەوەی دوو پێچی زۆر قورسی تێدا بوو. یارییەکە بۆ یەکەمین جار لە ساڵانی ١٩٢٠دا دروست کرابوو، سکەکانی لەسەر تایە دانرابوون و بەو هۆیەشەوە، ئەو عەرەبانانەی نەفەرەکان دەچوونە ناویان زۆر بەخێرایی پێچیان بۆ نەدەکرایەوە، چونکە ئەگەر خێرا پێچیان بکردایەتەوە، لەسەر سکەکە دەر دەچوون.

"ئەرێ ئێستاش هەر *یارییە تەمبێکەرەکە* خێراترین یاریی دونیایە؟"

ئێدی سەیرێکی یارییە شەقوشڕەکەی کرد، کە چەندین ساڵ بوو لە شاری یاریی ڕووبیدا هەڵگیرابوو، ئینجا هەر بە سەربادان پیاوە شینەکەی تێگەیاند، کە نەخێر، چیی تر ئەو یارییە خێراترین یاریی دونیا نەبوو.

پیاوە شینەکە گوتی، "ئێ، ئێ! خۆشم هەر پێم وا بوو. لێرە شتەکان ناگۆڕێن، بەداخیشەوە -بە پێچەوانەی ئەوەوە کە خەڵک دەیڵێن - ناتوانی لەناو هەورەکانەوە سەیری خوارەوە بکەی."

ئێدی لە دڵی خۆیدا بەسەرسوورمانەوە پرسیی، "ئێرە؟ بۆ ئێرە کوێیە؟"

پیاوە شینەکە، وەک ئەوەی دڵی ئێدیی خوێندبێتەوە، زەردەخەنەیەکی کرد، ئینجا دەستێکی کێشا بە شانی ئێدیدا.

ئێدی هەستی بە گەرمییەک کرد، کە هەرگیز پێشتر گەرمیی وای هەست پێ نەکردبوو، ئینجا بیرکردنەوەکانی لە مێشکیدا، لە شێوەی ڕستەیەکدا ڕژان: من چۆن مردم؟

پیاوە شینەکە گوتی، "بە ڕووداوێک."

چەندێک دەبێ مردووم؟

"دەقیقەیەک، کاتژمێرێک، هەزار ساڵێک..."

ئەی ئێستا لەکوێم؟

پیاوە شینەکە بەتوندی لێوەکانی خستە سەر یەک، ئینجا پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، "لە کوێیی؟" ئاوڕێکی دایەوە و قۆڵەکانی هەڵبڕی. لە چاوترووکانێکدا یارییەکانی شاری یاریی ڕووبی ژیانیان تێ گەڕایەوە: چەرخوفەلەکەکە هێواش هێواش کەوتەوە خولانەوە، سەیارەی پیاکەوتنەکان دەستیان کرد بە خۆکێشان بەیەکدا، ڕەوڕەوەی مەرگەکە سەرەوژوور سەر کەوت، بابەخولێی ئەسپەکە لەسەر ئاوازی ئەو گۆرانییەی لەگەڵ یارییەکەدا لێدەدرا، کەوتە هەڵبەزودابەز. زەریاکە لەولاترەوە بوو، ئاسمانەکەش ڕەنگی لیمۆی گرتبوو.

پیاوە شینەکە گوتی، "قابیلە لەکوێی؟... لە بەهەشتی."

ئێدی بەتوندی سەری با دا: نا! شتی وا نابێ.

پیاوە شینەکە کەیفی لە دۆخەکە دەهات. گوتی، "ناکرێ ئەم شوێنە بەهەشت بێ؟ بۆ ناکرێ؟ لەبەر ئەوەی ئەمە ئەو شوێنەیە، کە لێی گەورە بووی؟"

ئێدی دەمی کردەوە و "بەڵێ"یەکی لێ هاتە دەر.

پیاوە شینەکە سەری لەقاند، "خەڵک زۆر جار بە کەم سەیری ئەو شوێنە دەکەن، کە لێی لەدایک بوون، بەڵام

دەشـێ بەهەشـت لـەو سـووچ و قوژبنانـەدا بـێ، کـە هـەر خەیاڵمـان بۆیـان ناچـێ. بەهەشـت چەندیـن ئاسـتی هەیـە. بـۆ مـن، ئەمـە ئاسـتی دووەمـە؛ بـۆ تـۆش، یەکـەم."

پیـاوە شـینەکە، ئێدیـی بـە پارکەکـەدا گێـڕا و هەردووکیـان پێکـەوە بـەلای مێـزی جگەرەفرۆشـتن و عەرەبانـەی لەفـەی سۆسـج و یاریـی قومارەکـەدا - کـە گێژەکان پارەکانیـان تیـادا دەدۆڕانـد - تێپەڕیـن.

ئێدی لـە دڵـی خۆیدا هـەر بیری دەکردەوە، "یانی بەهەشـت ئێرەیە؟ زۆر بێمانایە!" ئاخـر ئێدی بەدرێژاییی نیوەی زیاتـری تەمەنـی، خۆزگەی خواستبوو لە شـاری یاریـی ڕووبی ڕزگاری ببێـت. ئـەو شـاری یارییـە لـەلای ئێدی شـوێنێکی ئاسـایی بـوو، شـوێنێک بـوو بـۆ هاوارکـردن و مێزبەخۆداکـردن و گۆڕینـەوەی دۆلارە سـەوزەکانت بـە بووکەشوشـەی بچـووک، بۆیـە ئێـدی بـڕوای نەدەکـرد شـوێنێکی لـەو جـۆرە، شـوێنێ حەوانـەوە و ئاسـوودەیی هەتاهەتایـی بێـت.

ئێـدی دووبـارە هەوڵـی دایـەوە قسـە بـکات، بـەڵام لـە نووزەیـەک زیاتـر، هیچـی تـر لـە سـنگیەوە نەهاتـە دەرەوە. پیـاوە شـینەکە ئـاوڕی بـۆ دایـەوە.

"دەنگـت بـۆ دەگەڕێتـەوە. هەموومـان ئەوەمـان بەسـەر هاتـووە. کاتێـک بـۆ یەکـەم جـار دەگەیتـە ئێـرە، قسـەت بـۆ ناکـرێ."

پیـاوە شـینەکە زەردەخەنەیەکـی کـرد و بـەردەوام بـوو، "ئـەوەش یارمەتیـت دەدا باشـتر گـوێ بگـری."

لەنـاکاو پیـاوە شـینەکە گوتـی، "لـە بەهەشـتدا پێنـج کـەس

دەبینی. هەریەکەمان بۆ شتێک هاتووینەتە ژیانتەوە. ڕەنگە لە کاتی خۆیدا ئەو شتەت نەزانیبێ، بەڵام ئێستا دەرفەتی ئەوەت دەدرێتێ بیزانی. ئێ بەهەشتیش هەر بۆ ئەوە دروست کراوە، تا لەو ژیانە تێبگەی، کە لە دونیادا بەسەرت برد."

ئێدی شڵەژاو دیار بوو.

"خەڵک وا دەزانن بەهەشت هەر باخ و باخاتی خۆشە، یان شوێنێکە، تیایدا دەتوانی بەسەر هەورەکاندا بڕۆی، یان بەکەیفخۆشی لەگوێ ڕووبار و سەر شاخان ڕابوێری، بەڵام دیمەنە جوانەکان، بەبێ ئاسوودەیی ناخ بێمانان. گرنگترین پاداشت کە خودا بتداتەوە، ئەوەیە ئەو شتانەت بۆ ڕوون بکاتەوە و تێت بگەیەنێ، کە لە ژیانتدا ڕوویان دا و تێیان نەگەیشتی. ئەو ئاسوودەییەی بۆی دەگەڕێی، لە ئەوەدایە."

ئێدی کۆکەیەکی کرد و هەوڵی دا دەنگی بهێنێتەوە. ئیتر بێزار بووبوو لەو هەموو بێدەنگبوونەی تێی کەوتبوو.

"ئێدوارد، من یەکەم کەسی تۆم. ئەو کاتەی مردم و هاتم بۆ ئێرە، پێنج کەسی تر ڕووداوەکانی ژیانمیان بۆ ڕوون کردمەوە، ئینجا منیش هاتم بۆ ئێرە و چاوەڕوانی تۆم کرد، بۆ ئەوەی چیرۆکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، ئەو چیرۆکەی دواتر بوو بە بەشێک لە چیرۆکەکەی تۆش. خەڵکی تریش هەن، چاوەڕێت دەکەن. تیایاندایە ناسیوتە و تیایاندایە نەتناسیوە، بەڵام هەموویان، پێش ئەوەی بمرن، بە ژیانتدا تێپەڕیون و بۆ هەتاهەتایە ژیانتیان گۆڕیوە."

ئێدی، بە هەموو هێزی خۆی پاڵی بە دەنگێکەوە نا، تا لە سینگیەوە سەری بخاتە سەرەوە. دواجار یەک - دوو وشەی بۆ هاتن، "تۆ... چۆن..."

دەتگوت جووچکـە و لەودیـو توێکڵـی هێلکەکەیـەوە دەنگی دێـت.

"تۆ... چۆن...؟"

پیـاوە شـینەکە بەئارامگرتنـەوە چاوەڕێـی ئێدیـی کـرد، تـا قســەکەی تــەواو بـکات.

"تۆ... چۆن... مردی؟"

پیـاوە شـینەکە کەمێک سـەری سـوور مـا. زەردەخەنەیەکی بۆ ئێدی کـرد و گوتـی، "تـۆ منت کوشـت."

## ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

حەوت ساڵانە. دیاریی یادی لەدایکبوونەکەی تۆپێکی بەیسبۆڵە. تۆپەکە لە دەستەکانیدا دەگوشێت و هەست بە هێزێکی زۆر دەکات، لە قۆڵەکانیدا دێت و دەچێت. خۆی وەك یەکێك لەو یاریزانە لێهاتووانە دێتە بەرچاو، کە وێنەکانیانت لەناو جیبسی *کراکەر جاک*دا بۆ دەر دەچێت، بۆ نموونە، *والتەر جۆنسۆن**.

جۆی برای دەڵێت، "دەی، هەڵی بدە."

ئێدی و جۆ ڕادەکەن و بەلای *یاریی بەیسبۆڵی بۆلینگ*دا تێدەپەڕن. لەو یارییەدا بە دارێکی بەیسبۆڵ لە تۆپێك دەدەیت و دەیگریتە کۆمەڵێك بتڵ، ئەگەر سێ بتڵ بخەیت، شەربەتێکی گوێزی هیندی و قەسەبێك دەبەیتەوە.

جۆ دەڵێت، "دەی ئێدی، هەڵی بدە."

ئێدی دەوەستێت و بە خەیاڵ خۆی لە یاریگەیەکی یاریی بەیسبۆڵدا دەبینێت. تۆپەکە هەڵدەدات. براکەی دەستەکانی دەکاتەوە، بەڵام تۆپەکەی بۆ ناگیرێتەوە.

---

* والتەر جۆنسۆن Walter Johnson: یاریزانێکی بەناوبانگی یاریی بەیسبۆڵ بوو، کە بۆ ماوەی بیست ساڵ و لە ساڵی ١٩٠٧-١٩٢٧، لە خولی تیپە پلەیەکەکانی ئەمەریکادا یاریی کرد.

جۆ هاوار دەکات، "زۆر قاییم هەڵت دا."

ئێدی دەقیژێنێت و دەڵێت، "تۆپەکەممم! ون نەبێ، حۆلە."

ئێـدی بەوردی سـەیری تۆپەکـە دەکات. تۆپەکـە بەدرێژاییی ڕێگە دارینەکەدا دەڕوات و لەپشـت شـوێنی نماییشـەکەوە خۆی دەکات بـە خێمەیەکـدا. ئێـدی ڕادەکات بۆی و جـۆش بەدوایدا.

ئێدی لە جۆ دەپرسێت، "دەزانی کەوتە کوێوە؟"

"نا."

کەسـێك بەشـی پێشـەوەی خێمەیـەك هەڵدەداتـەوە و بـە دەنگێکـی ناخـۆش قسەکانیان پێ دەبڕێت. ئێـدی و جـۆ سـەر بـەرز دەکەنـەوە و ژن و پیاوێـك دەبینـن، ژنەکـە زۆر قەڵـەوە و پیاوەکـەش بەشـی سـەرەوەی ڕووتـە، هەمـوو گیانـی بـە مـووی سـوور داپۆشـراوە، هەردووکیـان کارەکتـەری سەیروسـەمەرەی نـاو نماییشـە ترسـناکەکەن.

منداڵەکان لە جێی خۆیان سڕ دەبن.

پیـاوە تووکنەکـە بـە زەردەخەنەیەکـی گـەورەوە دەڵێـت، "ئەوە چـی دەکـەن لێـرە، هـەی نازانـم چییانـە؟ بەتەمـان بـەزم بنێنـەوە؟"

لێوەکانـی جـۆ دەلـەرزن. لـە چاوترووکانێکـدا جـۆ دەسـت بـە گریـان دەکات و بـە قەڵەمبازێـك بـۆی دەر دەچێـت. ئێدییـش هەڵدەستێت و دەیەوێـت ڕابـکات، بـەڵام لـەو کاتـەدا چاوەکانــی دەچنــە ســەر تۆپەکــەی، کــە لەژێــر تەپڵەکێکــی تەختــەدا گیرســاوەتەوە. ئێـدی بەوریاییـەوە سـەیری پیاوەکـە دەکات و وردەوردە دەچێــت بــۆلای تۆپەکــە.

لەژێر لێوەوە دەڵێت، "تۆپی خۆمە."

تۆپەکە هەڵدەگرێتەوە و ڕادەکاتەوە بۆ لای جۆی برای.

ئێدی بەرەقی گوتی، "گوێ بگرە، بەڕێز، من تۆم نەکوشتووە. من هەر نازانم تۆ کێی."

پیاوە شینەکە - وەک ئەوەی بیەوێت میوانێک هێور بکاتەوە - لەسەر کورسییەک دانیشت و زەردەخەنەیەکی کرد، بەڵام ئێدی هێشتا بەپێوە مابووەوە و لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بوو.

پیاوە شینەکە گوتی، "با سەرەتا ناوی خۆمت پێ بڵێم. من ناوم *جۆزێف کۆرڤێلچیک*ە، کوڕی بەرگدروویەکم و خەڵکی گوندێکی بچووکم لە پۆڵەندا. ساڵی ١٨٩٤ هاتین بۆ ئەمەریکا. ئەو کاتە من پێنج - شەش ساڵان بووم. دایکم دەیخستمە سەر محەجەرەی بەشی سەرەوەی کەشتییەکە و بەدەم بای شەماڵی دونیایەکی تازەوە ڕای دەژەنیم. ئەوە بوو بە یەکەم یادگاریی منداڵیی من.

"ئێمەش، وەک زۆربەی کۆچەرەکان، پارەمان پێ نەبوو. لە مەتبەخەکەی ماڵی مامدا، لەسەر یەک دۆشەک دەخەوتین. باوکم بەناچاری دەستی کرد بە ئیشکردن لە کارگەیەکی درووماندا و لەوێ قۆپچەی بە چاکەتەوە دەکرد. کاتێک بووم بە دە ساڵان، لە خوێندن دەری هێنام و بردمیە لای خۆی."

ئێدی سەیری دەموچاوی داماوی پیاوە شینەکە و لێوە باریکەکانی و سینگە چرچبووەکەی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی، "باشە بۆ ئەم شتانە بۆ من باس دەکا؟"

"خۆم، هەر بەسروشت، منداڵێکی ترساو بووم، ئەو دەنگەش کە لە کارگەکەدا دروست دەبوو، ئەوەندەی تر دەیترساندم. من هێشتا تەمەنم هیی ئەوە نەبوو بچمە شوێنی ئاوا و گوێم لە بۆڵەبۆڵ و جنێوی ئەو هەموو پیاوە گەورانە بێ. هەرکاتێک چاودێرەکە لێمان نزیک دەبۆوە، باوکم پێی دەگوتم، 'سەر دابخە، با نەتبینێ.' جارێکیان لەترێکم دا و قووتوویەک قۆپچەم ڕشت، قۆپچەکان بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە. کابرای چاودێر بەسەرمدا قیژاندی، پێی گوتم کە منداڵێکی بێکەڵکم و دەبێ دەر بکرێم. هێشتا ئەو ساتەم لە بەرچاوە، کە باوکم وەک سواڵکەر کەوتە پاڕانەوە لێی، چاودێرەکەش گاڵتەی لە باوکم دەهات و بە پشتی دەستی، لووتی دەسڕی. خەریک بوو لە ئازاردا گەدەم دەتەقی. هەستم کرد قاچەکانم تەڕ بوون. سەیرێکی خوارەوەم کرد، چی ببینم! چاودێرەکە دەستی بۆ پانتۆڵە تەڕەکەم ڕاکێشا و کەوتە پێکەنین، ئینجا کرێکارەکانی تریش سەیریان کردم و ئەوانیش پێکەنین.

"لەدوای ئەو ڕووداوەوە، باوکم قسەی لەگەڵ نەکردمەوە. پێی وا بوو من شەرمەزاری لای خەڵکم کردووە، ئەمەش، بەپێی پێوەرەکانی ناو ئەو دونیایەی باوکم تیایدا دەژیا، ڕاست بوو. دەکرێ باوکان بە دەستی خۆیان کوڕەکانیان تێک بشکێنن، من لەدوای ئەو ڕووداوەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکان تێک شکام و منداڵێکی ترساوم لێ دەر چوو. کە گەورەش بووم، هەر نیگەران و ترساو بووم. لە هەمووشی خراپتر، بەگەورەییش هێشتا شەوان میزم بە خۆمدا دەکرد. بۆیە بەیانییان بەدزییەوە بیجامە و چەرچەفە تەڕەکەم

دەبرد و لە دەستشۆرەکەدا دەمشتن. بەیانییەک سەرم هەڵبڕی و بینیم باوکم گەیشتووەتە سەرم. باوکم چەرچەفە میزاوییەکانی بینی و بە جۆرێک سەیری کردم، کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە، بە چاوەکانیدا دیار بوو بیەوێت هەر لەوێدا ئەو دەزووە بپچڕێنێ، کە ژیانمانی پێکەوە دەبەست."

پیاوە شینەکە لە قسە وەستا. پێستەکەی، کە دەتگوت بۆ ماوەیەکی زۆر لە گیراوەیەکی شیندا دانراوە، لەسەر ورگی چین چین بووبوو. ئیدی چاوی لەسەر لا نەدەبرد.

پیاوە شینەکە گوتی، "ئێدوارد، من لەزگماکەوە ئاوا سەیروسەمەرە نەبووم، بەڵام ئەو کاتەی وام لێ هات، چارەسەری پزیشکی ئەوەندە پێش نەکەوتبوو. منیش بۆ چارەسەری ترسەکەم چووم بۆ لای دەرمانسازێک و داوام لێ کرد شتێکم بداتێ. ئەویش بتڵێک نیتراتی زیوی دامێ و پێی گوتم لەگەڵ ئاو تێکەڵی بکەم و هەموو شەوێک کەمێکی لێ بخۆمەوە. پاش ماوەیەک، نیتراتی زیو بەفەرمی وەک ژەهر ناسێندرا، بەڵام ئەوکات من هیچ چارەسەرێکی ترم لەلا نەبوو. کە دەمبینی نیتراتەکە کاریگەریی لەسەرم نییە، دەمگوت دیارە هیی ئەوەیە کەمی لێ دەخۆمەوە، لەبەر ئەوە، زیاترم دەخواردەوە. هەندێک جار دوو یان سێ قومی گەورەم بەبێ ئاو هەڵدەدا.

"پاش ماوەیەک، تێبینیم کرد خەڵک زۆر سەیرم دەکەن. خەریک بوو ڕەنگم دەبوو بە خۆڵەمێشی. شەرمم دەکرد و ناڕەحەت بووم، منیش، تا دەهات، زیاتر و زیاترم لە نیترانتی زیوەکە دەخواردەوە. ئەوەندەم زانی، پێستم لە ڕەساسییەوە بووە بە شین. ئەم حاڵەتە یەکێک بوو لە کاریگەرییە لاوەکییەکانی ئەو ژەهرە."

پیاوە شینەکە بۆ ساتێک لە قسە وەستا و دووبارە - ئەم جارە بە دەنگێکی نزمتر - دەستی پێ کردەوە، "لەو کارگەیەی کارم دەکرد، دەر کرام. چاودێرەکە دەیگوت گوایە کرێکارەکانی تر لێم دەترسن. ئێ منیش بەبێ ئیش و بەبێ کار چۆن خۆمم بژیاندایە؟ لەکوێ بژیامایە؟

"کەلاوەیەکی تاریکم دۆزییەوە و تیایدا، لەژێر کڵاو و پاڵتۆیەکدا، خۆم گرمۆڵە دەکرد. شەوێکیان، کۆمەڵێک پیاو، کە بەنیازی سازکردنی کەرناڤاڵ و شتی وا بوون، هاتن بۆ ئەو ناوە. جگەرەیان دەکێشا و پێدەکەنین. یەکێک لە پیاوەکان، کە پیاوێکی بچووک بوو، قاچێکیشی تەختە بوو، هەر سەیری دەکردم. دواتر هات بۆ لام.

"هەر ئەو شەوە ڕێک کەوتین منیش بەشداریی نماییش و کەرناڤاڵەکەیان بکەم. لەو شەوەوە، ژیانم بەهای بۆ گەڕایەوە."

ئێدی، لە دەموچاوی پیاوە شینەکەدا، بێدەسەڵاتیی خوێندەوە. ئەو خۆی هەموو کات دەیویست بزانێت ئەندامانی نمایشەکەی ناو شاری یارییەکە کێن و لەکوێوە هاتوون. ئەو پێی وا بوو هەریەکەیان خاوەنی چیرۆکێکی پڕ خەم و خەفەتی خۆیەتی.

"ئێدوارد، بە هۆی ئەو بۆنە و کەرنەڤاڵانەوە، زۆر ناوی تازەم بۆ دروست بوو. هەندێک جار ناوم *پیاوە شینەکەی جەمسەری باکوور* بوو، یان *پیاوە شینەکەی جەزائیر*، یان *پیاوە شینەکەی نیوزلەندا*. من خۆم نەچووبووم بۆ هیچکام لەو شوێنانە، بەڵام بەلامەوە خۆش بوو کە ئاوا دەبووم بە خەڵکی ئەو وڵاتە دوورانە، هەرچەندە ئەو زانیارییە تەنیا

لەسەر پارچەتەختەیەک یان ئاسنێک دەنووسرا و هیچی تر. نمایشەکان سادە بوون: من دەچوومە سەر تەختەی شانۆکە و دادەنیشتم. لە کەمەرم بۆ سەرەوە ڕووت بوو. خەڵک بەو ناوەدا دەهاتن و دەچوون. ئەو کابرایەش کە لە دەرەوە دانرابوو بانگی خەڵک بکات بۆ نمایشەکە، هاواری دەکرد و وەک شتێکی زۆر سەیر و داماو باسی منی دەکرد. دوو عانەم بەم ئیشە دەخستە گیرفانمەوە. جارێکیان بەڕێوەبەری نمایشەکە نازناوی *باشترین دەعبای* لێ نام، منیش - هەرچەندە قسەکەشی ناخۆش بوو - شانازیم بە نازناوەکەوە دەکرد. کاتێک ئیتر کۆمەڵگە چارەی ناوێی، بەردیشت تێ بگرن، هەر قبوڵتە.

"زستانێکیان هاتم بۆ ئەم شاری یاریی ڕووبییە. خەریکی سازکردنی نمایشێک بووین بە ناوی *نمایشی هاوولاتییە سەیروسەمەرەکان*. بۆ من زۆر خۆش بوو کە لە ئەسپ و عەرەبانەی کەرنەڤاڵەکان دوور کەوتبوومەوە و شوێنێکی ترم دۆزیبۆوە.

"ئەم شاری یارییە بوو بە لانەیەک بۆ من. لە ژوورێکدا، لەسەروو دوکانی لەفەکەوە، دەژیام. شەوان لەگەڵ ئەندامانی نمایشەکە و تەنەکەچییەکان و هەندێک جاریش لەگەڵ باوکت کۆنکەنم دەکرد. بەیانییان زوو، ئەگەر کراسی درێژم لەبەر بکردایە و خاولییەکم بەسەر شانمدا بدایە، دەمتوانی بەقەراغ ئەم کەنارەدا پیاسە بکەم و کەسیش لێم نەترسێ. ڕەنگە ئەمە شتێکی ئەوەندە گەورە نەبێ، بەڵام بۆ من ئازادییەکی خۆش بوو، کە زۆر کەم دەرفەتم بۆ دەڕەخسا تامی بکەم."

پیاوە شینەکە وەستا و سەیرێکی ئێدیی کرد.

"تێگەیشتی بۆ لەم شاری یارییەین؟ چونکە ئێرە بەهەشتی منە، نەک هیی تۆ."

چیرۆکێک بە نموونە وەر بگرە و لە دوو گۆشەنیگای جیاوازەوە لێی بڕوانە.

ساڵ، ساڵی ١٩٢٠ەکانە و یەکشەممەیەکی مانگی تەممووزە. بەیانییەکی باراناوییە و ئێدی و هاوڕێکانی یاری بەو تۆپی بەیسبۆڵە دەکەن، کە ئێدی نزیکەی ساڵێک لەوەوبەر وەک دیاریی یادی لەدایکبوونی بۆی هاتووە. لەو ساتە ڕابمێنە، کە تۆپەکە بەسەر سەری ئێدیدا گیڤە دەکات و دەکەوێتە سەر شەقامەکە. ئێدی، کە پانتۆڵێکی قەیفەی لەبەردایە و کڵاوێکی خووریی لەسەرە، بەدوای تۆپەکەدا ڕادەکات و دەچێتە بەردەم سەیارەیەکی فۆردی مۆدێل ئەی. سەیارەکە دەیخشێنێت، یەک مووی دەمێنێت لە ئێدی بدات. ئێدی وەک شەقشەقە دەلەرزێت و هەناسەبڕکێی پێ دەکەوێت. پاش کەمێک، تۆپەکە دەهێنێتەوە و ڕادەکاتەوە بۆ لای هاوڕێکانی. دواتر یارییەکە تەواو دەبێت و منداڵەکان ڕادەکەن بۆ هۆڵی داخراوی یارییەکان و لەوێ ئەو یارییە دەکەن، کە تیایدا بە قولاپێکی بچووک، بووکەڵەی گچکە لە سندوقێک دەر دەهێنێت.

ئێستا هەمان چیرۆک بە نموونە وەر بگرە و لە گۆشەنیگایەکی ترەوە لێی بڕوانە. پیاوێک فۆردێکی *مۆدێل ئەی* پێیە، هیی هاوڕێیەکیەتی و ئەم خۆی لەسەر فێر دەکات. شەقامەکە بە هۆی بارانی ئەو بەیانییەوە تەڕ و خلیسک بووە. لەناکاو تۆپێکی بەیسبۆڵ دەکەوێتە سەر شەقامەکە

و کوڕێکیش بەدوایدا ڕادەکات. شۆفێرەکە خێرا پێ بە ئیستۆپدا دەنێت سووکانەکە توند دەگرێت، سەیارەکە کەمێک دەسووڕێ و تایەکان قریشکە دەکەن.

شۆفێرەکە تا ڕادەیەکی باش کۆنترۆڵی دۆخەکە دەکات و بەردەوام دەبێت لە لێخووڕین. ئەو منداڵەی هاتووە تۆپەکە بەرێتەوە، لە ئاوێنەکەی بەردەم شۆفێرەکەدا دیار نامێنێت، بەڵام کابرای شۆفێر بیری هەر لای ئەوەیە، کە چەندە کەمی مابوو لە منداڵەکە بدات. بەو هۆیەشەوە، هێشتا کاریگەریی حاڵەتەکە لەسەر جەستەی هەر ماوە. بڕێکی زۆر لە ماددەی ئەدرینالین لە جەستەیدا دەڕژێت و دڵی دەکەوێتە تەپوکوت. دڵیشی بەهێز نییە، بۆیە ئەو تەپوکوتە بڕستی لێ دەبڕێت. دواجار شۆفێرەکە گێژ دەبێت و خەریکە بەلادا بێت. سەیارەکە یەک تۆزی ماوە بیدات بە سەیارەکی تردا. شۆفێری بەرامبەر هۆڕینێک لێدەدات و شۆفێری فۆردەکە دەست دەشکێنێتەوە و ئیستۆپێکی قاییم دەگرێت. بەمە سەیارەکە کەمێک دەسووڕێت و بە کۆڵانێکدا خل دەبێتەوە، دوا جار خۆی دەدات بە سەیارەکی وەستاودا. پێکدادانەکە دەنگێکی نزمی دێت. لایتەکانی فۆردەکە دەشکێن، بە کاریگەریی ئیستۆپە قاییمەکەش، سەری کابرای شۆفێر دەدرێت بە سووکانەکەدا و ناوچاوانی خوێنی لێ دێت. کابرا لە فۆردەکە دادەبەزێ، تا بچێت زیانی ڕووداوەکە ببینێت، بەڵام هەر لەوێدا و لەسەر شۆستەکە بەلادا دێت. دەماری قۆڵی چەپی ڕەق دەبێت و سینگی توند دەبێت. کات، بەیانییەکی یەکشەممەیە، کۆڵانەکە زۆر چۆڵە*، بۆیە پیاوەکە لەوێ،

---

* لە ئایینی مەسیحیدا، بەیانییانی یەکشەممە کاتی کۆبوونەوە و نوێژی بەکۆمەڵە لە کڵێسادا.

لەتەنیشت سەیارەکەیەوە دەمێنێتەوە و کەس فریای ناکەوێت. وردەوردە خوێنهێنەرەکانی جەستەی وایان لێ دێت، چیی دی ناتوانن خوێن بهێننەوە بۆ دڵی. کاتژمێرێک تێدەپەڕێت و دواجار پۆلیسێک دەیدۆزێتەوە. پشکنەرێکی پزیشکی دەیپشکنێت و دواتر ڕای دەگەیەنێت، کە کابرا مردووە، هۆکاری مردنەکەشی بە جەڵتەی دڵ تۆمار دەکرێت. شۆفێرەکە هیچ خزم و کەسێکی لەو شوێنە نییە.

ئەمە هەمان چیرۆکە، بەڵام لە دوو گۆشەنیگای جیاوازەوە: هەمان ڕۆژە، هەمان ساتە، بەڵام لایەک بەخۆشی تەواو دەبێت و تیایدا منداڵێک بە پانتۆڵێکی قەیفەوە خۆی دەکات بە هۆڵی داخراوی یارییەکاندا و بە قولاپێکی بچووک، بووکەڵە لە سندوقێک دەر دەهێنێت، لایەکەی تریش لە بەشی پزیشکیی دادوەری بەناخۆشی تەواو دەبێت و تیایدا کارمەندێک هاوار لە کارمەندێکی تر دەکات، کە بچێت سەیری جەستەی شین و سەیروسەمەرەی مردوویەکی تازە بکات.

پیاوە شینەکە چیرۆکەکەی لە گۆشەنیگای خۆیەوە تەواو کرد و بە دەنگێکی نزم گوتی، "ئێستا تێگەیشتی، کوڕە چکۆل گیان؟"

ئێدی لەرزێکی پێدا هات و لەژێر لێوەوە گوتی، "ئەی هاوار! شتی وا چۆن دەبێ!"

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

هەشت ساڵانە. لەسەر قەراغی قەنەفەیەکی بەرگ چوارگۆشە چوارگۆشە دادەنیشێت و بەتووڕەییەوە قۆڵەکانی لەسەر سینگی دەخاتە سەر یەك. دایکی لە بەردەمیدا، لەسەر زەوییەکە دانیشتووە و قەیتانەکانی بۆ دادەخات، باوکیشی، لەبەر ئاوێنەکەدا وەستاوە و بۆینباخەکەی ڕێك دەکات.

ئێدی دەڵێت، "من نامەوێ بێم."

دایکی، بەبێ ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە، دەڵێت، "دەزانم ناتەوێ بێی، بەڵام دەبێ بڕۆین. هەندێك جار کە ڕووداوی ناخۆش ڕوو دەدەن، دەبێ بەناچاری هەندێ شت بکەی."

"بەڵام، ئاخر ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونمە."

ئێدی بەخەمبارییەوە سەیری ئەوبەری ژوورەکە دەکات و لە سووچەکەدا ئەو پاکەتە یارییە دەبینێت، کە کۆمەڵێك پارچەی بچووکی شتدروستکردن و سێ تایەی لاستیکی تێدایە. ئێدی لە شتپێکەوەناندا زۆر لێهاتووە، نیازی وا بوو بەو پارچانە گەڵابەیەك دروست بکات و لە ئاهەنگی یادی لەدایکبوونەکەیدا، پیشانی هاوڕێکانی بدات، بەڵام ئێستا دەبێت لەجیاتیی ئەوە خۆی بگۆڕێت و لەگەڵ ئەندامانی

تـری خێزانەکـەی بـڕوات بـۆ شـوێنێکی تـر. ئێـدی ئەمـەی زۆر بـەلاوە نادادپەروەرانەیـە.

جـێری بـرای خـۆی دەکات بـە ژووردا. جـۆ، پانتۆڵێکـی خووریـی لەبەردایـە، پاپیۆنێکـی بەسـتووە و دەستکێشـێکی بەیسبۆڵیشـی لـە دەسـتی چەپـی کـردووە. بـە دەسـتی ڕاسـتی، بەتونـدی دەکێشـێت بـە دەستکێشـەکەیدا و بەگاڵتەپێکردنـەوە سـەیری ئێـدی دەکات.

جــۆ دەڵێــت، "ئەوانــە پێــڵاوە کۆنەکانــی منــن. تازەکانــم باشــترن."

ئێـدی دەموچـاو بەیەکـدا دەدات. زۆری پـێ ناخۆشـە، کـە شـڕەومڕەی جـۆی دەدەنـێ لەبەریـان بـکات.

دایکی پێی دەڵێت، "دە ئەوەندە مەجووڵێ."

ئێدی بەئازارەوە دەڵێت، "ئێ دە قاچم دەگرن."

باوکـی هاوارێکـی بەسـەردا دەکات و دەڵێـت، "بەسـەەەە،" ئینجـا مۆڕەیەکیشـی لـێ دەکات و دەسـتبەجێ ئێـدی نقـەی لـێ دەبڕێـت.

لــە گۆڕســتانەکە، ئێــدی بەئەســتەم کارمەندانــی شــاری یارییەکـە دەناسـێتەوە. ئـەو پیاوانـەی بـەزۆری کراسـی سـیرای ئاڵتوونییــان لەبەردایــە و جامانەیەکــی ســووری گەورەیــان لەسـەرە، ئێسـتا هەموویـان - بـە باوکـی ئێدییشـەوە - قاتـی ڕەشـیان لەبەردایـە، ژنەکانیـش، بـە هەمـان شـێوە، عەزیـی ڕەشـیان لەبەردایـە و هەندێکیشـیان سەرپۆشـێکی تەنکیـان بـە نیـوەی دەموچاویانـدا داوە.

ئێـدی دەبینێـت پیاوێـك بـە خاکەنـاز گڵ دەکاتـە چاڵێکـەوە و تۆزێکیـش باسـی خۆڵەمیـش دەکات. ئێـدی دەسـتی دایکـی

**گرتووە و خۆرەکە تەواو چاوی پێ بچووك کردووەتەوە. دەزانێت مەراسیمەکە ناخۆشە و دەبێت خەمبار بێت، بەڵام بەدزییەوە لە یەکەوە تا هەزار دەژمێرێت و هیوادارە تا دەگاتە هەزار، یادی لەدایکبوونەکەی بدەنەوە دەست خۆی.**

## وانەی یەکەم

ئێدی بەپارانەوەوە گوتی، "بەڕێز گیان، تکایە بمبەخشە. بڕوا بکە من نەمزانیوە شتی وا ڕووی داوە. سوێندت بۆ دەخۆم نەمزانیوە."

پیاوە شینەکە سەرێکی لەقاند و گوتی، "جا چۆن بتزانییایە، ئەو کاتە زۆر منداڵ بووی."

ئێدی چەند هەنگاوێک گەڕایەوە دواوە و وەک ئەوەی خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات، خۆی کۆ کردەوە، ئینجا گوتی، "بەڵام من ئێستا دەبێ باجەکەی بدەم."

"باجەکەی بدەی؟"

"بەڵێ، باجی تاوانەکەم. هەر بۆیەشە هێنراوم بۆ ئێرە، وا نییە؟ بۆ ئەوەی دادپەروەری بەرقەرار ببێ؟"

پیاوە شینەکە زەردەخەنەیەکی کرد، "نەخێر، ئێدوارد. تۆ بۆیە هاتووی بۆ ئێرە، بۆ ئەوەی شتێکت فێر بکەم. هەموو ئەوانەی لێرە دەیانبینی، شتێکت فێر دەکەن."

ئێدی گومانی دەکرد وا بێت، بۆیە هەر مشتەکانی نەکردەوە.

"چیم فێر دەکەی؟"

"ئەوەت فێر دەکەم، کە هیچ شتێک هەڕەمەکی نییە و

ئێمە هەموومان پێکەوە گرێ دراوین، هەر وەک چۆن ناتوانی شەماڵ لە با جیا بکەیتەوە، ئاواش ناتوانی ژیانی کەسێک لە ژیانێکی کەسێکی تر جیا بکەیتەوە."

ئێدی سەری لەقاند، "بەڵام ئەوە ئێمە بووین ئەو تۆپەمان هەڵدا و نەزانیی من بوو، کە ئاوا خێرا هاتمە سەر شەقامەکە. بۆچی بە هۆی هەڵەی منەوە تۆ بمری؟ ئەوە هیچ دادپەروەرانە نییە."

پیاوە شینەکە دەستەکانی، بەکراوەیی، کەمێک بەرز کردەوە و گوتی، "دادپەروەری بڕیار لەسەر ژیان و مردنی ئێمە نادا. ئەگەر وا بووایە، هیچ مرۆڤێکی باش بەگەنجی نەدەمردا!"

پیاوە شینەکە لەپی دەستەکانی ڕووەو ئاسمان بەرز کردەوە و لە چاوتروکانێکدا لەگەڵ ئێدی کەوتنە گۆڕستانێکەوە. بینییان هەردووکیان بە جووتە، لەدوای کۆمەڵێک کەسەوە، کە هاتوون مردوویەک بنێژن، وەستاون، قەشەیەکیش لە سەرەوە، لەتەنیشت گۆڕەکە وەستاوە و ئینجیل دەخوێنێت. ئێدی دەموچاوەکانی نەدەبینی، ئەوەی دەیبینی، تەنیا پشتی عەزی و قات و کڵاوی ڕەش بوو.

پیاوە شینەکە گوتی، "ئەوە مەراسیمی بەخاکسپاردنی منە. سەیری ئەوانە بکە کە هاتوون. هەندێکیان تەنانەت باش خۆمیان نەدەناسی، بەڵام هەر هاتبوون. بۆ؟ قەت ئەم پرسیارەت لە خۆت نەکردووە؟ بۆچی کە کەسێک دەمرێ، خەڵک لێی کۆ دەبنەوە؟ بۆچی پێیان وایە دەبێ بیکەن بە مەراسیم و کۆ ببنەوە؟

"لەبەرئەوەی ڕووحی مرۆڤ باش لەوە تێگەیشتووە، کە

ڕێگەی هەموو ژیانەکان دێنەوە سەر یەک. دەزانی کاتێک مردن کەسێک دەبا، هەر بەئەنقەست ئەوەی تەنیشتی بەجێ دەهێڵی، ئا لەو نێوەندە بچووکەی نێوان بردنی کەسێک و بەجێهێشتنی کەسێکی تریشدا، ژیانەکان دەگۆڕێن.

"تۆ دەڵێی دەبووایە تۆ لەجیاتیی من بمردیتایە، بەڵام ئەو کاتەش کە من خۆم لەسەر زەوی بووم، خەڵک پێشتر لەجیاتیی من مردبوون. ئەوە شتێکە، هەموو ڕۆژێک دووبارە دەبێتەوە. تۆ تەماشا بکە، کاتێک لە جێیەک دەڕۆیت و دوای یەک دەقیقە هەورەبرووسکە لەو جێیە دەدات، یان فڕۆکەیەک دەکەوێتە خوارەوە کە دەبووایە تۆش پێی بڕۆی، یان هاوڕێیەکت نەخۆش دەکەوێ و تۆ ساغ و سەلامەت بۆی دەر دەچی، ئێمە وا دەزانین ئەمانە هەر وا هەڕەمەکی ڕوو دەدەن، بەڵام هەموویان، بە شێوەیەکی هاوسەنگ، ڕێک خراون. یەکێک وشک دەبێ، یەکێکی تر شکۆفە دەکا. لەدایکبوون و مردن، دوو ڕووی یەک دراون.

"هەر لەبەر ئەمەشبە ئەوەندە سەرسامین بە منداڵی تازەلەدایکبوو..."

پیاوە شینەکە ڕووی بەلای گۆڕستانەکەدا وەر گێڕا، "لەگەڵ مەراسیمی بەخاکسپاردنی مردووەکان."

ئێدی دووبارە سەیری ئەو کەسانەی کرد، کە لە گۆڕستانەکەدا خڕ ببووبوونەوە. پرسیاری ئەوەی لەلا دروست بوو، کە تۆ بڵێی خۆی مەراسیمی بەخاکسپاردنی بۆ ڕێک خرابێت و کەس چووبێت. ئێدی بینیی قەشەکە چەند ئایەتێکی ئینجیلی لەسەر گۆڕی پیاوە شینەکە خوێند و ئامادەبووان سەریان دانەواند. ئەمە ئەو ڕۆژە بوو، کە

چەندین ساڵ پێش ئەو کاتە، پیاوە شینەکەیان تێدا بەخاک سپاردبوو. ئێدییش، بەو منداڵییە و بەبێ ئەوەی بزانێ چ ڕۆڵێکی هەبووە لە مردنی کابرادا، چووبوو بۆ مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی و بەو ناوەدا هەر هاتوچۆی بووبوو.

ئێدی لەسەرخۆ گوتی، "ئێشتاش تێناگەم ئەم مردنەی تۆ چ سوودێکی تێدا بوو."

پیاوە شینەکە وەڵامی دایەوە، "سوودەکەی ئەوە بوو، تۆ ژیایت!"

"بەڵام باشە، من بەحاڵ تۆم دەناسی، ڕەنگە تۆش منت نەناسیبێ."

پیاوە شینەکە دەستی خستە سەر شانی ئێدی. ئێدی دووبارە هەستی بە گەرمییەکە کردەوە. پیاوە شینەکە گوتی، "ئەوانەی ناشیانناسین، هەر ئەندامی خێزانەکەمانن، تەنیا ئەوەیە، جارێ نەمانبینیون."

پیاوە شینەکە، لەگەڵ گوتنی ئەمەدا، قۆڵی ئێدیی ڕاکێشا و لە خۆی نزیک کردەوە. لەپڕ ئێدی هەستی بە هەموو ئەو شتانە کرد، کە پیاوە شینەکە لە ژیانیدا هەستی پێ کردبوون. هەستەکان چووبوونە ناو ئێدییەوە و لە ناخیدا مەلەیان دەکرد: هەستی تەنیایی و شەرم و نائارامی و تەنانەت جەڵتەکەشی. ئەو هەستانەی ژیانی پیاوە شینەکە، هەر بەو شێوەیەی شتێک بخەیتە چەکمەجەیەکەوە و دای بخەیت، ئاوا هاتبوونە ناو ئێدییەوە.

پیاوە شینەکەی بە گوێی ئێدیدا چرپاندی، "من ئێستا دەڕۆم. ئەم ئاستەی بەهەشت بۆ من تەواو بوو، بەڵام

خەڵکی تر هەن، چاوەڕێت دەکەن."

ئێدی پیاوە شینەکەی ڕاکێشا و پێی گوت، "بوەستە، یەک شتم پێ بڵێ، کچە بچووکەکەم ڕزگار کرد یان نا؟ کچەکەی لە شاری یارییەکە خەریک بوو کورسییەکەی بەر بکەوێ، مرد یان ڕزگارم کرد؟"

پیاوە شینەکە وەڵامی نەدایەوە. ئێدی بەخەمبارییەوە دانیشت و گوتی، "کەواتە مردنەکەشم وەک ژیانم بەفیڕۆ چوو."

پیاوە شینەکە وەڵامی دایەوە، "هیچ ژیانێک بەفیڕۆ ناچێ، تاکە شت کە بەفیڕۆ دەچێ، ئەو کاتەیە کە تیایدا وا بیر دەکەینەوە تەنیایین."

پیاوە شینەکە بە ئاراستەی گۆڕستانەکەدا گەڕایەوە دواوە و زەردەخەنەیەکی کرد. هەر لەو ساتەدا بوو، کە ڕەنگی پێستی جەستەی گۆڕا بۆ ڕەنگێکی ساجیی کاڵی زۆر جوان و بێگەرد. ئەو پێستە، جوانترین پێست بوو ئێدی بینیبێتی.

ئێدی هاواری لە پیاوە شینەکە کرد، "بوەستە،" بەڵام ئێدی لە چاوترووکانێدا بۆ ئاسمان بەرز بووەوە و بەسەر زەریا ڕەساسییەکەدا فڕی، ئینجا لە سەرەوە سەیری خوارەوەی کرد و سەربانی باڵاخانە و شوێنەکانی ناو شاری یاریی ڕووبیی بینی: گومەزە خڕەکان، منارە و ئاڵاکان، کە بە شەماڵەکە دەشنانەوە.

ئینجا هەموو شتێک لە چاو ون بوو.

## یەکشەممە، کاتژمێری ٣ی پاشنیوەڕۆ

لە شاری یاریی ڕووبی، خەڵک هەموو لەدەوری کورسییە تێکشکاوەکە خڕ بووبوونەوە. ژنە بەتەمەنەکان دەستیان خستبووە سەر دەمیان، دایکانیش منداڵەکانیان دوور دەخستەوە. چەند پیاوێکی کەتە و چوارشانە، بە کراسی نیوقۆڵەوە، بەناو خەڵکەکەدا خۆیان خزاندە پێشەوە - وەک ئەوەی زۆر بتوانن ڕووداوەکە کۆنترۆڵ بکەن. کە گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە، ئەوانیش دەستەوەستان بوون و لە سەیرکردن زیاتر، هیچیان پێ نەکرا. خۆر خەریک بوو ئاوا دەبوو، سێبەرەکانی تیژ کردبووەوە و دەستی بە خەڵکەکە خستبووە سەر ناوچاوانیان. دەتگوت سڵاو دەکەن.

خەڵکەکە لەناو خۆیاندا لە یەکتریان دەپرسی، "ڕووداوەکە تا چەند قورسە؟" لە بەشی پشتەوەی قەرەباڵغییەکەوە، دۆمینگێز خۆی پێدا کرد، دەموچاوی سوور بووبووەوە و کراسەکەشی شەلالی ئارەقە بووبوو. دۆمینگێز سەیری زەوییەکەی کرد و خوێنەکەی بینی.

دەستبەجێ دەستی بە سەریەوە گرت و بەناڵەناڵەوە گوتی، "ئەی هاوااار! ئێدی گیان! توو خواااا!" تیمی فریاکەوتنی شاری یارییەکە گەیشتنە شوێنەکە و خەڵکەکەیان بڵاوە پێ

کرد، بەڵام هەر زوو ئەوانیش بێدەسەڵات لەوێدا وەستان و چاوەڕێی ئوتومبێلی فریاگوزارییەکەیان کرد. هەموو ئەوانەی لەوێ بوون، دایکان و باوکان و منداڵەکان - کە پێپسی و قوتووی گەورەیان بە دەستەوە بوو - لەوە حەپەساوتر بوون بتوانن سەیری دیمەنەکە بکەن، لەوەش سڕتر بوون جووڵەیان بۆ بکرێت. مردن گەیشتبووە بەرپێیان و لە بڵندگۆکانیشەوە بە گوێیاندا دەدرا.

هەموو دەیانپرسی، "ڕووداوەکە بابیی چەند خراپە؟" لوورەی ئۆتومبێلەکانی پۆلیس و فریاکەوتن هاتە گوێ. کارمەندی زیاتری یەکپۆش گەیشتن، شریتی زەردیان بەدەوری شوێنی ڕووداوەکەدا ڕایەڵ کرد. هۆڵی داخراوی یارییەکان، بەڕاستی داخرا. یارییەکان تا وادەیەکی دیارینەکراو قفڵیان لێ درا. هەواڵی ڕوودانی کارەساتە دڵتەزێنەکە بە هەموو کەنارەکەدا بڵاو بووەوە و تا ساتی خۆرئاوابوون، شاری یاریی ڕووبی بەتەواوی خۆڵی مردووی لێ نیشت.

## ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

هەرچەنـدە دەرگاکـەش داخـراوە، بـەڵام ئێـدی، لـە ژوورەکـەی خۆیـەوە، بۆنـی ئـەو گۆشـتە دەکات، کـە دایکی لەگـەڵ بیبـەری سـەوز و پیـازی شـیرین دەیبرژێنێـت. بۆنەکـە وەك بۆنـی تەختـە وایـە و قورسـە، بـەڵام ئێـدی حـەزی لێیەتـی.

دایکـی لـە مەتبەخەکـەوە هـاواری لـێ دەکات، "ئێدییییـی! ئـەوە بـۆ نایـەی، هەمـوو لێرەیـن."

ئێـدی لەسـەر جێگەکـەی تلێـك دەدات و کتێبـە وێنەییەکـەی دەسـتی دەخاتـە لاوە. ئەمـڕۆ دەبێـت بـە حەڤـدە ساڵ، ئیتـر هیـی ئـەوە نەمـاوە ئـەو جـۆرە کتێبانـە بخوێنێتـەوە، بـەڵام چـی بـکات، هێشـتا هـەر حـەزی لێیانـە و زۆر کەیفـی بـە پاڵەوانـە ڕەنگاوڕەنگەکانـی ناویـان دێـت، کـە شـەڕ لەگـەڵ کەسـە خراپەکانـدا دەکـەن و جیهـان ڕزگار دەکـەن. ئێـدی کۆمەڵێـك لـە کتێبەکانـی داوە بـە ئامـۆزا ڕۆمانییەکانـی، کـە تەمەنیـان گەیشـتووەتە ئـەوەی بیانخەنـە قوتابخانـە و پێـش چەنـد مانگێـك هاتـوون بـۆ ئەمەریـکا. ئـەو کاتـەی ماڵـی مامـی گەیشـتن، ئێـدی و ئەندامانـی تـری خێزانەکـەی چـوون بـۆ بەخێرهاتنیـان و لـە بەندەرەکـە چاویـان پێیـان کـەوت، دواتریـش هێنایانـن بـۆ ماڵـەوە و ژوورەکـەی جـۆ و ئێدییـان

دانـێ. بـەم شـێوەیە، ژوورەکـە بـوو بـە ژووری چـوار کـەس و کـەس بەئارامـی تیایـدا نەدەخـەوت. ئامۆزاکانـی ئێـدی ئینگلیـزی نازانـن، بـەڵام ئەوانیـش حەزیـان لـەو کتێبانەیـە، چونکـە پـڕن لـە وێنـەی ڕەنگاوڕەنـگ. هەرچۆنێـك بێـت، بـەم شـێوەیە ئێـدی وا دەکات، ئـەو کتێبانـە هەمیشـە لـە بەرچاویـدا بـن.

ئێـدی خـۆی دەکات بـە ژووردا و دایکـی بەخۆشـییەوە دەڵێـت، "ئاهەنگەکـە بـۆ ئـەم کـوڕە جوانەمانە." ئێدی کراسـێکی سـپیی لەبەردایـە و بۆینباخێکـی شـینیش لـە ملـە ئەسـتوورەکەی تونـد بـووە. هاتوهاوارێـك بـە سـڵاو و دەنگـی پەرداخـی بیـرەی میـوان و هاوڕێیـان و خێـزان و کارمەندانـی شـاری یارییەکـەوە دروسـت دەبێـت. باوکـی ئێـدی لـە سـووچێکدا خەریکـی کۆنکەنـە و هەورێـك لـە دووکەڵـی جگـەرە بەسـەر سـەریەوە گەواڵـەی کـردووە.

جـۆ هـاوار دەکات، "دایـە! تـۆ بڵـێ چییـی! ئێـدی دوێنـێ شـەو کچێکـی ناسـیوە."

"بەڕاست؟"

تەزوویەك بە لەشی ئێدیدا دێت.

"ئا! ئا! دەشڵێ بەتەمایە بیهێنێ."

ئێدی بە جۆ دەڵێت، "دەمت دابخە، بەسە."

جـۆ گـوێ بـە ئێـدی نـادات و بـەردەوام دەبێـت، "بـە خـوا بەڕاسـتمە! دوێنـێ شـەو بەدڵخۆشـی هـات بـۆ لام بـۆ ژوورەکـە و بـە دەمـی خـۆی پێـی گوتـم. گوتـی، 'ئـەو کچـەم دۆزییـەوە، کـە دەیکـەم بـە هاوسـەرم.'"

ئێدی خەریکە چاك پەست دەبێت.

"گوتم بەسە."
یەکێك دەپرسێت، "ئێدی، خاتوون ناوی چییە؟"
"ئەی یەکشەممان دەچیٚ بۆ کڵێسا؟"
ئێدی جۆ دەگرێت و قۆڵی با دەدات.
"ئاااخ"
"ئێدییی!"
"نەمگوت دەمت دابخە."
جـۆ، هـەر چۆنێـك بێـت، دەڵێـت، "كـوڕە هـەر ئـەوەش نـا، گوتـی لـە سـەكۆی ستاردەسـت سەماشـی لەگـەڵ کـردووە."
ئێدی دانەیەك بە جۆدا دەکێشێت.
"ئاااخ"
"دەمت داخەەەە."
"ئێدی، بەسە، وا مەکە."
کار دەگاتــە ئــەوەی تەنانــەت ئامــۆزا ڕۆمانییەکانیشــیان تێبگــەن شــەڕە. سـەر بـەرز دەکەنـەوە و سـەیری دوو براکـە دەکـەن، کـە لەسـەر قەنەفەکـە بەیەکـدا نووسـاون. باوکــی ئێـدی جگەرەکـەی دادەنێـت و هاوارێکیـان بەسـەردا دەکات، "بیبڕنــەوە تــا نەهاتــووم و هەردووکتــان تەمبــێ بکــەم."
بـراکان لێـك دەبنـەوە، بـەڵام هێشتا چاویـان لـە چـاوی یەکتـر بڕیـوە و خێسـە لـە یەکتـر دەکـەن. هەندێـك لـە خزمـە بەتەمەنەکانیـان، زەردەخەنـە دەیانگرێـت. یەکێك لـە پوورەکانی ئێـدی بەچرپـە دەڵێـت، "دیـارە کچەکـەی زۆر بەدڵـە."
دواتــر، دوای ئــەوەی گۆشــتەکە دەخورێــت و مۆمــەکان دەکوژێندرێنــەوە و زۆربــەی میوانەکانیــش دەڕۆن، دایکــی ئێـدی ڕادیۆکـە هەڵـدەکات. هەواڵـی شـەڕێك، کـە لـە ئەوروپا

هەڵگیرساوە، دێتە دەرەوە. باوکی ئێدی دەڵێت، ئەگەر دۆخەکە خراپتر ببێت، مس و تەختەیان بەگران دەست دەکەوێت، ئەوەش وا دەکات، بەڕێوەبردنی شاری یارییەکە زۆر ئەستەم ببێت.

دایکی ئێدی دەڵێت، "هەواڵێکی ناخۆش بوو، بەڕاستی هیی ئەم کاتە خۆشە نەبوو."

دایکی ئێدی بە کەناڵەکاندا دەگەڕێت، تا ئەو کاتەی مۆسیقا لە ڕادیۆکەوە دێتە دەرەوە: ئۆرکسترایەك ئاوازێکی خۆش دەژەنن. دایکی ئێدی بەزەردەخەنەوە لەسەر ئاوازی مۆسیقاکە دەکەوێتە گمەگم. ئێدی لەسەر کورسییەکەی پان بووەتەوە و خەریکە دواقاشەکانی کێکەکە دەخوات. دایکی بەرکۆشەکەی سەر باوەشی لا دەبات و بەقەدکراوی دەیدات بەسەر پشتی کورسییەکدا، ئینجا دێ بۆ لای ئێدی. دەستی ئێدی دەگرێت و هەڵی دەستێنێت.

"ئادەی، بزانم چۆن سەمات لەگەڵ هاوڕێ تازەکەت کرد."

"دە واز بێنە، دایە."

"نا، نا، دەی!"

ئێدی بە شێوەیەك هەڵدەستێتە سەر پێ، کە دەڵێی بەرەو سێدارەی دەبەن. جۆی برای پێی پێدەکەنێت، بەڵام دایکی بە دەموچاوە خڕ و جوانەکەیەوە دەکەوێتە جووڵە و هەنگاو و بۆ پێشەوە و بۆ دواوە دەنێت، تا وا لە ئێدی دەکات، ئەویش بکەوێتە جووڵە و هەنگاوی لەگەڵدا بنێت.

دایکی ئێدی لەسەر ئاوازی مۆسیقاکە دەکەوێتە گۆرانیگوتن، "لەلاااا، لااا، لیییییی، کە تۆ لەگەڵمیییی، مانگ و ئەستێرەکاااان، لەلا، لەلا، لەلاااا، لە وەرزی هاویندااا..."

دایک و کوڕ بە ژووری میوانەکەدا دێن و دەچن. ئێدی لەوە زیاتر خۆی پێ ناگیرێت و دەداتە قاقای پێکەنین.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێدی شەش ئینجێک لە دایکی بەرزترە، بەڵام هێشتا دایکی زۆر بەئاسانی دەیهێنێت و دەیبات.

دایکی بەچرپە بە ئێدی دەڵێت، "پێم بڵێ، زۆر خۆشت دەوێ؟"

ئێدی هەنگاوەکەی لێ تێك دەچێت.

دایکی پێی دەڵێت، "ئاساییە بەقوربان! زۆرم پێ خۆشە."

بە یەك خولانەوە، دێتەوە بۆ لای مێزەکە. دایکی ئێدی قۆڵی جۆ دەگرێت و هەڵی دەستێنێت.

"دەی ئێستا پێکەوە سەما بکەن."

"لەگەڵ ئێدی؟"

"دایە، بۆ خاتری خوا!"

دایکی ئێدی سوورە لەسەر قسەکەی و دوا جار کوڕەکان ملی بۆ دەدەن. ئێدی و جۆ پێدەکەنن و لەیەك گیر دەبن. دەست دەخەنە ناو دەستی یەکتر و دەکەونە جووڵە، هەنگاوی زۆر گەورە دەنێن و بە جووڵەی قاچەکانیان، بازنەی زیادلەپێویست گەورە دروست دەکەن. ئێدی و جۆ بەدەوری مێزەکەدا هەر دێن و دەچن، دایکیشیان زۆر کەیفی بە دیمەنەکە دێت. دەنگی کلارنێتەکان لەگەڵ ئاوازی گۆرانییەکەدا بەرز دەبێتەوە و ئامۆزا ڕۆمانییەکانیان دەست دەکەن بە چەپڵەلێدان، لەو ساتەدا بۆنی گۆشتە برژاوەکەش لەناو کەشی ئاهەنگەکەدا بەتەواوی سووك دەبێت و بەرەو نەمان دەچێت.

## دووەم کەس، کە ئێدی لە بەهەشت دەیبینێت

ئێدی هەستی کرد قاچەکانی لەسەر زەوین. ئاسمان دووبارە ڕەنگی لە شینی چویتییەوە دەگۆڕا بۆ خۆڵەمێشی. چواردەوری ئێدی هەمووی داروپەردووی ڕەش و درەختی کەوتوو بوو. ئێدی دەستی لە شان و قۆڵ و ڕان و پووزەکانی دا. هەستی کرد لە جاران بەهێزترە، بەڵام کاتێک ویستی بچەمێتەوە و دەست لە پەنجەکانی قاچی بدات، نەیتوانی. لەشنەرمییەکەی و جەستە لاستیکییە منداڵانەکەی پێشووی نەمابوو. هەرچیی ماسوولکە لە لەشیدا هەبوو، وەک تەلی پیانۆ توند و ڕەق بووبوون.

ئێدی سەیری گرد و دۆڵە سامناکەکانی ئەو دەوروبەرەی کرد. لەسەر گردێکی نزیکی خۆی عەرەبانەیەکی تێکشکاو و لاکی بۆنکردووی ئاژەڵێکی تۆپیوی بینی. گڕەیەک لە دەموچاوی دا. ئاسمانەکە تەقییەوە و ڕەنگێکیی زەردی وەک بڵێسەی ئاگری وەر گرت.

ئێدی جارێکی تریش ڕای کردەوە، بەڵام ئەم جارەیان جیاواز ڕای دەکرد و وەک سەربازی جەنگ، هەنگاوی قورس و زیتانەی دەنا. لەناکاو هەورەبرووسکەیەک - یان شتێکی وەک هەورەبرووسکە، یان تەقینەوەیەک یان بۆمبێک -

ئاسمانەکەی ڕووناک کردەوە. دەستبەجێ، ئێدی خۆی بە زەوییەکەدا دا، قۆڵەکانی درێژ کرد و خۆی خستە سەر سک. ئاسمانەکە دەمی کردەوە و بارانێکی خەستی مەیلەوقاوەییی بەلێزمە لێ هاتە خوار. ئێدی سەری نزم کردەوە و بەسینگەخشکە بە قوڕەکەدا ڕۆیشت، خێراخێراش ئەو قوڕ و پیسییەی تف دەکردەوە، کە بەر لێوەکانی کەوتبوو.

دواجار، ئێدی سەری بەر شتێکی ڕەق کەوت. سەری هەڵبڕی و بینیی چەکێکە، لە زەوییەکە هەڵچەقێنراوە و خوودەیەکی سەربازیی بەسەرەوەیە و زنجیر و مەدالیایەکی ئاسنیش لە دەسکەکەی ئاڵێنراون. ئێدی، کە بارانەکە چاوە تەڕەکانی خێراخێرا پێ دەترووکاند، دەستێکی لە زنجیر و مەدالیاکە دا و بەپەشۆکاوی گەڕایەوە دواوە، ئینجا خۆی کرد بەناو دارمێوێکی چڕدا، کە بە دارهەنجیرێکی هیندیی زەبەلاحدا هەڵزنابوو. ئێدی خۆی کرد بەناو ئەو تاریکییەدا، کە دارمێو و دارهەنجیرەکە پێکەوە دروستیان کردبوو. بەخێرایی قاچەکانی کۆ کردەوە، ئەژنۆکانی بە سینگییەوە نووساند و هەوڵی دا هەناسەی بەبەردا بێتەوە. ترس گەیشتبووە سەری، تەنانەت لە بەهەشتیش!

لەسەر مەدالیاکە، ناوی ئێدی هەڵکۆڵرابوو.

گەنجان دەچن بۆ شەڕ، هەندێک بەناچاری و هەندێک بە ویستی خۆیان، بەڵام هەردوو تاقمەکە پێیان وایە دەبێت بچن. ئەم بۆچوونەش لەو چیرۆکە ناخۆشانەوە سەرچاوەی گرتووە، کە بەدرێژاییی چەندین سەدە گێڕدراونەتەوە و لە هەموویاندا ئازایەتی بەستراوەتەوە بە چەکهەڵگرتن و ترسنۆکییش بە چەکدانانەوە.

لەو ماوەیەدا کە وڵاتەکەی ئێدی لە جەنگەوە گلا، بەیانییەکی باراناوی، ئێدی زوو لە خەو هەستا، ڕیشی تاشی، قژی داهێنا و چوو خۆی لە سوپادا ناونووس کرد. خەڵکەکە دەچوون بۆ شەڕ، دەبوو ئەمیش بچێت.

دایکی ئێدی پێی خۆش نەبوو کوڕەکەی بڕوات بۆ شەڕ، باوکیشی، کاتێک هەواڵەکەی بیست، جگەرەیەکی داگیرساند و بەهێواشی دووکەڵەکەی بە هەوادا پەرش کردەوە.

هەموو کاردانەوەکەی ئەوە بوو کە گوتی، "کەی دەڕۆی؟"

ئێدی پێشتر چەکی بەکار نەهێنابوو، لەبەر ئەوە، پێش ئەوەی بڕوات بۆ شەڕ، لە شاری یاریی ڕووبی لەسەر *یاریی تەقەکردن* دەستی بە ڕاهێنان کرد. لەو یارییەدا، پێنج سەنتت دەدا و یارییەکە دەستی دەکرد بە خرەخر، تۆش بە چەکێکەوە دەوەستایت و تۆپی کانزایی بچووکت بە وێنەی ئاژەڵەکانی جەنگەڵەوە - بۆ نموونە، شێر و زەڕافە - دەنا. هەموو ئێوارەیەک، ئێدی، دوای ئەوەی هەر بۆ دڵنیایی سەیرێکی ئیستۆپی شەمەندەفەرە بچووکەکەی دەکرد، دەچووە سەر ئەو یارییە و تەقەی دەکرد. شاری یاریی ڕووبی چەند یارییەکی تازە و بچووکتری بۆ هاتبوو، لەدوای ئەو قاتوقڕییەی بەسەر وڵاتەکەدا هاتبوو، خەڵک بلیتی *یاریی ڕەوڕەوەی مەرگ*ەکەیان پێ گران بوو، بۆیە ئەوەندە سەرنەدەکەوتن. شەمەندەفەرە بچووکەکە یارییەکی زۆر سادە بوو، فارگۆنەکانی تا ناوقەدی پیاوێکی کەڵەگەت دەهاتن.

ئێدی، پێش ئەوەی خۆی لە سوپادا ناونووس بکات، شتێک پارەی کۆکردبووەوە و بەو هیوایە بوو بەو پارەیە

بەشی ئەندازیاری بخوێنێت. خەونی ئیدی، ئەندازیاری بوو، حەزی لە بنیاتنانی شت بوو، هەرچەندە جۆی برای هەمیشە پێی دەگوت، "کوڕە دە واز بێنە، کەی تۆ و ئەندازیارییان گوتووە!"

هەر کە شەڕ دەستی پێ کرد، شاری یارییەکان ئیشیان کز بوو. ئێستا زۆربەی ئەوانەی هاتوچۆی شاری یاریی ڕووبییان دەکرد ئەو دایکانە بوون، کە تەنیا منداڵاکانیان لەگەڵیان مابوونەوە و مێردەکانیان چووبوون بۆ شەڕ. هەندێک جار، منداڵان داوایان لە ئیدی دەکرد بەرزیان بکاتەوە و قەڵاندۆشکانیان بکات، کاتێکیش ئێدی ڕازی دەبوو، دایکی منداڵەکان بەخەمبارییەوە زەردەخەنەیان دەکرد. لەو ساتانەدا، ئێدی تێدەگەیشت کە بە شێوەیەکی ڕاست منداڵەکان هەڵدەگرێت، بەڵام بە دوو دەستی هەڵە. ئیدی ئێدی تێگەیشت کە دەبێت بەو زووانە پەیوەندی بەو هاووڵاتییە دوورەدەستانەی وڵاتەکەیەوە بکات و کۆتایی بەو ژیانە بهێنێت، کە لە گریسکردنی زنجیر و بۆربڕینگەکان و تایمکردنەوەی ئیستۆپی یارییەکاندا بەسەری دەبرد. جەنگ ئەو شتە بوو، کە ئێدی بانگ دەکرد بۆ لای پیاوەتیی خۆی، بەڵام لەوەش دەچوو کە ئێدی ڕۆیشت، یەکێک هەبێت بیری بکات.

لە یەکێک لە دواشەوەکانی پێش ڕۆیشتنیدا، ئێدی بەرامبەر وێنەی ئاژەڵەکان خۆی بەسەر چەکەکەیدا چەماندبووەوە و بەوپەڕی وریاییییەوە تەقەی دەکرد، تاق، تاق... لەو ساتەدا، هەوڵی دا ئەوە بهێنێتە بەرچاوی خۆی، کە بەڕاستی لە شەڕدایە و تەقە لە دوژمن دەکات. تاق. تۆ بڵێی سەربازانی

دوژمن، کە فیشەکەکە دەیانپێکێت، هاواریان لێ بەرز ببێتەوە؟ تاق، یان هەر تەنیا، وەک شێر و زەرافەکان، بەلادا دێن و تەواو؟

*تاق! تاق!*

"ڕاهێنان لەسەر کوشتن دەکەی، برا؟"

میکی شی لەپشت ئێدییەوە وەستابوو. قژی، کە بە ئارەقە تەڕ بووبوو، ڕەنگی ئایسکریمی ڤانێلای هەبوو، دەموچاویشی، بە ئەو شتەی خواردبوویەوە - جا هەرچییەک بووبێت - سوور هەڵگەڕابوو. ئێدی شانێکی هەڵتەکاند و لە تەقەکردنی خۆی نەکەوت. ئامانجەکەی پێکا، *تاااق*، ئەمەشیان پێکای.

"نا! نا! باشی."

ئێدی خواخوای بوو میکی شی بڕوات و ئەویش خەریکی ئیشەکەی خۆی ببێت. زۆر نارەحەت بوو کە ئەو سەرخۆشە پیرە ئاوا لەپشتیەوە وەستابوو. ئێدی گوێی لە هەناسە قورسەکانی و فیشکەفیشکی لووتی بوو، کە دەتگوت تایەی پاسکیلە و بە پەمپ هەوای تێ دەکەن.

ئێدی لە تەقەکردن نەوەستا. لەناکاو، میکی شی بەتوندی شانی گرت.

شی بە دەنگێکی گڕی نزم بە ئێدیی گوت، "برای خۆم، با من پێت بڵێم، شەڕ یاریی مندااڵن نییە، هەرکاتێک پێویست بوو تەقە بکەی، دەبێ بیکەی. تێدەگەی؟ دوودڵی و بەزەیی و ئەوانە نییە. تەقە دەکەی و بیر لەوە ناکەیتەوە ئەوەی تەقەی لێ دەکەی یان دەیکوژی، کێیە و کێ نییە و بۆ تەقەی لێ دەکەی، تێدەگەی؟ ئەگەر دەتەوێ بەزیندوویی بگەڕێیتەوە، دەبێ بەبێ بیرکردنەوە تەقە بکەی."

شی توندتر شانی ئێدیی گرت و بەردەوام بوو، "ئەو بیرکردنەوەیەیە، کە بە کوشتت دەدا."

ئێدی ئاوڕێکی دایەوە و تۆزێک لە میکی شی ورد بووەوە. شی زللەیەکی قاییمی لە ڕوومەتی ئێدی دا و ئێدییش، بەبێ بیرکردنەوە، دەستی بەرز کردەوە تا تۆڵەی خۆی بکاتەوە، بەڵام میکی شی خۆی ڕاپسکاند و گەڕایەوە دواوە. ئینجا شی، بە دەموچاوێکەوە، کە خەریک بوو گریانی دەکەوتە سەر، سەیری ئێدیی کرد. پێنج سەنتییەکەی ئێدی تەواو بووبوو. چەکە میکانیکییەکە لە خرەخر وەستا.

گەنجان دەچن بۆ شەڕ، هەندێک جار بەناچاری و هەندێک جار بە ویستی خۆیان. پاش چەند ڕۆژێک، ئێدی جانتای پێچایەوە و شاری یارییەکەی بەجێ هێشت.

بارانەکە خۆشی کردەوە. ئێدی بەشەتاڵی لەژێر دارهەنجیرە گەورەکەدا هەڵدەلەرزی. هەناسەیەکی قووڵ و درێژی دایەوە و هەندێک لە لقە چڕەکانی دارمێوەکەی لەیەک جیا کردەوە. بینیی هێشتا چەکەکە و کڵاوەکە لە جێی خۆیانن. ئێدی بیری کەوتەوە، کە بۆچی سەربازەکان لە مەیدانی جەنگدا ئەمەیان دەکرد: ئەوە نیشانەی ئەوە بوو، ئەو شوێنە گۆڕی سەربازێکە.

ئێدی بەگاگۆڵکێ و لەسەر ئەژنۆ هاتە دەرەوە. لە بناری گردێکی نزم و دوور پاشماوەی گوندێکی بینی، کە بۆمبباران و سووتان تەواو خاپووریان کردبوو. ئێدی بۆ ساتێک لە داروپەردووی گوندەکە ورد بووەوە و دەمی داچەقی، ئینجا هێزی دایە بەر چاوەکانی و دیمەنەکەی لەلا ڕوونتر بووەوە.

سینگی ئێدی، وەک سینگی پیاوێک کە ئەو دەقیقەیە هەواڵێکی جەرگبڕی پێ درابێت، هاتەوە یەک و توند بوو. ئێدی شوێنەکەی ناسییەوە. ئەوە ئەو شوێنە بوو، کە هەمیشە دەهاتە خەونەکانیەوە.

لەناکاو دەنگێک گوتی، "دڕکەومێکوتە."

ئێدی بەدەوری خۆیدا سووڕایەوە.

"دڕکەومێکوتە، گرانەتا، دەردەکۆپان، زەردەتا."

دەنگەکە لە سەرەوە دەهات، لە شوێنێکی ناو دارهەنجیرەکەوە.

"من ئێستا و ئەوساش نەمزانی زەردەتا چییە. قەت کەسم نەدی تووشی ئەم نەخۆشییە بووبێ."

دەنگەکە بەهێز بوو، بەڵام خاوییەکی تێدا بوو، کە وەک شێوەزاری ئاخاوتنی باشووری ئەمەریکا دەیهێنایە بەر گوێ، لە دەنگی پیاوێکیش دەچوو، کە بۆ ماوەیەکی درێژ هاواری کردبێت.

"خۆمم لە دژی هەموو ئەو نەخۆشییانە کوتا، کەچی دواجار، بە تەندروستییەکی زۆر باشەوە لەم شوێنەدا مردم."

دارەکە ڕاوەشا. هەندێک میوە بەر بوونەوە بەردەم ئێدی.

دەنگەکە گوتی، "ئەو سێوانەت لا چۆنە؟"

ئێدی قنج بووەوە و قوڕگی پاک کردەوە، "وەرە خوارەوە."

دەنگەکە وەڵامی دایەوە، "تۆ وەرە سەرەوە."

ئێدی یەکسەر خۆی لەسەر دارەکە بینییەوە، لە نزیک بەشی سەری سەرەوەی. لەوێ، بە قاچێکەوە چووە سەر لقێکی گەورە و سەیرێکی خوارەوەی کرد، زەوییەکە زۆر دوور دیار بوو لێوەی. ئێدی لەنێوان گەڵای دارهەنجیرەکە

و لقە بچووکەکانەوە چاوی گیرا و دواجار تارماییيەکی لە شێوەی پیاوێکدا بینی، کە پشتی دابوو بە قەدی دارەکەوە. دەموچاوی پیاوەکە بە ماددەیەکی ڕەش داپۆشرابوو، چاوەکانیشی وەک گلۆپی سووری بچووک دەسووتان.

ئێدی تف لە قورگیدا وشک بوو.

بەچرپە گوتی، "کاپتن! ئەوە تۆی؟"

ئێدی و کاپتن پێکەوە چووبوون بۆ خزمەتی سەربازی. کاپتنەکە فەرماندەی ئێدی بوو. پێکەوە لە فلیپین بەشداریی شەڕیان کردبوو، هەر لەوێش جیا بووبوونەوە و ئیتر ئێدی نەیبینیبووەوە، بەڵام بیستبووی گوایە لە شەڕێکدا کوژراوە.

دووکەڵ لە جگەرەی کاپتنەکەوە بەرز بووەوە.

"سەرباز! ڕێساویاساکانیان بۆ ڕوون کردیتەوە؟"

ئێدی سەیرێکی خوارەوەی کرد. زەوییەکە زۆر دوور بوو لێوەی، بەڵام دەیزانی ناکەوێتە خوارەوە.

ئێدی گوتی، "من مردووم."

"لەوەیاندا ڕاست دەکەی."

"تۆش هەر مردووی."

"لەوەشیاندا هەر ڕاست دەکەی."

"ئەی تۆ... کەسی دووەمی منی؟"

کاپتنەکە جگەرەکەی بەرز کردەوە و زەردەخەنەیەکی کرد، وەک ئەوەی بڵێت، "سەیر نییە لێرەش دەتوانی جگەرە بکێشی؟" ئینجا نەفەسێکی قووڵی لێ دا و دوای ساتێک، هەورێکی سپیی بچووک لە دەمیەوە هاتە دەرەوە.

"دڵنیام پێشبینیی ئەوەت نەدەکرد من ببینی، وا نییە؟

ئیدی، لە ماوەی سالانی جەنگدا، فێری زۆر شت بوو. فێر بوو چۆن سواری دەبابەی ڕۆیشتوو ببێت، فێر بوو - بەبێ ئەوەی خوودەکەی سەری لا بەرێت - بە ئاوی سارد ڕیش بتاشێت، فێر بوو لەناو سەنگەرەکەیەوە وریایانە تەقە بکات - ئەوەکوو فیشەکێک بە درەختێکەوە بنێت و پارچە بەر خۆی بکەوێت.

فێری جگەرەکێشان بوو، فێری ڕێڕۆیشتنی سەربازی بوو، فێر بوو لەمبەر بۆ ئەوبەر بە گوریس بپەڕێتەوە و قەمسەلە و ڕادیۆ و چەک و دەمامکی دژەکیمیایی و لوولاقی چەک و جانتایەک و چەند مەخزەنێکیش بە کۆڵیەوە بن، فێر بوو ناخۆشترین قاوە بخواتەوە.

فێری چەند وشەیەکی ناو چەند زمانێکی تر بوو، فێر بوو تف زۆر دوور هەڵبدات، لەو دڵخۆشییە سەیرە تێگەیشت، کە سەربازێک دوای ڕزگاربوون لە شەڕی یەکەمیدا دەری دەبڕێت، بینیی چۆن دوای ڕزگاربوون سەربازەکان، بەخۆشییەوە بەیەکدا دەکێشن، وەک ئەوەی شەڕ تەواو بووبێت و بە یەکتر بڵێن، "ئیتر دەگەڕێینەوە بۆماڵەوە." ئیدی لەو خەمۆکییە قووڵەش تێگەیشت، کە سەربازێک دوای ڕزگاربوون لە شەڕی دووەمدا تیایدا نوقوم دەبوو، پاش ئەوەی باش درکی بەوە دەکرد کە جەنگەکە بە شەڕێک و دووان و سێیان تەواو نابێت.

ئیدی فێری فیکە بوو، فێر بوو لەسەر داروبەرد بخەوێت، تێگەیشت کە جۆرە مێروویەکی بچووک هەن دەچنە ناو پێستەکەتەوە و تووشی پەڵەی سووری سەر پێست و

خرووت دەکەن - بەتایبەت ئەگەر یەک هەفتە بێت جلە پیسەکانت دانەکەندبێت. تێگەیشت کە ئێسەکەکانی مرۆڤ، کاتێک لە پێستەکەوە دێنە دەرەوە، زۆر سپین.

ئێدی فێر بوو زۆر خێرا نزا بکات و بپاڕێتەوە. فێر بوو لە کام گیرفانەیدا ئەو نامانە هەڵبگرێت، کە بۆ ماڵەوە و مارگریتی دەناردن - بۆ ئەوەی سەربازەکانی هاوڕێی بەکوژراوی دۆزییانەوە، بیناسنەوە و بزانن کێیە. فێر بوو هەندێک جار برسێتی کێشە نییە، بەتایبەت لەو کاتانەدا، کە لەتەنیشت سەربازێکی هاوڕێتەوە دانیشتوویت و پێکەوە باسی ئەوە دەکەن، کە چەندەتان برسییە، بەڵام لە چاوتروکانێکدا گوێت لە ویژەیەک دەبێت و هاوڕێ سەربازەکەت بەلادا دێت، ئیتر تۆش برسێتییەکەت بیر دەچێتەوە.

لەگەڵ تێپەڕینی دوو ساڵ و چوونەناو سێیەم ساڵەوە، ئێدی تێگەیشت کە تەنانەت پیاوە زۆر بەهێز و چوارشانەکانیش - کاتێک نزیک دەبنەوە لەوەی بۆ یەکەم جار لە فڕۆکەکانەوە شۆڕ بکرێنەوە بۆ مەیدانی شەڕ - بەسەر پێڵاوەکانیاندا دەڕشێنەوە. تێگەیشت فەرماندە باڵاکانیش، شەوی پێش شەڕ، لە خەودا وڕێنە دەکەن.

ئێدی فێر بوو خەڵک بەدیل بگرێت، بەڵام خۆی هەرگیز فێری ئەوە نەبوو دیل بێت. شەوێکیان لە دوورگەیەک لە فلیپین، خۆی و تیپەکەی کەوتنە کەمینەوە و بەخەستی لێیان درا، ئەوانیش بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خۆیان، پەرشوبڵاو بوونەوە. ئاسمانەکە ڕووناک بووبووەوە و ئێدی گوێی لە یەکێک لە سەربازانی تیپەکەی خۆی بوو، لە چاڵێکدا وەک منداڵ دەگریا. ئێدی هاواری بەسەردا کرد، "بەسەههە." ئێدی

وای گوت و تێگەیشت هاوڕێکەی بۆیە دەگری، لەبەر ئەوەی یەکێک لە سەربازانی دوژمن بە چەکەوە لەسەر سەری وەستاوە. لەناکاو، ئیدی خۆشی هەستی بە شتێکی سارد کرد لەسەر پشتەملی: سەربازێک بە چەکەوە لەسەر سەری ئەویش وەستابوو.

کاپتنەکە جگەرەکەی کوژاندەوە. کاپتن، بە تەمەن، لە هەموو سەربازەکانی ناو کەتیبەکەی ئیدی گەورەتر بوو، تەمەنێکی درێژیشی لە سوپادا بەسەر بردبوو. جەستەیەکی لاواز و چەناگەیەکی درێژی هەبوو، کە وەک یەکێک لە ئەکتەرەکانی ئەو سەردەمە دەری دەخست. هەرچەندە کاپتنەکە زۆر زوو تووڕە دەبوو، کە بەسەر یەکێکیشدا دەیناڕاند، دەموچاوی هێندە لێ دەبردە پێشەوە، ئەو کەسە دەیتوانی ددانە بەجگەرەزەردبووەکانی ببینێت، بەڵام زۆربەی سەربازەکان کاپتنیان خۆش دەویست. کاپتن هەمیشە بەڵێنی پێ دەدان کە بکەونە هەر باروودۆخێکەوە، هەرگیز "هیچ کەسێک بەجێ ناهێڵێت،" سەربازەکانیش بەوە ئارام دەبوونەوە.

ئیدی، کە تا ئەو کاتەش سەرسووڕمان بەری نەدابوو، گوتی، "کاپتن..."

"گوێم لێتە."

"گەورەم."

"پێویست ناکا بە *گەورەم* بانگم بکەی، بە هەرحاڵ، سوپاست دەکەم."

"دەمێکە... ئێستاش شێوەت..."

کاپتنەکە بەپێکەنینەوە بۆی تەواو کرد، "هەر وەک ئەو

کاتەیە، کە دواجار یەکتریمان بینی؟"
کاپتن وای گوت و تفێکی بەسەر لقەدارێکدا هەڵدا. کاپتن دەموچاوە حەپەساوەکەی ئێدیی بینی و گوتی، "ڕاست دەکەی، لێرە پێویست ناکا تف بکەی، نەخۆش ناکەوی و هەمیشە هەناسەت باشە، خۆراکەکەشی نایابە."
"خۆراکەکە؟"
ئێدی لە هیچکام لەم شتانە تێنەدەگەیشت.
"سەیر بکە، کاپتن! هەست دەکەم هەڵەیەک هەیە، من هێشتا نازانم بۆ لێرەم. من ژیانێکی بێمانا ژیام، دەزانی؟ من کارمەندی وەرشە بووم لەو شاری یارییە. بۆ چەندین ساڵ لە هەمان شوقەدا ژیام و یارییەکانم بەڕێوە دەبرد و ئاگام لێیان بوو: چەرخوفەلەکەکە، ڕەوڕەوەی مەرگەکە، کەشتییە ئاسمانییە بچووکە قۆرەکان. ئەو ئیشەم هیچ هیی ئەوە نەبوو پێوەی بنازم. سەرگەردان بووم. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، ئەوەیە..."
ئێدی تفێکی قووت دا و ڕستەکەی تەواو کرد، "من بۆ لێرەم؟"
کاپتنەکە بە چاوە سوورە گەشەکانی سەیرێکی ئێدیی کرد. ئێدی نەیوێرا ئەو پرسیارە لە کاپتنەکە بکات، کە ئایا، وەک چۆن پیاوە شینەکەی کوشتبوو، کاپتنەکەش هەر ئەو کوشتبووی یان نا.
کاپتنەکە بەدەم چەناگەخوراندنەوە گوتی، "دەزانی ئێدی، زۆر جار بیر دەکەمەوە لە برادەرانی کەتیبەکەی خۆمان: وێلینگهام، مۆرتۆن، سمیتی... ئەرێ دوای جەنگ پەیوەندیتان پێکەوە ما؟ بینیتنەوە؟"

ئێدی ناوەکانی بیر کەوتنەوە. لە ڕاستیدا، هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەمابوو. دەکرێت جەنگ پیاوەکان وەک موگناتیس پێکەوە بنووسێنێت، بەڵام دەشکرێت وەک موگناتیس لێکیان دوور بخاتەوە. هەندێک جار، ئێدی و هاوڕێیەکی سەردەمی جەنگی بە هیچ شێوەیەک نەیاندەویست ئەو شتانەیان بیر بکەوێتەوە، کە بینیبوویانن و کردبوویانن.

ئێدی شانێکی بەرز کردەوە و گوتی، "ئەگەر ڕاستت دەوێ، هەموومان لێک دابڕاین."

"بەداخەوە."

کاپتنەکە بە شێوەیەک سەری لەقاند، کە پێی دەگوتی خۆشی هەر چاوەڕێی ئەو وەڵامەی کردووە.

"ئەی خۆت؟ گەڕایتەوە بۆ ئەو شاری یارییەی گوتمان ئەگەر بەسەلامەتی دەر بچین، هەموومان پێکەوە سەردانیی دەکەین؟ بیرتە گوتمان هەموومان بەبەلاش سواری یارییەکان دەبین و هەردانەیەشمان لە یاریی تونێلی خۆشەویستیدا دوو کچ دەخەینە باوەشی خۆمانەوە؟ تۆ خۆت وات نەگوت؟"

ئێدی زەردەخەنەیەکی کرد. بەڵێ، ئەوە قسەی ئێدی بوو، لە ڕاستیدا قسەی هەموویان بوو، بەڵام کە جەنگەکە تەواو بوو، کەسیان نەهاتن بۆ شاری یارییەکە.

ئێدی گوتی، "بەڵێ، گەڕامەوە بۆی."

"ئەی دوای ئەوە؟"

"دوای ئەوە هەر لەوێ ماوە و تا مردیشم، بەجێم نەهێشت. هەوڵم دا بەجێی بهێڵم، پلانی ترم دانا، بەڵام بە هۆی ئەم قاچە قوڕەمەوە... نازانم، هیچم بە دەستەوە نەهات."

ئێدی شانێکی هەڵتەکاند. کاپتنەکە لە دەموچاوی ئێدی

ورد بووەوە، چاوەکانی کز کرد و بە دەنگێکی نزم لێی پرسی، "ئێستاش دەتوانی لە یەک کاتدا سێ - چوار شت هەڵبدەی بۆ ئاسمان و بیانگریتەوە؟"

"بجوولێن! دەی بجوولێن!"

سەربازانی دوژمن هاواریان بەسەردا دەکردن و قۆناغەتفەنگیان تێوە دەژەنین. ئێدی، سمیتی، مۆرتۆن، ڕابۆزۆ و کاپتنەکەیان بە گردێکی لێژدا بردە خوارەوە. دیلەکان هەموو دەستیان خستبووە سەر سەریان. لە دەوروبەریان، هەر هاوەن بوو دەیدا بە زەویدا. ئێدی تارماییەکی بینی بەناو دارەکاندا دەر چوو، دەستبەجێ سەربازەکان دایانە بەر دەستڕێژی گوللە.

ئێدی هەوڵی دەدا بە چاو وێنەی شوێنەکان بگرێت و لە مێشکیدا هەڵیان بگرێت، بەو هیوایەی دواتر بۆ ڕاکردن سوودیان لێ ببینێت، بۆیە سەیری کووخ و سەنگەر و ڕێگە و هەرشتێکی دەکرد، کە بیزانییایە چییە. فڕۆکەیەک لە دوورەوە گرمەی دەهات. گرمەی فڕۆکەکە، ئێدیی پڕ کرد لە بێهیواییەکی قووڵ. ناخۆشترین ئازاری دەروونی، کە هەموو سەربازێکی بەدیلگیراو دەیچێژێت، زانینی ئەو مەودا کورتەیە، کە لەنێوان ئازادی و دیلبوونیدایە. ئەگەر ئێدی تەنیا بیتوانییایە خۆی بەرز بکاتەوە و باڵێکی فڕۆکەکە بگرێت، لە باجی ئەو هەڵەیە ڕزگاری دەبوو، کە کردبوویان.

بەڵام لەجیاتیی ئەوەی باڵی فڕۆکە بگرێت، هەر زوو دەست و قاچی خۆی و هاوڕێکانی بەسترانەوە و خرانە ناو یەکێک لەو کووخانەوە، کە بە داری بامبوو دروست

کرابوون، بەڵام ئەوەی باش بوو، ڕاستەوخۆ لەسەر قوڕەکە دانەنرابوون. ئێدی و سەربازەکانی هاوڕێی، بۆ چەندین ڕۆژ و هەفتە و مانگ لەوێ مانەوە و ناچار کران لەسەر گوێنی پڕ لە کا بخەون، ئاودەستەکەشیان گۆزەیەکی گڵ بوو. شەوانە، سەربازەکانی دوژمن دەهاتنە بن دیواری کووخەکە و گوێیان لە گفتوگۆی نێوان دیلەکانیان دەگرت. ئێدی و هاوڕێکانیشی، تا دەهات، کەمتر و کەمتریان دەگوت.

دیلەکان لاواز و بێهێز بوون و پەراسووەکانیان دەر پەڕین، تەنانەت ڕابۆزۆش، کە کاتێک خۆی لە سوپادا نانووس کرد، گەنجێکی خڕیلە و گۆشتن بوو، پەکی کەوت. ڕۆژی جارێک خۆراک دەدرایە ئێدی و هاوڕێکانی، خۆراکەکەشیان تۆپەڵەبرنجی پڕ لە خوێ و شلەیەکی مەیلەوقاوەیی بوو، کە وردەگیا مەلەی تێدا دەکرد. شەوێکیان، ئێدی زەنگەسوورەیەکی مردووی بێباڵی لە قاپەکەی خۆی دەر هێنا. هەموو دەستیان لە خواردن هەڵگرت.

لەوە دەچوو سەربازەکانی دوژمن نەزانن چی لە ئێدی و هاوڕێکانی بکەن. ئێواران بە تفەنگەکانیانەوە - کە قەمەی درێژ بەژێر لوولەکانیانەوە بوو - دەچوون بۆ لایان و نووکی قەمەکانیان لە بەردەم لووتیاندا ڕادەوەشاند، ئینجا بە زمانێکی بیانی هاواریان بەسەردا دەکردن و چاوەڕێی وەڵامیشیان دەکرد. ئێستا و ئەوساش، هەوڵەکانیان هیچیان لێ سەوز نەبوو.

ئەوەندەی ئێدی بزانێت، سەربازەکان چوار بوون و کاپتنەکەش هەر پێی وا بوو ئەوەندە بن. دیار بوو ئەوانیش

لە تیپێکی گەورە دابڕابوون - ئەمە شتێکە، لە شەڕی ڕاستەقینەدا ڕوو دەدات - ئێستاش دەیانویست وردەوردە بەرگەی دۆخەکە بگرن و هەرچۆنێک بێت خۆیان ڕزگار بکەن. ئەوانەی دەستگیریان کردبووین دەموچاویان باریک و قووپاو بوو، تۆپەڵەڕیشی ڕەشی بژیش بە دەموچاویانەوە بوو. یەکێکیان ئەوەندە منداڵ بوو، هیچ ئەوە نەبوو ببێت بە سەرباز، یەکێکی تریان ددانەکانی ئەوەندە شاش بوون، ئێدی بە ژیانی ددانی وای نەبینیبوو. کاپتنەکە لای خۆیەوە ناوی نابوون شێتی یەک، شێتی دوو، شێتی سێ و شێتی چوار.

کاپتنەکە گوتی، "پێویست ناکا ناویان بزانین، نابێ ئەوانیش ناوی ئێمە بزانن."

پیاوان لەگەڵ دەسبەسەری ڕادێن، هەندێک باشتر لە هەندێکی تر. مۆرتۆن، کە گەنجێکی باریکە و زۆربلێی خەڵکی شیکاگۆ بوو، هەرکاتێک گوێی لە دەنگێک بووایە، زیڕەی دەکرد و بەدەم دەستهێنان بە چەناگەیەوە، لەژێر لێوەوە دەیگوت، "ئەی قوڕ بە سەرمان، ئەی قوڕ بە سەرمان..." بەم شێوەیە بەردەوام دەبوو تا ئەوانی تر لێی تووڕە دەبوون و دەمیان پێ دادەخست. سمیتی، کە کوڕی کارمەندێکی ئاگرکوژێنەوەی بروکلین بوو، زۆربەی کات نقەی لێوە نەدەهات، بەڵام هەمیشە ڕەقاییی قوڕگی بەرزونزمی دەکرد و دەتگوت شتێک قووت دەدات، دوایی زانیمان کە زمانی خۆی دەجوو. ڕابۆزۆش، کە هەرزەکارێکی سەرسووری خەڵکی پۆرتلاند/ئۆریگان بوو، بە ڕۆژ دەموچاوێکی هەبوو، کە هیچی تێدا نەدەخوێندرایەوە، زۆر جاریش شەوان لە خەو ڕادەپەڕی و دەیقیژاند، "نا! من نا! من نا!"

زۆربەی کات، ئێدی خۆی دەخواردەوە، مستی خڕ دەکرد و بۆ چەندین کاتژمێر لەسەر یەک - وەک ئەو کاتەی لە هەرزەکاریدا یاریزانێکی شپرزەی بەیسبۆڵ بوو - دەیکێشا بە لەپی دەستەکەی تریدا و لەوە بەردەوام دەبوو، هەتا ئەوەی پشتی دەستی تەواو سوور دەبووەوە و دەقڵیشا. شەوان خەونی دەبینی و لەخەونیدا گەڕابووەوە شاری یاریی ڕووبی، بۆ لای یاریی پێشبڕکێی ئەسپ، کە تیایدا پێنج نەفەر لەسەر پێنج ئەسپی یاری ڕیز دەبوون و لەناو بازنەیەکدا دەسووڕانەوە و پێشبڕکێیان دەکرد، تا زەنگەکە لێی دەدا. ئێدی لە خەونەکەیدا پێشبڕکێی لەگەڵ هاوڕێکانی، براکەی، یان مارگریتدا دەکرد، بەڵام لەناکاو خەونەکە ئاوەژوو دەبووەوە و دەیبینی چوار شێتەکە سوار چوار ئەسپەکەی تەنیشتی بوون و بەگاڵتەپێکردنەوە نەقیزەی تێ دەکوتن.

ئێدی ساڵانێکی زۆری تەمەنی لە شاری یاریی ڕووبی بەچاوەڕوانی بەسەر بردبوو، چاوەڕوانیی تەواوبوونی یارییەکان، چاوەڕوانیی کشانەوەی شەپۆلەکان، چاوەڕوانیی ئەوەی باوکی قسەیەکی لەگەڵ بکات - هەموو ئەمانەش بووبوونە ڕاهێنانێکی باش بۆ ئێدی، بۆ ئەوەی فێری ئارامگری ببێت. بەڵام ئێستا ئێدی دەیویست لەو شوێنە بچێتە دەرەوە و تۆڵەی خۆی بکاتەوە. شەویلگەی دەلەقاند و بۆکسی لە لەپی دەستی دەدا، بەدەم ئەمانەشەوە، بیری لە هەموو ئەو شەڕانە دەکردەوە، کە بەمنداڵی لە گەڕەکی خۆیان کردبوونی، بەتایبەت ئەو جارەی بە سەرەتەنەکەخۆڵێک دوو منداڵی ڕەوانەی نەخۆشخانە کرد. ئەگەر ئەو سەربازانە چەکیان پێ نەبووایە، ئێدی بەس خۆی دەیزانی چییان لێ دەکات.

بەیانییەکیان، دیلەکان لە دەنگی هاوار و بریقانەوەی دەمی قەممەکان خەبەریان بووەوە. چوار شێتەکە لە خەو هەڵیان ستاندن، دەست و قاچیان بەستنەوە و بردیانن خستیاننە چاڵێکی قووڵەوە. ناو چاڵەکە سارد بوو، زۆریش تاریک بوو. چاڵەکە سەتڵی ئاسن و پاچ و خاکەنازی تێدا بوو.

مۆرتۆن گوتی، "قوڕ بە سەرمان، کانی خەڵووزە."

لەو ڕۆژە بەدواوە، ئێدی و هاوڕێکانی ناچار کران خەڵووز لە کانەکە بهێننە دەرەوە، بۆ ئەوەی دوژمن بۆ بەگەڕخستنی ئامێر و پێداویستییەکانی جەنگ بەکاری بهێنێت. هەندێک هەڵیان دەکەنی، هەندێک خەڵووزیان لە دیوارەکانی کانەکە دەکرِاند، هەندێکیش بەردی تەختیان هەڵدەگرت و سێگۆشەیان پێ دروست دەکرد بۆ ڕاگرتنی سەقفی کانەکە. دیلی تریشی لێ بوون، بەڵام بیانی بوون و ئینگلیزییان نەدەزانی، هەمیشەش بە چاوێک سەیری ئێدییان دەکرد، کە نەتدەزانی چیی تێدا بخوێنیتەوە. قسەکردن قەدەغە بوو، هەرچەند کاتژمێرێک و پەرداخێک ئاو دەدرا بە کرێکارە دیلەکان. تا دەگەیشتنە ئێوارە، دەموچاوی دیلەکان خراپ ڕەش دەبوو، ئەوەندەش دەنووشتانەوە، شان و ملیان ژانی دەکرد.

لە مانگەکانی سەرەتای دەستبەسەربوونییاندا، ئێدی شەوانە، پێش ئەوەی بخەوێت، وێنەکەی مارگرێتی دەخستە خوودەکەیەوە و لە بەردەمی خۆی دای دەنا. ئێدی زۆر لەگەڵ نزاکردندا نەبوو، بەڵام هەموو شەوێک، بەدەم ژماردنی شەوەکانەوە، هەمان نزای دووبارە دەکردەوە: "خوایە گیان،

ئەم شەش ڕۆژەی خۆم دەدەم بە تۆ، ئەگەر تۆش شەش ڕۆژم بدەیتێ لەگەڵ مارگرێت... ئەم نۆ ڕۆژەی خۆم دەدەم بە تۆ، ئەگەر تۆش نۆ ڕۆژم بدەیتێ لەگەڵ مارگرێت... ئەم شانزە ڕۆژەی خۆم دەدەم بە تۆ، ئەگەر تۆش شانزە ڕۆژم بدەیتێ لەگەڵ مارگرێت..."

لە مانگی چوارەمدا، شتێک ڕووی دا. ڕابۆزۆ پێستی خراپ سوور هەڵگەڕا و تووشی سکچوونێکی پیسیش بوو. هیچی بۆ نەدەخورا. شەوەکەی، لەژێر جلە چڵچکنەکانیەوە، ئەوەندەی ئارەقە دەر دا، هەموو گیانی سەر ئاو گەڕا، ئینجا خۆی پیس کرد و جلی پاکیشی لێ نەبوو بیدەنێ، بۆیە ناچار، بەڕووتی لەسەر گوێنییەکان خەوت، کاپتنەکەش گوێنییەکەی خۆی وەک بەتانی پێدا دا.

ڕۆژی دواتر، لەناو کانە خەڵووزەکەدا، ڕابۆزۆ بەئەستەم دەیتوانی لەسەر قاچی خۆی بوەستێت. چوار شێتەکەش هیچ بەزەییان بەرامبەری نەنواند، کە خاو دەبووەوە و شەکەت دەبوو، داریان بە کەلەکەیدا دەکرد، بۆ ئەوەی لە خەڵووزکراندن نەوەستێت.

ئێدی بەسەریاندا نەڕاندی، "وازی لێ بێنن."

شێتی دوو، کە لە هەموو پاسەوانەکانی تر دڵڕەقتر بوو، قۆناغە تفەنگێکی بە ئێدیدا کێشا. ئێدی کەوت، ئازارێکی زۆر بەنێوان شانەکانیدا هات و ڕۆیشت. ڕابۆزۆ یەک - دوو پارچەخەڵووزی تری لێکردەوە و بەلادا هات. شێتی دوو هاواری بەسەردا کرد هەستێتەوە.

ئێدی بەزەحمەت هەستایەوە سەر پێ و هاواری کرد، "نەخۆشە!"

شێتی دوو دیسان کێشایەوە بە پشتی ئێدیدا و خستی.

مۆرتۆن بەچرپە گوتی، "دەمت دابخە، ئێدی. لەبەر خۆتمە."

شێتی دوو خۆی بەسەر ڕابۆزۆدا چەماندەوە و پێڵووەکانی ڕاکێشا، ڕابۆزۆ ناڵەیەکی لێوە هات. شێتی دوو زەردەخەیەکی کرد و - وەک ئەوەی منداڵ ژیر بکاتەوە - گمەگمێکی کرد، ئینجا هاوارێکی کرد و دەستی کرد بە پێکەنین. بەدەم پێکەنینەوە سەیری هەموو دیلەکانی تری کرد و چاویشی لە چاوی یەکبەیەکیان بڕی، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی هەموو دەیبینن. دواتر دەمانچەکەی دەر هێنا، خستیە سەر گوێی ڕابۆزۆ و یەک فیشەکی بە سەریەوە نا.

ئێدی هەستی کرد خەریکە جەستەی دەبێت بە دوو کەرتەوە. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک و مێشکی وەستا. تەقەکە لە کانە خەڵووزەکەدا دەنگی دایەوە و خوێن لە سەری ڕابۆزۆوە جۆگەلەی بەست، تا ئەوەی دەموچاوی داپۆشی. مۆرتۆن دەستی خستە سەر دەمی، کاپتنەکە سەری داخست. کەس لە جێی خۆی جووڵەی نەکرد.

شێتی دوو، هەر بە قاچ، هەندێک خۆڵی ڕەشی بە جەستەی ڕابۆزۆدا کرد، ئینجا چاوی لە چاوی ئێدی بڕی و تفێکی لەبەر پێی خۆی کرد، پاشان بەتووڕەییەوە شتێکی بە شێتی سێ و شێتی چوار، کە ئەوانیش حەپەسابوون، گوت. بۆ ساتێک، شێتی سێ سەرێکی لەقاند و ورتەورتێکی کرد، ئینجا - وەک ئەوەی نزا بکات - سەیری زەوییەکەی کرد و لێوەکانی خێراخێرا جووڵاند. شێتی دوو دەمانچەکەی

ڕاوەشاند و هاواری کردەوە، دەستبەجێ شێتی سێ و شێتی چوار، هەریەکە قاچێکی تەرمەکەی ڕابۆزۆیان گرت و بەخاوی بە کانەکەدا ڕایان کێشا. ئەو خوێنەی لە تەرمەکە دەچۆڕا، ڕێچکەیەکی دروست کرد، کە لەو تاریکییەدا دەتگوت ڕۆنە ڕژاوە. شێتی سێ و شێتی چوار ڕابۆزۆیان لەپاڵ دیوارێک، لەتەنیشت پاچێکەوە درێژ کرد.

ئیتر ئێدی نزای نەکردەوە و وازی لە ژماردنی ڕۆژەکان هێنا، لەگەڵ کاپتنەکە تەنیا باسی ئەوەیان دەکرد، چۆن پێش ئەوەی ئەوانیش بە هەمان دەردی ڕابۆزۆ بچن، هەڵبێن و خۆیان دەرباز بکەن. کاپتنەکە تێبینی کرد، سوپای دوژمن پێویستییەکی زۆری بە خەڵووزە، بۆیە تەنانەت دیلە نیوەمردووەکانیش ناچار دەکران خەڵووز دەر بهێنن. تا دەهات، ژمارەی ئەوانەی لە کانەکاندا ئیشیان دەکرد، کەمتر دەبووەوە. شەوان، ئێدی گوێی لە بۆمبباران دەبوو، واش دیار بوو بۆمببارانەکە نزیک دەبووەوە. کاپتنەکە گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەگەر دۆخەکە زۆر خراپ ببێت، چوار سەربازەکە هەموو شتێکی ئەو ناوە خاپوور دەکەن و ئینجا خۆشیان پاشەکشە دەکەن. کاپتن پێشتر ئەو چاڵانەی بینیبوو، کە لەودیو کووخە دارینەکانەوە هەڵکەنرابوون، هەروەها چاوی بەو بەرمیلە نەوتانەش کەوتبوو، کە لەسەر هەورازەکەی پشتەوە جێگیر کرابوون.

کاپتنەکە بەچرپە گوتی، "با پێتان بڵێم، ئەو بەرمیلە نەوتانە بۆ سووتاندنی ئەم شوێنەن، ئەو چاڵانەش گۆڕی ئێمەن."

دوای سێ هەفتە، شەوێکیان، کاتێک مانگ لەودیو هەورەکانەوە سەرەتاتکەی دەکرد، شێتی سێ پاسەوانیی کووخەکانی دەکرد. شێتی سێ دوو بەردی گەورەی بە دەستەوە بوو - بەردەکان هێندەی خشتێک دەبوون — لە بێتاقەتیدا هەڵی دەدان بۆ سەرەوە و دەیگرتنەوە. هەر لێی بەر دەبوونەوە و هەڵی دەگرتنەوە، ئەم جارە بەرزتر هەڵی دەدان و دیسان بۆی نەدەگیرانەوە. ئێدی، کە هەموو گیانی لە خۆڵەمێشی ڕەش هەڵکێشرابوو، سەیرێکی پاسەوانەکەی کرد و تێگەیشت خەریکی چییە. ئێدی هەر دەیویست بخەوێت و دەنگی بەردەکان نەیدەهێشت. دواجار، لەسەرخۆ ڕاست بووەوە، بینایی ڕوون بووەوە و دەمارەکانی جەستەی ژیانیان تێ گەڕایەوە.

بەچرپە گوتی، "کاپتن! ئامادەی بۆ ڕاکردن؟"

کاپتن سەری بەرز کردەوە، "بۆ بەتەمای چیت؟"

ئێدی سەرێکی ڕووەو لای پاسەوانەکە با دا، "ئەها ئەو بەردانە!"

کاپتن وەڵامی دایەوە، "ئێ، چییە؟"

ئێدی بەچرپە گوتی، "منیش دەتوانم هەڵیان بدەم و بیانگرمەوە."

کاپتنەکە چاوەکانی کز کرد، "چی؟"

هێشتا وەڵامەکەی کاپتن بەتەواوی نەگەیشتبووە لای ئێدی، کە ئێدی هاواری لە پاسەوانەکە کرد، "هێی، براله... وا نابێ کاکە، وا نابێ، تۆ بەهەڵە دەیکەی."

ئێدی جووڵەیەکی بازنەییی بە بەرەدەستەکانی کرد، "ئاوا! دەبێ ئاوا بیکەی! بێنە، بیدە بە من."

ئێدی دەستەکانی کردەوە بۆ ئەوەی شێتی سێ بەردەکانی بداتێ.

"من دەزانم بیکەم، بەردەکانم بدەرێ."

شێتی سێ بەوریاییییەوە سەیرێکی ئێدیی کرد. لەناو هەموو پاسەوانەکاندا، ئێدی هیوای بەوە هەبوو لەگەڵ ئەمەیاندا شتێکیان بۆ بکرێت. شێتی سێ جارجار لەو کونە بچووکەوە، کە لەسەر ڕوویەکی کوخە دارینەکەدا بوو، پارچەنانی بۆ زیندانییەکان هەڵدەدایە ئەودیو. ئێدی دووبارە ئەو جووڵە بازنەیییەی کردەوە و زەردەخەنەیەکی کرد. شێتی سێ کەمێک نزیک بووەوە، ئینجا وەستا و گەڕایەوە، تا تفەنگەکەی بهێنێت. تفەنگەکەی هێنا و بەردەکانی بە قاچ هەڵدا بۆ ئێدی.

ئێدی گوتی، "بەم شێوەیە،" پاشان زۆر لێزانانە دەستی کرد بە هەڵدان و گرتنەوەی بەردەکان. ئێدی بە حەوتساڵی ئەو شتە لە پیاوێکی نمایشکاری ئیتاڵییەوە فێر بووبوو، کە بە جارێک شەش قاپی هەڵدەدا و نەشی دەهێشت یەک دانەیان بکەوێت. ئێدی چەندین کاتژمێری لەسەر ڕێگە دارینەکەی شاری یاریی ڕووبی بە ڕاهێنان لەسەر ئەم یارییە بەسەر بردبوو، چەو، تۆپی بچووکی لاستیک، هەرچییەک دەستی بکەوتایە، دەکەوتە هەڵدان و گرتنەوەی. ئەو شتە بۆ ئێدی زۆر ئاسان بوو. لە ڕاستیدا، زۆرینەی منداڵانی شاری یاریی ڕووبی ئەو شتەیان دەزانی.

تا دەهات، ئێدی دوو بەردەکەی خێراتر و بە جوشوخرۆشێکی زیاترەوە هەڵدەدا و سەرنجی پاسەوانەکەی زیاتر بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. پاش کەمێک وەستا و بە

پاسەوانەی گوت، "بەردێکی تریشم بدەرێ."

شێتی سێ ورتەورتێکی کرد.

ئێدی سێ پەنجەی لە پەنجەکانی دەستی جیا کردەوە، "سێ بەرد، ئاگات لێیە! سێ!"

سمیتی و مۆرتۆنیش لە خەو هەستابوون. کاپتنەکە وردەوردە نزیک دەبووەوە.

سمیتی ورتەیەکی کرد، "بەتەماین چین، چی بکەین؟"

ئێدی بەورتە گوتی، "ئەگەر یەک بەردی ترم بدەنێ..."

شێتی سێ دەرگای ژوورەکەی خۆیانی کردەوە و ئەوەی کرد، کە ئێدی هیوادار بوو بیکات: هاواری لە ئەوانی تریش کرد بێن. شێتی یەک بە خۆی و بەردێکی گەورەوە دەر کەوت و شێتی دووش بەدوایدا هات. شێتی سێ بەردەکەی هەڵدا بۆ ئێدی و شتێکی بە دەنگی بەرز گوت، ئینجا گەڕایەوە دواوە و زەردەخەنەیەکی گەورەی بۆ دوو پاسەوانەکەی تر کرد، بە دەستیشی، ئاماژەی بۆ کردن دابنیشن، وەک ئەوەی پێیان بڵێت، "تۆزێکیش سەیری ئەم بەزمە بکەن."

ئێدی بەردەکانی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لە هەوادا لەگەڵ یەکتر تێکەڵ دەکرد. هەریەکەیان هێندەی دەستی خۆی دەبوو. بەدەم هەڵدانی بەردەکانەوە، ئێدی دەستی کرد بە گوتنی گۆرانییەک لەو گۆرانییانەی لە کەرناڤاڵەکاندا دەگوتران، "لە، لاااا... لاااااا... لە، لااااا، لا، لااااااا..." پاسەوانەکان دەستیان کرد بە پێکەنین، ئێدییش پێکەنییەوە، کاپتنەکەش بەدوایدا پێکەنی، بەڵام پێکەنینێکی ناچاری، بۆ ئەوەی کاتێکی زیاتر بدەن بە خۆیان.

ئێدی لە گۆرانیگوتن بەردەوام بوو، "نزیییکتر... لە، لاااااا،

ببنەوەەەەە."

ئێدی وشەکانی کردبوو بە بەشێک لە گۆرانییەکە.

مۆرتۆن و سمیتی لەسەرخۆ هاتنە پێشتر و خۆیان وا نیشان دەدا، زۆر چێژ لە نمایشەکە دەبینن.

پاسەوانەکان کەیفیان بە دۆخەکە دەهات و کەمێک شل بووبوون. ئێدی هەوڵی دەدا هاوسەنگیی هەناسەکانی تێک نەچێت. بەردێکی زۆر بەرز هەڵدا و یاریی بە دووانەکەی تر کرد، ئینجا ئەوەی تری دەگرتەوە و ئەمەی دووبارە کردەوە.

شێتی سێ خۆی بۆ نەگیرا و گوتی، "ئاااها!"

ئێدی لێی پرسی، "چۆنە بەلاتەوە؟"

ئێستا ئیتر ئێدی بەردەکانی خێراتر هەڵدەدا و دەیگرتنەوە. خێراخێرا بەردێکی زۆر بەرز هەڵدەدا و سەیری پاسەوانەکانی دەکرد چۆن لەگەڵیدا سەر بەرز دەکەنەوە. ئێدی دەستی کردەوە بە گۆرانیگوتن، "لە، لاااااا، لاااا، لاااا، تا سێ دەژمێرمممم... لە، لاااااا، لا، لاااااا، کاپتن، ئەوەی لای چەپ بۆ تۆۆۆۆ!"

شێتی دوو بەگومانەوە ناوچاوانی گرژ کرد، بەڵام ئێدی زەردەخەنەیەکی کرد، کە لە هەمان ئەو زەردەخەنەیە دەچوو، کە نمایشکارەکانی شاری یاریی ڕووبی لە کاتی بێزاربوونی تەماشاکەراندا دەیانکرد. ئێدی گوتی، "ئەمەتا، ئەمەتا، ئەمەتا، جوانترین نمایشی سەرزەوی."

ئێدی خێراتری کرد و دەستی بە ژماردن کرد، "یەەەەک... دووووو..." بەردێکی بەرزتر لە هەموو جارەکانی تر هەڵدا و پاسەوانەکانیش هەموو بەچاو دوای بەردەکە کەوتن.

ئێدی هاواری کرد، "ئێستاااا."

ئێدی بەپەلە بەردێکی گرتەوە و وەک یاریزانێکی لێهاتووی بەیسبۆڵ، بەقاییمی نای بە دەموچاوی شێتی دووەوە و لووتی شکاند، بەردەکەی تریشی گرتەوە و بە دەستی چەپی نای بە چەناگەی شێتی یەکەوە. شێتی یەک کەوت و کاپتن خۆی هەڵدایە سەری و قەمەمەی تفەنگەکەی گرت. شێتی سێ، کە تا ئەو ساتە لە جێی خۆی چەقیبوو، دەستی دایە تفەنگەکەی و شێتانە دەستی کرد بە دەسترێژ، هەر لەو کاتەدا مۆرتۆن و سمیتی خۆیان بۆ قاچی هەڵدا و دایان بە زەویدا. دەرگای ژووری سەربازەکان کرایەوە و شێتی چوار بەپراکردن هات. ئێدی دوابەردی لە ئەویان گرت، بەڵام چەند ئینجێک بە ئەملای سەریدا ڕۆییشت. بەڵام لە کاتێکدا شێتی چوار خۆی لە بەردەکە لا دەدا، کاپتنەکە لە بەردەم دیوارەکەدا بە تفەنگەوە وەستابوو، قەمەمەکەی پێشی تفەنگەکەی ئەوەندە بەقاییمی بەناو پەراسووەکانی شێتی چواردا کرد، هەردووکیان پێکەوە لەناو دەرگاکەدا کەوتن.

ئێدی ئەدرینالینی بەرز بووبووەوە و ئاگری دەکردەوە، دەستبەجێ خۆی هەڵدایەسەر شێتی دوو و بە جۆرێک دەموچاوی کوتایەوە، کە هەرگیز دەموچاوی هیچ کەسێکی لە گەڕەکی پیتکین ئاوا نەکوتابووەوە. ئێدی بەردێکی تری هەڵگرت و چەند جارێک کێشای بە کاسەی سەری شێتی دوودا، هەر بەردەوام بوو لە پێداکێشانی، تا ئەو کاتەی سەیری کرد دەستەکانی لینجییەکی مۆرباوی پیسیان پێوە نووساوە. ئێدی تێگەیشت کە ئەو لینجییە خوێن و پێست و خۆڵەمێش بووە و تێکەڵ بووە. لەو ساتەدا، دەنگی تەقەیەک هات، ئێدی دەستی بە سەریەوە گرت و بەو هۆیەشەوە بەشێک لە لینجییەکە

بە لاجانگەکانیەوە نووسا. ئێدی سەری بەرز کردەوە و بینیی سمیتی لە بەردەمیدا وەستاوە و دەمانچەیەکیش لە دەمانچەکانی پاسەوانەکانی بەدەستەوەیە. جەستەی شێتی دوو سارد بووبووەوە و لە سینگیەوە خوێن چۆڕاوگەوی بەستبوو.

سمیتی بە دەنگێکی نزم گوتی، "بۆ گیانی پاکی ڕابۆزۆ."

لە ماوەی چەند خولەکێکدا، هەرچوار پاسەوانەکە کوژران.

زیندانییەکان، لاواز و پێپەتی و خوێناوی، بەرەو هەورازەکە ڕایان دەکرد. ئێدی پێشبینیی ئەوەی دەکرد تەقەیان لێ بکرێت و سەربازی تر بێنە سەر ڕێیان، بەڵام کەس دەر نەکەوت. کووخەکانی تر بەتاڵ بوون. لە ڕاستیدا، تەواوی کامپەکە کەسی پێوە نەمابوو. ئێدی بیری لەوە کردەوە، کە تۆ بڵێی ماوەی چەندێک بووبێت هەر ئەوان و چوار شێتەکە لەو شوێنە مابێتەوە.

کاپتنەکە بەچرپە گوتی، "ڕەنگە ئەوانی تر لەگەڵ بۆمبارانەکەدا چۆڵیان کردبێ، ئێمە دواگرووپین، کە ماوینەتەوە."

بەرمیلە نەوتەکان لە یەکەم پێچی هەورازەکەدا دانرابوون. دەرگای کانی خەڵووزەکە سەد مەترێک لەولاترەوە بوو. لە نزیک خۆیانەوە کوخێکی لێ بوو، کە پڕ بوو لە چەک و تەقەمەنی. مۆرتۆن - دوای ئەوەی دڵنیا بوو کووخەکە کەسی تێدا نییە - چووە ژوورەوە و چەند ڕوومانەیەک چەند و چەک و ڕەشاشێکی ئاگرپرژێنی مۆدێلکۆنی هێنا، ئینجا گەڕایەوە و گوتی، "دە ئینجا با داروبەردی بسووتێنین."

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

لەسەر لایەکی کێکەکە نووسراوە، "بەختێکی باش، ئازایانە بجەنگە!" لەسەر لایەکەی تریشی، کە کریمی ڤانێلای پێدا کراوە، یەکێك ئەم سێ وشەیەی بەبچووکی و بە کریمی شین زیاد کردووە، "Come home soon" زوو بگەڕێرەوە،" بەڵام "o-o-n"ەکە ئەوەندە پاڵیان بەیەکەوە داوە، کە وشەکە زیاتر لە وشەی "son" دەچێت، بۆیە وەك ئەوە وایە نووسرابێت، "بگەڕێرەوە، کوڕم*."

دایکی ئێدی پێشوەخت ئەو جلانەی ئامادە کردووە، کە کوڕەکەی سبەینێ لەبەریان دەکات. هەموویانی کردووە بە عەللاگەوە و لە ژووری خەوتنەکەی ئێدی، بە دەسکی کانتۆرەکەدا، هەڵی واسیون، جووتەپێڵاوە کەشخەکانیشی لەخواریانەوە داناوە.

لە مەتبەخەکە، ئێدی لەگەڵ ئامۆزا ڕۆمانییەکانی خەریکی دەستبازییە. هەردوو دەستی خستۆتە پشتەوە و ئامۆزاکانی هەوڵ دەدەن بە بۆکس لە سکی بدەن. یەکێکیان لە

* لە زمانی ئینگلیزیدا، جیاوازیی نێوان وشەی soon و son تەنیا یەک پیتی "o"یە، بەلام لە زمانی کوردیدا وشەی *کوڕ* و *زوو* لە رووی ڕێنووسەوە زۆر لە یەکتر جیاوازن، بۆیە لێرەدا بەناچاری وشە ئینگلیزییەکانیش بەکار هێنراونەتەوە.

پەنجەرەی مەتبەخەکەوە دەست بۆ دەرەوە و بۆ لای یاریی بابەخولێی ئەسپەکە، کە بۆ سەردانکەرانی تاقی ئێواران خراوەتە ئیش، ڕادەکێشێت.

منداڵەکە بە دڵێکی خۆشەوە دەڵێت، "ئەسپ!"

دەرگای مەتبەخەکە دەکرێتەوە و ئێدی گوێی لە دەنگێك دەبێت، دەنگێك، کە تەنانەت ئێستاش دڵی پێی دەکەوێتە پەلەپەل. ئێدی بیر دەکاتەوە لەوەی ڕەنگە ئەمە لاوازییەك بێت تیایدا و پێویست بکات لەگەڵ خۆی نەیبات بۆ شەڕ.

مارگرێت دەڵێت، "چۆنی ئێدی؟"

مارگرێت لەناو دەرگاکەدا وەستاوە و زۆر جوانە. ئێدی دیسان لە سینگیدا هەست بەو ختووکەیە دەکاتەوە، کە زووزوو بۆی دروست دەبێت. مارگرێت چەند دڵۆپەبارانێك لە قژی دەتەکێنێت و زەردەخەنەیەك دەکات. کارتۆنێکی بچووکیشی بە دەستەوەیە.

"شتێکم بۆ هێناوی... بە بۆنەی یادی لەدایکبوونەکەتەوەیە... لە ڕاستیدا بە بۆنەی ڕۆیشتنەکەشتەوەیە."

مارگرێت دووبارە زەردەخەنەیەك دەکاتەوە. ئێدی ئەوەندە تامەزرۆیە باوەش بە مارگرێتدا بکات، کە پێی وایە جەستەی جێگەی ئەو هەموو تامەزرۆییەی تێدا نابێتەوە و ئێستا نا ئێستا دەتەقێتەوە. بەلای ئێدییەوە، گرنگ نییە کارتۆنەکە چیی تێدایە، ئەو تەنیا دەیەوێت هەمیشە ئەو دیمەنەی لە بەرچاو بمێنێتەوە، کە تیایدا مارگرێت خەریکە دیارییەکەی دەداتێ. وەك هەمیشە، ئێستا کە ئێدی لەگەڵ مارگرێتدایە، خۆزگە دەخوازێت کات بوەستێت.

ئێدی دەڵێت، "زۆر جوانە!"

مارگریت پێدەکەنێت.

"خۆ جارێ نەتدیوە، هەر لەخۆتەوە!"

ئێدی لێی نزیکتر دەبێتەوە و دەڵێت، "گوێ بگرە، تۆ..."

یەکێک لە ژوورەکەی ترەوە هاوار دەکات، "ئێدی، وەرە مۆمەکان بکوژێنەرەوە."

"ڕاست دەکا، برسیمانە."

"سال، بەسە!"

"ئێ وایە، برسیمانە."

کێک و بیرە و شیر و جگەرە دانراون و پێکێکیش، بۆ سەرکەوتنی ئێدی، هەڵدەدرێت. ئاهەنگی لەدایکبوون و ماڵئاواییەکەی ئێدی ئەو ساتەشی تێدا دەبێت، کە دایکی ئێدی دەست دەکات بە گریان و باوەش بە جۆی کوڕیدا دەکات، کە بە بیانووی تەختیی بنی پێیەکانیەوە لە ئەمەریکا دەمێنێتەوە و ناچێت بۆ جەنگ.

دواتر هەر ئەو شەوە، ئێدی و مارگریت پیاسەیەك بە شەقامی سەرەکیی شاری یارییەکەدا دەکەن. ئێدی ناوی هەموو بلیتفرۆش و لەفەفرۆشەکان دەزانێت و سڵاو لە یەکەبەیەکەیان دەکات، ئەوانیش هەموو هیوای سەلامەتیی بۆ دەخوازن. هەندێك لە ژنە بەتەمەنەکان چاویان پڕ دەبێت لە فرمێسك بۆی، ئێدی یەکسەر تێدەگات، کە ئەو ژنانە خۆشیان کوڕیان لە شەڕە.

ئێدی و مارگریت نوقڵی تۆفی بەتامی تووی سوور و بیرەی ڕەش دەکڕن، ئینجا پێکەوە دەست دەکەن بە زەرفی سپیی نوقڵەکەدا و لە ناوەوە پەنجەکانیان دەیکەن بە یاری. لە هۆڵی داخراوی یارییەکاندا ئێدی ئەو یارییە

دەکات، کە تیایدا دەستێکی لاستیك هەڵدەگریت و تا هێزت تێدایە ڕای دەکێشیت، لەگەڵ ڕاکێشانەکەشتدا، سەرەتیرێك لەژێر شاشەیەکەوە هەڵدەکێشت و ڕێژەی هێزی خۆتت پێ دەڵێت. ئێدی دەستە لاستیکەکە ڕادەکێشێت. سەرەتیرەکە *لاواز* و *کەمهێز* و *مامناوەند* تێدەپەڕێنێت و تا *سەر بەهێز* ناوەستێتەوە.

مارگرێت دەڵێت، "نا، نا، بەهێزی."

"ئاخر بەهێزی خۆشە!"

شەو درەنگ دەچنە سەر ڕێگە دارینەکە و وەك چۆن لە فیلمەکاندا بینیویانە، دەستی یەکتر دەگرن و خۆیان بەسەر محەجەرەی ڕێگاکەدا شۆڕ دەکەنەوە. لەسەر لمەکە، کابرایەکی پیر، کە بە ڕۆژ لە خۆڵوخاشاکی پارکەکەدا بەدوای شتی بەکەڵکدا دەگەڕێت، بە پارچەداری بچووك و پەڕۆوپیتاڵ ئاگرێکی کردووەتەوە و لەتەنیشتیەوە خۆی گرمۆڵە کردووە. لەوە دەچێت تا بەیانی لەوێ بمێنێتەوە.

لەناکاو مارگرێت دەڵێت، "پێویست ناکا داوام لێ بکەی چاوەڕێت بکەم."

ئێدی تفێك قووت دەدات.

"بەڕاستتە؟"

مارگرێت سەرێك ڕادەوەشێنێت و ئێدی زەردەخەنە دەیگرێت. ئێستا دوای ئەوەی ئێدی لەو پرسیارە ڕزگاری بووە - کە بەدرێژاییی ئەو ئێوارەیە خەیاڵی داگیر کردبوو - هەست دەکات تاڵێك خۆشەویستیی بەهێز لە دڵیەوە دەر چووە و لە شانەکانی مارگرێت ئاڵاوە، تا دیتیش، ئەو تاڵە خۆشەویستییە زیاتر مارگرێت بەرەو ئێدی ڕادەکێشێت

و دەیـکات بـە هیـی ئـەو. لـەو سـاتەدا ئێـدی ئەوەنـدەی مارگرێـت خـۆش دەوێـت، کـە هیـچ کاتێـك پێـی وا نەبـووە هیـچ کەسـێکی ئەوەنـدە خـۆش بوێـت.

دڵۆپەیـەك بـاران دەکەوێتـە سـەر ناوچاوانـی ئێـدی، دانەیەکـی تریـش. ئێـدی سـەری هەڵدەبڕێـت و دەبینێـت هـەوری ئـەو شـەوە گـەواڵ گـەواڵ بـوون.

مارگرێـت بـە ئێـدی دەڵێـت، "هـا کـوڕی بەهێـز و قـۆز!" ئینجـا زەردەخەنەیەکـی بـۆ دەکات. لـەو سـاتەدا دەموچـاوی مارگرێـت کەمێـك تێـك دەچێـت، بۆیـە مارگرێـت بەتونـدی چـاو دەنووقێنێـت، تـا ئـاو لـە چاوەکانـی بکاتـە دەرەوە. ئێـدی دڵنیـا نییـە مارگرێـت دەگـری یـان دڵۆپەبـاران چووەتـە چاویـەوە.

دواجار مارگرێت دەڵێت، "توو خوا مەمرە، باش؟"

سەربازی تازەئازادکراو زۆر جار تووڕەن و دەیانەوێت تۆڵەیەکی قورس بکەنەوە، تۆڵەی هەموو ئەو شەو و ڕۆژانەی لەدەستیان چوون، ئەو هەموو ئەشکەنجە و سووکایەتییەی پێیان کراوە. دەیانەوێت بەو تۆڵەکردنەوەیە، هاوسەنگی بۆ خۆیان بگەڕێننەوە.

لەبەر ئەوە، کاتێک مۆرتۆن بە دەستی پڕ لە چەکی دزراوەوە گەڕایەوە و بە هاوڕێکانی گوت، "دە ئینجا با داروبەردی بسووتێنین،" هەموو ئەوانی تر بەبێ یەک و دوو ڕازی بوون - هەرچەندە ڕەنگە ڕازیبوونەکەیان لەسەر بنەمایەکی لۆژیکییش نەبووبێت. هەرچوار پیاوەکە، کە ئێستا کۆنترۆڵ کەوتبووە دەست خۆیان و جۆشوخرۆش گرتبوونی، هەریەکە بە چەکێکی دوژمنەوە بەو ناوەدا بڵاو بوونەوە. سمیتی چوو بۆ لای دەروازەی کانەخەڵووزەکە، ئێدی و مۆرتۆن بۆ لای بەرمیلە نەوتەکان و کاپتنەکەش چوو بەدوای شتێکدا بگەڕێت، کە بتوانێت پێی دەرباز ببن.

کاپتنەکە بە دەنگێکی گڕ بە هەموویانی گوت، "پێنج خولەکی تر هەمووتان بێنەوە ئێرە، بەو زووانە بۆمبارانەکە دەست پێ دەکاتەوە، بۆیە دەبێ زوو بڕۆین. تێدەگەن؟ پێنج خولەک و زیاتر نا."

ئەو پێنج خولەکە بەس بوو بۆ ئەوەی سمیتی و ئێدی

و مۆرتۆن بەتەواوی ئەو شوێنە خاپوور بکەن، کە شەش مانگێک دەبوو بووبوو بە ماڵیان. سمیتی ڕووممانەکانی خستە ناو کانەخەڵووزەکەوە و ڕای کرد، ئێدی و مۆرتۆنیش سەری دوو بەرمیلە نەوتیان کردەوە و خلیان کردنەوە بۆناو سەنگەر و کووخە دارینەکان، ئینجا ڕووی لوولەی ڕەشاشە ئاگرپرژێنە تازەدزراوەکەیان کردە بەرمیلەکان و تەقاندیان. بەرمیلەکان ئاگریان گرت.

مۆرتۆن هاواری کرد، "بسووتێن!"

ئێدییش بەدوایدا، "بسووتێن!"

کانەخەڵووزەکە تەقییەوە و دووکەڵی ڕەش لە دەروازەکەیەوە هاتە دەرەوە. بۆیە سمیتی، دوای ئەوەی کاری خۆی تەواو کرد، ڕای کردەوە بۆ ئەو شوێنەی دەبوو هەموو لێی کۆ ببنەوە. مۆرتۆن لەقەیەکی لە بەرمیلەنەوتەکەی خۆی دا و خلی کردەوە بۆناو کووخێک، پێش ئەوەی بەرمیلەکە بگاتە شوێنی خۆی، بە ڕەشاشە ئاگرپرژێنەکەی ڕیزێک ئاگرەسوورەی پێدا پرژاند.

ئێدی هەر سەیری دەکرد. پاش ساتێک، بە لایەکی دەمی سووکەپێکەنینێکی کرد و بەرەوخوار ڕۆیشت بۆ ئەوەی دواکووخ بسووتێنێت. ئەو کووخەیان لە ئەوانی تر گەورەتر بوو، زیاتر لە تەویلەیەک دەچوو. ئێدی ڕەشاشە ئاگرپرژێنەکەی بەرز کردەوە و بە خۆی گوت، "تەواو، ئیتر تەوااااو." ئەو هەموو هەفتە و مانگانە لەژێر دەستی ئەو بێقیمەتە دڵڕەقانەدا، کە هەموو دەموچاودەرپەڕیو و ددانشاش بوون و شلەکەیان پڕ بوو لە ژەنگەسوورەی مردوو، تەواو بوون. ئێدی نەیدەزانی دوای ئەمە چییان بەسەر دێت، بەڵام

هەرچییەک بووایە، لەوە خراپتر نەدەبوو کە تا ئەو کاتە بەسەریان هاتبوو.

ئێدی پەنجەی خستە سەر پەلەپیتکەی ڕەشاشەکە و ئاگرەکە لە چاوترووکانێکدا هورووژمی برد، *وششششششش*... دیوارەکانی کووخەکە تەختەی بامبووی وشک بوون، بۆیە دەستبەجێ ئاگریان گرت و خەریک بوو لە بڵێسەی پرتەقاڵی و زەرددا دەتوانەوە. ئێدی گوێی لێ بوو لە دوورەوە دەنگی مەکینەیەک هات. لە دڵی خۆیدا هیوای خواست، کاپتنەکە بێت و شتێکی دۆزیبێتەوە پێی دەرباز ببن. لەناکاو، دووبارە گوێیان لە دەنگێک بووەوە، کە هەموو شەوێک گوێیان لێی دەبوو: دەنگی بۆمبباران، بەڵام ئێستا دەنگەکە نزیکتر بوو. ئێدی پێی وا بوو بۆمببارانەکە هیی هەرلایەک بێت ئەوەندە نزیکە، بڵێسەی سووتانی کووخەکان ببینن. ئەگەر لایەکەی خۆیان بووایە، ئەوا ڕزگاریان دەبوو و دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

ئێدی گەڕایەوە بۆ کووخەکە، کە خەریک بوو دادەمرکا...

*ئەو شتە چی بوو؟*

ئێدی چاوێکی تروووکاند. شتێک بە بەردەم دەرگاکەدا دەر چوو.

*چی بوو؟*

ئێدی هەوڵی دا وریایانەتر سەیر بکات. گەرمیی ئاگرەکە لەڕادەبەدەر بوو. ئێدی دەستی چەپی خستە سەر ناوچاوانی. نەیدەتوانی دڵنیا ببێت ئەو شتە چی بوو، بەڵام پێی وا بوو تارماییەکی بچووک بوو بەناو ئاگرەکەدا ڕای کرد.

ئێدی چەند هەنگاوێک چووە پێشەوە، ڕەشاشە ئاگرپرژێنەکەی دەستی داگرت و هاواری کرد، "هێی، زەلام! هێییی!"

سەقفی کووخەکە بڵێسەی لێ بەرز دەبووەوە و لەسەر ئەوە بوو دابکەوێت. ئێدی هاتەوە دواوە، چاوەکانی ئاویان کرد. ڕەنگە هەر سێبەرێک بووبێت و تەواو.

"خێرا بکە، ئێدی!"

مۆرتۆن هاتبووە سەر ڕێگەکە و بە دەست ئاماژەی بۆ ئێدی دەکرد بەپەلە بڕوات بۆ لایان و پێکەوە دەر بچن. چاوەکانی ئێدی دەکزانەوە، هەناسەی سوار بووبوو، بە دەست ئاماژەی بۆ کووخەکە کرد و هاواری لە مۆرتۆن کرد، "وا بزانم یەکێک لە ناوەوەیە!"

مۆرتۆن دەستێکی خستە پشت گوێی، "چییی؟"

"یەکێک لە ناوەوەیە."

مۆرتۆن سەری با دا. گوێی لە هیچ نەبوو، ئێدی ڕووەو کووخەکە ئاوڕی دایەوە و دووبارە هەمان شتە بچووکەکەی بینییەوە، کە بەگاگۆڵکێ بە کووخەکەدا دەڕۆیشت. شێوەکەی لە شێوەی منداڵێک دەچوو. دوو ساڵ زیاتر بوو ئێدی، جگە لە پیاوی گەورە، هیچ شتێکی تری نەبینیبوو. بینینی ئەو شێوە بچووکە لەناو ئەو کووخەدا، وای لە ئێدی کرد بۆ ساتێک ئامۆزا و خاڵۆزا بچووکەکانی خۆی و یاریی شەمەندەفەرە بچووکەکەی خۆی بەڕێوەی دەبرد و یاریی ڕەورەوەی مەرگەکە و منداڵانی سەر کەناردەریاکە و مارگرێت و وێنەکەی و هەموو ئەو شتانەی بیر بکەوێتەوە، کە چەندین مانگ بوو لە مێشکی خۆیدا سڕیبوونیەوە.

ئێدی ڕەشاشەکەی دانا و نزیکتر بووەوە، "هێی! وەرە دەرەوە. تەقەت لێ نا..." دەستێک شانی ئێدیت گرت و بەرەو دواوە ڕای کێشا، ئێدی ئاوڕی دایەوە و دەستبەجێ هەردوو

مستی خڕ کرد. مۆرتۆن بوو.

"ئێدی، دەبێ هەر ئێستا بڕۆین!"

ئێدی سەری با دا، "نا! نا! بوەستن، بوەستن، یەکێک لە ژوورەوەیە."

"کەسی تێدا نییە! دەی با بڕۆین، هەر ئێستاااا!"

ئێدی نەیدەزانی چی بکات. ئاوڕی دایەوە بۆ کووخەکە، مۆرتۆن دووبارە شانی گرتەوە، ئەم جارەیان ئێدی تەواو خۆی خولاندەوە و یەک بۆکسی لە سینگی مۆرتۆن دا. مۆرتۆن کەوتە سەر ئەژنۆ. ئێدی سەری گێژی دەخوارد و دەموچاوی لە تووڕەییدا گرژ بووبوو. دووبارە ڕووی کردەوە بڵێسەکان، چاوەکانیشی ئەوەندە کز کردبوو، خەریک بوو دادەخران.

"ئەوە خۆی نەبوو؟ خۆی بە دیوارەکەوە دەگرێ؟ ئەوە نییە لەوێدا؟"

ئێدی بەتەواوی گەیشتە ئەو بڕوایەی کە شتێکی بێگوناه لەناو کووخەکەدایە و ئەگەر فریای نەکەوێت، لە بەردەمیدا دەبێت بە خەڵووز. ئێدی چووە پێشەوە، هەر لەو ساتەدا ئەو بەشە کەمەی سەقفەکەش، کە تا ئەو کاتە نەکەوتبوو، هاڕەی کرد و هەندێک بڵێسەی شێوەکارەبایی بەسەر ئێدیدا باراند.

ئێدی، بە ڕشانەوەیەک، تەواوی ئەو جەنگەی هێنایەوە، کە چووبووە گیانیەوە. دەستبەسەرکردنەکە و کوشتنی پاسەوانەکان و گۆشت و خوێنەکەی کە بە لاجانگەکانیەوە بوون و بۆمببارانەکە و سووتانی ئەو شتەی ناو ئەو کووخە و بێمانایی هەر هەموو ئەمانەش پێکەوە، گەدەی

ئیدییان تەواو تێک دابوو. ئیدی لەو ساتەدا، تەنیا شتێک دەیویست بیکات، ئەوە بوو شتێک ڕزگار بکات، جا بەشێک لە خۆی بێت، بەشێک لە ڕۆبۆزۆ بێت، هەرشتێک بێت. ئیدی شیتانە پێی وا بوو لەناو هەموو تارماییەکی ڕەشدا رووحێک هەیە، بۆیە لەو بیرکردنەوانەدا بوو، کە بەبێ یەک و دوو بەرەوڕووی کووخە بڵێسەدارەکە ڕای کرد. فڕۆکەکان لە ئاسماندا هەر فڕەفڕیان بوو، بەردەوامیش بە فیشەک زەوییەکەیان دەبێژایەوە.

ئیدی بە شێوەیەک دەجووڵا، وەک ئەوەی بەدەم خەوەوە بڕوات. هەنگاوی بەسەر تۆزێک نەوتی ڕژاوی گڕگرتوودا نا و جلەکانی لە دواوە ئاگریان گرت. کڵپەیەک بە پووزیدا سەر کەوت بۆ ڕانەکانی. دەستەکانی بەرز کردەوە و بە هەموو هێزی خۆی هاواری کرد، "وەرە دەرەوە، هاتووم یارمەتیت بدەم، تەقەت لێ ناکەم."

ئازارێکی جەرگبڕ بە قاچی ئیدیدا هات. هاوارێکی بەرز و درێژی لێ بەرز بووەوە و دەستبەجێ بەلادا هات. خوێن لە خوار ئەژنۆیەوە فیچقەی دەکرد. فڕۆکەکان هەر گرمەگرمیان بوو، ئاسمان یەکپارچە بە ڕەنگێکی شینباو داگیرسابوو.

ئیدی لەوێدا کەوت. لە یەک کاتدا دەشسووتا و خوێنیشی لێ دەڕۆیشت. چاوەکانی بەڕووی گەرمییە هەڵقرچێنەرەکەدا داخران و بۆ یەکەمین جار لە ژیانیدا هەستی کرد ئامادەیە بمرێت. لەناکاو یەکێک بۆ دواوە ڕای کێشا و بەناو خۆڵەکەدا گەوزاندی، تا ئەوەی وردەوردە ئاگری سەر جلەکانی کوژایەوە. ئیدی لەوە سەرسوورماوتر و بێهێزتر بوو، بتوانێت خۆی ڕابگرێت، بۆیە وەک توورەکە ڕادەکێشرا. پاش

کەمێک، گەیشتە ناو سەیارەیەکی سەربازی و ئەوانی تریش لەدەوری بوون. هەموو دڵیان دەدایەوە و پێیان دەگوت خۆڕاگر بێت. پشتی ئێدی سووتابوو، ئەژنۆشی ڕووحی تێدا نەمابوو، سەریشی گێژی دەخوارد و خەریک بوو هێزی لێ دەبڕا.

کاپتنەکە، لەگەڵ بەبیرهاتنەوەی ئەو دواساتانەدا، لەسەرخۆ سەرێکی لەقاند و لە ئێدیی پرسی، "بیرتە چۆن لەو شوێنە ڕزگار کرای؟"

ئێدی گوتی، "لە ڕاستیدا، خۆشم نازانم."

"دوو ڕۆژی ویست تا باش بووی. زووزوو لە هۆش خۆت دەچووی و هۆشت دەهاتەوە. خوێنت زۆر لەبەر ڕۆیشتبوو."

ئێدی گوتی، "بەڵام باش بوو، هەرچۆنێک بێ، ڕزگارمان بوو."

"بەڵێی!"

وشەکە بەدرێژی لە دەمی کاپتنەکە هاتە دەر، ئاوازەکەی زیاتر لە ئاوازی ئاهێک دەچوو.

"فیشەکەکە شوێنێکی خراپی گرتبوو."

لە ڕاستیدا، ئێستا و ئەوساش ئەو فیشەکە بەتەواوی لە قاچی ئێدی دەر نەهێنرا. چەند دەمار و ماسولکەژێی بڕیبوو، تا گەیشتبووە ئێسکێک و ئێسکەکەشی بە شێوەیەکی ستوونی شکاندبوو. دوو نەشتەرگەری بۆ ئێدی کران، بەڵام هیچیان کێشەکەیان چارەسەر نەکرد. پزیشکەکان پێیان گوت کە لەوە بەدوا لە ڕۆیشتندا دەشەلێت و ئەو حاڵەتەش لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا - لەبەرئەوەی ئێسکەکانی لاواز دەبن -

خراپتر دەبێت. پێی گوترابوو کە "ناتوانرێت لەم چارەسەرە باشتری بۆ بکرێت" - وەک ئەوەی ئەو چارەسەرەیان زۆر باش بووبێت. ئێدی تەنیا ئەوەندەی بیر مابوو، کە لە یەکەیەکی پزیشکی خەبەری بووبووەوە و ژیانی بۆ هەتاهەتایە گۆڕابوو. ڕاکردن تەواو، سەما تەواو، لە هەمووشی خراپتر، بە هۆی چەند هۆکارێکی دیاریکراوەوە، ئەو هەستانەش تەواو، کە پێشتر لەبەرامبەر شتەکانی ناو ژیانیدا هەیبوون. ئێدی گۆشەگیر بوو. شتەکان زۆر بێمانا و بێئامانج لەلای دەر دەکەوتن. جەنگ دزەی کردبووە ناویەوە، ناو قاچی و ناو ڕووحی. وەک سەرباز، زۆر شت فێر بوو، کاتێک گەڕایەوە، پیاوێکی تر بوو!

کاپتنەکە گوتی، "تۆ دەزانی من سێ پشتم لە سوپادا بوون."

ئێدی بە شانبەرزکردنەوەیەک وەڵامی دایەوە.

"چۆنت بۆ دەگێڕمەوە، ئاوا: لە تەمەنی شەش ساڵییەوە فێری تەقەکردن بووبووم. بەیانییان، باوکم دەهات و سەیری جێگەکەمی دەکرد، لە ڕاستیدا بیستوپێنج سەنتییەکی ئاسنی هەڵدەدایە سەر و تەماشای دەکرد بزانێ جێگەکە ئەوەندە سافە، کە پارە ئاسنەکە بەرێکی لەسەری بەرز ببێتەوە یان نا. لەسەر نانخواردنیش هەمیشە بە بەڵێ، باوکە' و نەخێر، باوکە وەڵامی داواکارییەکانیم دەدایەوە.

"پێش ئەوەی دەست بکەم بە خزمەتی سەربازی، ئیشم بەس جێبەجێکردنی فەرمانەکانی باوکم بوو، دوای ئەوە چوومە سوپاشەوە، کاتێکم زانی وا خۆم بووم بە فەرماندە

و فەرمـان دەر دەکـەم.

"سـەردەمی ئاشـتی و ئاگربەسـت شـتێکی بـاش بـوو، کەسـانی ژێـر ھاتبوونـە سـوپاوە، بـەڵام دواتـر شـەڕ دەسـتی پێ کردەوە و کەسـی تـازە خۆیـان لـە سـوپادا ناونـووس کـرد. بەلێشـاو دەھاتـن و زۆربەیـان گەنجـی وەک تـۆ بـوون، ھەمـوو سـڵاویان لـێ دەکردم و داوایـان دەکرد پێیـان بڵێم چـی بکـەن و چـی نەکـەن. ترسـم لـە چاوەکانیاندا دەبینی، بە شێوەیەک لـە منیـان دەڕوانی، وەک ئـەوەی ھەمـوو نھێنییەکانی جەنگ بزانـم. پێیـان وا بـوو مـن دەتوانـم وا بکـەم نەکوژرێـن، تـۆش ھـەر وا بیـرت دەکـردەوە، وا نییـە؟"

ئێدی دەبوو ھـەر لەوێدا دانی پێدا بنێت، کە ئەویش ھـەر وا بیری کردبووەوە.

کاپتنەکـە دەسـتی بـردە دوواوە و ملـی خورانـد، "بـەڵام بێگومـان مـن توانـای ئـەوەم نەبـوو نەھێڵـم ئێوە بکوژرێـن، مـن خۆشـم لـە سـەرووترەوە فەرمانـم وەر دەگرت، ڕاسـتە توانـای ئـەوەم نەبـوو نەھێڵـم بمـرن، بـەڵام پێـم وا بـوو دەبـێ ھەمـوو ھەوڵێـک بـدەم، کـە ھەمیشـە پێکـەوە بیـن و لێـک دانەبڕێیـن. تـۆ دەزانـی ئێـدی؟ کاتێـک لـە شـەڕێکی قورسـدای، بـەدوای قسـەیەک، بیرکردنەوەیەکـی بچووکـدا دەگەڕێـی، تـا بـڕوای پێ بھێنـی. کاتێکیـش ئـەو قسـەیە دەدۆزیتـەوە، تـەواو بـڕوای پـێ دەھێنـی و تونـد دەسـتی پێـوە دەگـری، ھـەر وەک چـۆن سـەربازان لـە کاتـی نزاکردنـدا لـە سـەنگەرەکانیاندا دەسـت بـەو مەدالیـا خاچـە بچووکـەوە دەگـرن، کـە لەملیانـە.

"بـۆ مـن ئـەو قسـەیە، ئـەو بیرکردنەوەیـە، ئـەوە بـوو کـە ھەمـوو ڕۆژێـک پێتـان بڵێـم ھەمیشـە مـن لەگەڵتـان دەبـم و لـە

تەنگانەدا کەستان بەجێ ناهێڵم."

ئێدی سەرێکی لەقاند و گوتی، "ئەوە، بۆ من، هەموو دونیا بوو."

کاپتنەکە ڕاستەوخۆ سەیری چاوەکانی ئێدیی کرد و پێی گوت، "هیوادارم وا بێ."

کاپتنەکە دەستی کرد بە گیرفانەکەی سەر سینگیدا، جگەرەیەکی تری دەر هێنا و دای گیرساند.

ئێدی پرسیی، "بۆ وا دەڵێی؟"

کاپتنەکە دووکەڵی یەکەم نەفەسی بە با کرد، ئینجا بەو دەستەی جگەرەکەی پێ گرتبوو، ئاماژەی بۆ قاچی ئێدی کرد و گوتی، "چونکە من بووم فیشەکەکەم پێوە نای."

ئێدی سەیرێکی قاچی خۆی کرد، کە بەسەر لقی دارەکەوە ڕادەژەنی. لەسەر قاچی، شوێنی نەشتەرگەرییەکان دەر کەوتنەوە و ئازارەکەشی بۆ گەڕایەوە! لە ناخیدا هەستی بە شتێک کرد، کە لەپێش مردنیەوە هەستی پێ نەکردبوو – لە ڕاستیدا چەندین ساڵ بوو هەستی پێ نەکردبوو - ئەو شتەش لافاوێک لە تووڕەیی و ئارەزووی ئازاردانی شتێک بوو. چاوەکانی کز کرد و بڕینیە چاوی کاپتنەکە. کاپتنەکەش بەبێ هیچ دەربڕینێک لەسەر ڕوخساری، لە ئێدیی ڕوانییەوە، وەک ئەوەی بزانێت ئێستا چی ڕوو دەدات. ئینجا جگەرەکەی دەستی فڕێ دا و بە دەنگێکی نزم گوتی، "دەی!"

ئێدی قیژاندی و وەک ڕەشەبا خۆی بۆ کاپتنەکە هەڵدا. هەردووکیان کەوتنە خوارەوە و تا گەیشتنە سەر زەوییەکە، لەناو لقەکانی دارهەنجیرەکە و دارمێوەکەدا هەر پەلاماری

یەکیـان دەدا.

"بۆۆۆ؟ هەی بێقیمەت؟ کەسیش نا، تۆ، هەی خوێڕی."

ئێـدی و کاپتنەکـە لەســەر زەوییـە قوڕەکـە لـە یەکتـری نووسـابوون. ئێدی چووە سـەر سـینگی کاپتنەکە و بە بۆکس کەوتەسـەر دەموچـاوی. کاپتنەکە هیـچ خوێنی لێ نەهـات. ئێدی ئێخـەی کاپتنەکـەی گـرت و خێراخێـرا کەللەسـەری بـە زەوییـە قوڕەکەدا دەدا. کاپتنەکە چـاوی نەدەتترووکاند، لەجیاتیی ئـەوە، لەگـەڵ هـەر بۆکسـێکی ئێدیدا، خۆی ئەمدیو و ئەودیو دەکرد، بۆ ئـەوەی ئێدی بەباشـی لێـی بدات و داخـی خۆی پێ بڕێژێـت. دواجـار، کاپتنەکە، هـەر بـە یـەک دەسـت، ئێدیـی گـرت و هەڵـی گێڕایـەوە.

کاپتنەکـە ئانیشـکی خسـتە سـەر سـینگی ئێدی و لەسـەرخۆ گوتـی، "لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر بچوویتایەتـە نـاو ئاگرەکـەوە، تێدا دەچـووی، دەمـردی، بـەڵام ئـەو کاتـە سـەرەی تۆ نەهاتبـوو."

ئێدی زۆر خێرا هەناسەی دەدا، "سەرەی... من؟"

کاپتنەکـە بـەردەوام بـوو، "تـۆ سـوور بـووی لەســەر ئـەوەی بڕۆیتـە نـاو کووخەکـەوە، کاتێکیـش مۆرتـۆن هەوڵـی دا بتگـرێ و نەهێڵـێ بڕۆی، یـەک بۆکسـت لـێ دا، خەریـک بـوو بیبوورێنیتـەوە. ئـێ خۆشـمان دەبووایـە لـە یـەک-دوو خولەکـدا ڕابکەیـن. تـۆش ماڵـت ئـاوا بـێ، ئەوەنـدە بەهێـز بـووی، هیـی ئـەوە نەبـوو شـەڕت لەگـەڵ بکەیـن."

ئێـدی بـۆ دواجـار تـووڕە بـووەوە و ئێخـەی کاپتنەکـەی گرتـەوە، ئینجـا لـە خـۆی نزیـک کـردەوە و ددانەکانی بینـی، کـە دووکەڵـی جگـەرە زەردی کردبـوون.

ئێدی ئاگری دەکردەوە، "ئەی قاچی من! ئەی ژیانی من!"

کاپتنەکە بەهێمنی گوتی، "من قاچتم لێ سەندیتەوە، بۆ ئەوەی ژیانت بدەمەوە."

ئێدی ئێخەی کاپتنەکەی بەر دا و لەشەکەتیدا کەوتەوە سەر زەوییەکە. دەستەکانی دەئێشان و سەری گێژی دەخوارد. ئێدی بۆ چەندین ساڵ بەردەوام بیری لەو ساتە کردبووەوە، لەو تاکە هەڵەیە، کە هەموو ژیانی گۆڕیبوو.

"کوخەکە کەسی تێدا نەبوو، باشە بە چ ئەقڵێکەوە دەمویست بچمە ناوی؟ خۆزگا نەچوومایە..."

ئێدی بە دەنگێکی نزمتر پرسیی، " باشە بۆ نەمردم و ببرێتەوە؟"

کاپتنەکە وەڵامی دایەوە، "لە تەنگانەدا کەس بەتەنیا بەجێ ناهێڵم' ئەوەت لەبیرە؟ ئەوەی ئەو ڕۆژە بەسەر تۆ هات، من پێشتریش بە چاوی خۆم بینیومە. لە قۆناغێکدا ئیتر سەرباز دەگاتە حاڵەتێک، کە بڕستی لێ دەبڕێ و ئیتر توانای بەرگەگرتنی دۆخەکەی نامێنێ. هەندێک جار ئەوە لە نیوەشەودا ڕوو دەدا، سەربازێک لە چادرەکەی دێتە دەرەوە و نیوەڕووت و پێپەتی ملی ڕێ دەگرێ، وەک ئەوەی بەرێکەوە بێ بۆ ماڵەوە، وەک ئەوەی ماڵیان سێ-چوار دەقیقەیەک لەو ناوەوە دوور بێ.

"هەندێک جاریش ئەو حاڵەتە لە کاتی شەڕدا ڕوو دەدا، سەربازەکە چەکەکەی دادەنێ و بەرچاوی ڕەش دەبێ. تەواو پێی نەماوە و ئیدی ناتوانێ شەڕ بکا، لە زۆربەی جارەکانیشدا گوللەیەک دەیپێکێ و تەواو.

"ئەوەی تۆش هەر وا بوو، چەند خولەکێک پێش ئەوەی

بڕۆین و شوێنەکە بەجێ بهێڵین، لە بەردەمی ئاگرێکدا وەستای و دەتویست نەیەی لەگەڵمان، منیش نەمدەتوانی هەر وا بەئاسانی ڕێگە بدەم بەزیندوویی بسووتێی. لە دڵی خۆمدا گوتم، قاچێکە و چاک دەبێتەوە، بۆیە دواجار لەو شوێنە دەرمان کێشای و ئەوانی تریش گەیاندیانیتە تیمێکی پزیشکی."

هەناسەکانی ئێدی وەک چەکوش دەیاندا بە سینگیدا. سەری هەموو قوڕ و گەڵا بوو. تۆزێکی ویست، تا لە دواڕستەی کاپتنەکە تێگەیشت. ئێدی گوتی، "ئەوانی تر؟ مەبەستت چییە؟"

کاپتنەکە هەستایەوە و هەندێک چیلەکەوچەوێڵی لە خۆی تەکاند، ئینجا لە ئێدیی پرسی، "تۆ دوای ئەوە منت بینییەوە؟"

ئێدی کاپتنەکەی نەبینیبووەوە، چونکە هەر زوو بە فڕۆکە گەیاندبوویانە نەخۆشخانەیەکی سەربازی، دوای ئەوەش، بە هۆی برینداریییەکەیەوە لە خزمەتی سەربازی بەخشرابوو و بە فڕۆکە نێردرابووەوە بۆ ئەمەریکا. دوای چەند مانگێک، ئێدی بیستبووی کاپتنەکە کوژراوە و وا تێگەیشتبوو لە شەڕێکی دواتردا، لەگەڵ کەتیبەیەکی تر کوژراوە. دواجار نامەیەک، کە مەدالیایەکی تێدا بوو، گەیشتە ئێدی، بەڵام ئێدی نەیکردەوە و خستیە لاوە. مانگەکانی دوای جەنگ، ناخۆش و پڕ خەموخەفەت بوون. ئێدی یادەوەرییە بچووکەکانی جەنگی لەبیر کرد و گوێشی بە کۆکردنەوەیان نەدا. تەنانەت ناوونیشانی خۆشی گۆڕی.

کاپتنەکە گوتی، "هەر وەک پێم گوتی، دەرزیی دەردەکۆپان، دەرزیی زەردەتا، ئەو هەموو دەرزییەم لە خۆم دا، لەپای چی، هەر کاتی خۆمم پێ کوشتن."

کاپتنەکە، بەسەر شانی ئێدیدا، بە سەر ئاماژەی بۆ شوێنێک کرد. ئێدی ئاوڕی دایەوە، تا ئەویش سەیر بکات.

ئێدی بینیی دیمەنەکەی دوایەوە دیمەنی دەشت و دۆڵی ڕووتەن نەماوە، بەڵکوو بووە بە ئەو شەوەی تیایدا هەڵهاتن. ئەو شەوە مانگ خەرمانەی دابوو، فڕۆکەکان لە ئاسماندا دەسووڕانەوە، کووخەکان لە بڵێسەی ئاگردا دیار نەبوون. کاپتنەکە ئوتومبێلە سەربازییەکەی لێدەخوڕی، سمیتی و مۆرتۆن و ئێدییشی لەگەڵ بوو. ئێدی، سووتاو و بریندار و نیوەلەهۆشخۆچوو، لەدواوە ڕاکشابوو، مۆرتۆنیش پارچەیەک قوماشی لە ئەژنۆی دەئاڵاند. تا دەهات، بۆمبارانەکە نزیکتر دەبووەوە، بۆیە هەر تۆز نا تۆزێک ئاسمان دادەگیرسا و دەکوژایەوە، وەک ئەوەی خۆر سەرەتاتکە بکات. ئوتومبێلەکە، تا گەیشتە سەر گردێک، هەر هەڵبەزودابەزی بوو، دواجار لەوێ وەستا.

لەسەر گردەکە دەروازەیەکی لێ بوو، بە تەختە و وایەر دروست کرابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەملا و ئەولاکەی زۆر لێژ بوون، نەیاندەتوانی بەتەنیشتیدا بچنە ئەودیو.

کاپتنەکە دەمانچەیەکی هەڵگرت و دابەزییە خوارەوە، ئینجا فیشەکێکی نا بە قوفڵەکەوە و پاڵی بە دەروازەکەوە نا و کردیەوە، پاشان، بە زمانی ئاماژە، داوای لە مۆرتۆن کرد سووکانەکە بگرێت، ئینجا دوو پەنجەی بۆ چاوی خۆی برد و تێی گەیاند، کە دەچێت ڕێگەکە دەپشکنێت. ڕێگەکە بەناو نزارێکی ئێجگار چڕدا لێدرابوو. کاپتنەکە، هەر بە پێی پەتی ڕای کرد، تا ئەوەی گەیشتە پەنجا مەتر ئەولای پێچی یەکەمی ڕێگەکەوە.

ڕێگەکە سەلامەت بوو. کاپتنەکە بە دەست بانگی ئەوانی تری کرد بچن بۆ لای، بەڵام لەو ساتەدا فڕۆکەیەک لە سەرەوە دەر کەوت و کاپتنەکەش سەری هەڵبڕی، تا بزانێت سەر بە کام لایە. لە کاتێکدا کاپتنەکە سەری هەڵبڕیبوو سەیری ئاسمانەکانی دەکرد، دەنگێکی نزم لەژێر پێی ڕاستییەوە هات. دەستبەجێ مینێک تەقییەوە و وەک بورکان ئاگر لە ناخی زەوییەکەوە هاتە دەرەوە. تەقینەوەکە کاپتنەکەی بیست پێ بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و هەلاهەلای کرد. کاپتنەکە، هەر بە ئاسمانەوە، بوو بە یەک پارچە ئێسقان و سەدان کوتەگۆشتی گڕگرتووی وەک خەڵووز بچووک. هەندێک لە کوتەگۆشتەکان بەسەر زەوییە قوڕەکەدا فڕین و لەسەر دارهەنجیرەکان گیرسانەوە.

## وانەی دووەم

ئێدی چاوەکانی نووقاند و سەری بەپشتدا خست، "ئەی هاوااار! بۆ خاتری خوا! چیرۆکێکی زۆر ناخۆشە. بەڕاستی من ئەوەم نەزانیبوو. زۆر جەرگبڕە."

کاپتنەکە سەرێکی لەقاند و ڕووی وەر گێڕا. گردەکان وەک پێشوو ڕووت و زەرد بووبوونەوە، ئێسکی ئاژەڵان و عەرەبانە شکاوەکە و داروپەردووی گوندەکە، هێشتا هەر لەوێ بوون و ئاگرەکەیان دانەمرکابووەوە. ئێدی تێگەیشت کە ئەوە دوامەنزڵگەی کاپتنەکەیە، بەڵام بەبێ ئەوەی جەستەی خرابێتە تابووتەوە و بە خاک سپێردرابێت، تەنیا جەستەیەکی هەپروونبەهەپروون و زەوییەکی قوڕ.

ئێدی بە دەنگێکی نزم بە کاپتنەکەی گوت، "بەدرێژاییی ئەو ماوە درێژە لێرە چاوەڕێ بووی؟"

کاپتنەکە وەڵامی دایەوە، "کات بەو شێوەیە نییە، کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە."

ئینجا لەتەنیشت ئێدییەوە دانیشت.

"مردن!... مردن کۆتاییی هەموو شتێک نییە، ئێمەین وای دەبینین، ئەوەی لەسەر زەوی ڕوو دەدا، تەنیا سەرەتایە."

لەوە دەچوو ئێدی هیچ تێنەگەیشتبێت.

کاپتنەکە بەردەوام بوو، "وا هەست دەکەم هەر وەک ئەوە بێ، کە لە ئینجیلدا هاتووە، مەبەستم چیرۆکەکەی ئادەم و حەوایە. بۆ نموونە، شەوی یەکەمی ئادەم لەسەر زەوی، کە یەکەم جار، کاتێک ویستوویەتی بخەوێ، پێی وا بووە ئیتر هەموو شتێک تەواو، وایە؟ نەیزانیوە خەو چییە. چاوەکانی داخستووە و وای زانیوە ئیتر ئەم دونیایە بەجێ دەهێڵێ، ڕاستە؟

"بەڵام وا نەبووە، بۆ سبەی بەیانی خەبەری بۆتەوە و بووە بە خاوەنی دونیایەکی تازە، بەڵام لە هەمان کاتدا بووە بە خاوەنی شتێکی تریش: دوێنێ."

کاپتنەکە زەردەخەنەیەکی گەورەی کرد، "سەرباز! بە بڕوای من، ئەوەی ئێمە لە بەهەشت بەدەستی دەهێنین، ئەوەیە کە لە دوێنێکانمان تێدەگەین."

کاپتنەکە پاکەتەجگەرەکەی دەر هێنا و بە پەنجە پێیدا کێشا، تا دانەیەک بێتە دەرەوە.

"تێدەگەی، ها؟ من قەت باش نەبووم لەوەدا، کە شت جوان لە خەڵک بگەیەنم."

ئێدی لە نزیکەوە لە کاپتنەکە ورد بووەوە. هەمیشە وای زانیبوو کاپتنەکە بەتەمەنترە لەوەی ئێستا دەیبینی، بەڵام ئێستا کە خۆڵەمێشی خەڵوزەکە لە دەموچاوی بووبووەوە، ئێدی چرچە وردەکانی سەر پێستی و قژە ڕەشە پڕەکەی دەبینی. ڕەنگە هەر لە سییەکانی تەمەنیدا بووبێت.

ئێدی گوتی، "تۆ لەو کاتەوەی مردووی، لێرەی، بەڵام ئەو ماوەیە دوو ئەوەندەی ئەو تەمەنەیە، کە لەسەر زەوی ژیاوی."

کاپتنەکە سەری لەقاند.

"ئاخر چاوەڕێی تۆم دەکرد."
ئێدی سەری داخست.
"پیاوە شینەکەش هەر وای گوت."
"ڕاست دەکا. ئەویش چاوەڕێی کردووی. ئەویش بەشێک بووە لە ژیانت، بەشێک بووە لە هۆکاری ژیانی تۆ و چۆنێتیی تێپەڕینی ژیانیشت، بەشێک بووە لەو چیرۆکەی پێویست بوو بیبیستی. بەڵام دواجار چیرۆکەکەی بۆ گێڕایتەوە و ئێستا لە شوێنێکی زۆر دوورە، منیش بە هەمان شێوە، بەم زووانە دەڕۆم. لەبەر ئەوە، گوێ بگرە، چونکە ئەمە ئەو شتەیە، کە دەبێ لە منەوە فێری ببی."
ئێدی خۆی ڕێک کردەوە.

کاپتنەکە گوتی، "تۆ قوربانییەکت دا، منیش قوربانییەکم دا، هەمووومان سەروقوربانیمان دا، بەڵام تۆ بە قوربانیدانەکەی خۆت تووڕە بووی و هەر بیرت لەو شتە دەکردەوە، کە لەدەستت دابوو.

"تێنەدەگەیشتی کە قوربانیدان بەشێکە لە ژیان و هەر دەشبێ وا بێ. قوربانیدان شتێک نییە بۆی پەشیمان بی، بەڵکوو دەبێ هیوات بداتێ و بەرەو پێشت بەرێ. مەبەستم هەموو قوربانیدانێکە، گەورە و بچووک. بۆ نموونە، دایکێک ئیش دەکا بۆ ئەوەی کوڕەکەی بتوانێ بخوێنێ، یان کچێک ماڵ دەگوازێتەوە و دەچێتەوە بۆ لای باوکە نەخۆشەکەی، بۆ ئەوەی ئاگای لێی بێ... یان پیاوێک دەچێت بۆ شەڕ..."
کاپتنەکە بۆ ساتێک لە قسە وەستا و لە ئاسمانە ڕەساسییە پڕهەورەکەی ڕوانی.

"تۆ دەزانی ڕابۆزۆ بەخۆڕایی نەمرد. لەپێناوی نیشتمانەکەیدا مرد، خێزانەکەشی ئەوەیان باش دەزانی، بە جۆرێک، برابچووکەکەی لە ڕابۆزۆوە زۆر شت فێر بوو، تا ئەوەی ئەویش بوو بە سەربازێکی باش و پیاوێکی مەرد.

"من خۆشم لەپای هیچ نەمردم. ئەگەر من دانەبەزیمانە، ڕەنگە ئەو شەوە هەموومان بەسەر ئەو مینەدا لێمان بخوڕیایە و هەرچوارمان تێدا بچووینایە."

ئێدی سەرێکی با دا و بە دەنگێکی نزم گوتی، "بەڵام تۆ..." ئینجا سەری داخست و گوتی، "ژیانی خۆتت لەدەست دا."

کاپتنەکە زمانێکی لە ددانەکانی سەرەوەی دا.

"ئێ خۆی شتەکە ئەوەیە. هەندێک جار، کاتێک شتێکی بەنرخ دەکەیتە قوربانی، لە ڕاستیدا لەدەستی نادەی، بەڵکوو دەیبەخشی بە کەسێکی تر."

کاپتنەکە ڕۆیشت بۆ لای خوودە و چەک و زنجیر و ملوانکەکەی و گۆڕە غەریبەکەی خۆی، کە هێشتا هەر لەسەر زەوییەکە، بەپڕنەکراوەیی مابووەوە. خوودە و زنجیر و ملوانکەکەی خستە ژێر قۆڵێکی، ئینجا چەکەکەی لە قوڕەکە دەر هێنا و وەک ڕم هەڵی دا. چەکەکە، بەبێ ئەوەی بکەوێتەوە خوارەوە، بەرەو ئاسمان فڕی و لە چاو ون بوو.

کاپتنەکە ڕووی کردەوە بەمدیودا، "زۆر باشە، من بووم تەقەم لە تۆ کرد و تۆش شتێکت لەدەست دا، بەڵام شتێکیشت دەست کەوت. بەڵام جارێ نازانی چییە. منیش شتێکم دەست کەوت."

"چی؟"

"بەڵێنەکەی خۆمم بردە سەر و بەتەنیا بەجێم نەهێشتی."
کاپتنەکە دەستەکانی بەرز کردەوە.
"لێم خۆش دەبی لەسەر ئەوەی قاچم وا لێ کردی؟"
ئێدی بۆ چەند ساتێک بیری کردەوە، بیری لە ئازاری برینداریيەکەی کردەوە، لەو توورەیییەی بە هۆی لەدەستچوونی قاچیەوە بۆی دروست بوو، ئینجا بیری لەوە کردەوە، کە کاپتنەکە لەدەستی چووبوو، بەمە، ئێدی شەرم دای گرت، بۆیە دەستی بۆ کاپتنەکە درێژ کرد و کاپتنەکەش بەتوندی دەستی ئێدیی گوشی.
"ئەمە ئەوە بوو، کە چاوەڕێی بووم."
لە چاوترووکانێکدا، لقەکانی دارمێوەکە و دارهەنجیرەکە لە دارە گەورەکە داماڵران و چوونەوە ناو زەوییەکە. هەر لەو ساتەشدا دووبارە لقی تازە و جوان سەریان دەر هێنا و بڵاو بوونەوە، هەمووشیان گەڵای نەرمیان دەر کرد و هەنجیری تازەیان گرت. کاپتنەکە، زۆر بەسادەیی، تەنیا سەیرێکی سەرەوەی کرد، وەک ئەوەی زانیبێتی ئەو شتە ڕوو دەدات، ئینجا، تەنیا بە لەپی دەستەکانی ئەو تۆزە خۆڵەمێشەشی سڕی، کە تا ئەو کاتە بە دەموچاویەوە مابووەوە.
ئێدی گوتی، "کاپتن؟"
"بەڵێ."
"پیاوە شینەکە پێی گوتم لێرە دەتوانی لە هەرکوێیەک بتەوێ، لەوێ چاوەڕێ بکەی، تۆ بۆ ئێرەت هەڵبژارد؟"
کاپتنەکە زەردەخەنەیەکی کرد، "لەبەر ئەوەی من لە شەڕدا مردم، لەناو ئەم دۆڵ و گردانەدا کوژرام، دونیام بەجێ هێشت، بەبێ ئەوەی تیایدا لە شەڕ زیاتر، هیچم ناسیبێ؛

زمانی جەنگ، پلانەکانی جەنگ، هاوڕێیانی جەنگ، هەموو ئەمانەم زانی و ناسی.

"هەموو خۆزگەی من ئەوە بوو، بە چاوی خۆم ببینم دونیا بەبێ جەنگ چۆنە، دونیا چۆن بوو پێش ئەوەی دەست بکەین بە کوشتنی یەکتر."

ئێدی سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد، "بەڵام خۆ ئەمەش هەر جەنگە."

کاپتنەکە گوتی، "لای تۆ جەنگە. چاوەکانی من وا ناڵێن. ئەوەی تۆ دەیبینی، ئەوە نییە کە من دەیبینم."

کاپتنەکە دەستێکی بەرز کردەوە و شوێنە ئاگراوییەکە گۆڕا. خاشاک و داروپەردووەکان توانەوە، درەختەکان گەشەیان کرد و پەلیان هاویشت، زەوییەکە لە قوڕەوە بوو بە گیا و گوڵ و گوڵزار، هەورە ڕەشەکان وەک پەردە لا دران و ئاسمانێکی ساماڵ لەپشتیانەوە دەر کەوت، تەمێکی سپیی کاڵ سەری دارەکانی گرت، خۆریش بە خۆی و ڕەنگە قۆخییەکەیەوە لە ئاسۆدا دەسووتا و تیشکەکانی لەسەر ئەو زەریایە دەدرەوشانەوە، کە دەوری دوورگەکەی دابوو. جوانیی دیمەنەکە، جوانییەکی پاک و سروشتی و نەشێوێنراو بوو.

ئێدی سەری بەرز کردەوە و سەیری فەرماندە کۆنەکەی خۆی کرد، کە دەموچاوی پاک و جوان و جلوبەرگەکانیشی ڕێکوپێک بوون.

کاپتنەکە بەدەم دەستڕاکێشانەوە بۆ دیمەنەکان گوتی، "ئەمە ئەوەیە، کە من دەیبینم."

ئینجا بۆ ساتێک وەستا، تا زیاتر چێژ لە دیمەنەکان وەر بگرێت.

"با پێشت بڵێم، من لێرە جگەرە ناکێشم. ئەوەش تەنیا چاوەکانی تۆ بوون وایان دەبینی."

کاپتنەکە بەپێکەنینەوە بەردەوام بوو، "خۆ شێت نەبووم لە بەهەشتدا جگەرە بکێشم؟"

ئینجا وردەوردە کەوتە ڕۆیشتن.

ئێدی هاوارێکی لێ بەرز بووەوە، "بوەستە! شتێک هەیە دەبێ بیزانم: مردنەکەی خۆم لە شاری یارییەکە. ئەو کچە بچووکەم ڕزگار کرد یان نا؟ هەستم بە دەستەکانی کرد، بەڵام بیرم نییە..."

کاپتنەکە ئاوڕی دایەوە و ئێدی بیری کەوتەوە، کە مردنی کاپتنەکە چەندە دڵتەزێن و ناخۆش بووە، بۆیە وشەکانی قووت دانەوە و ڕووی نەهات پرسیار بکات. هەر ئەوەندە لەژێر لێوەوە گوتی، "تەنیا دەمەوێ بزانم ڕزگارم کردووە یا نا، هەر ئەوەندە."

کاپتنەکە پشتگوێی خوراند و بەبەزەییییەوە سەیرێکی ئێدیی کرد، "سەرباز! ناتوانم پێت بڵێم."

ئێدی بەخەمباری سەری داخست.

"بەڵام یەکێک هەیە دەتوانێ."

کاپتنەکە خوودە و زنجیر و ملوانکەکەی بۆ ئێدی هەڵدا، "ئەوانە هیی تۆن."

ئێدی سەیرێکی بەرپێی خۆی کرد. لە خوودەکەدا وێنەی چرچبووی ژنێکی تێدا بوو، کە هەمان ئازارە کۆنەکەی خستەوە ناو دڵی ئێدی. کاتێک ئێدی سەری هەڵبڕییەوە، کاپتنەکە لەو ناوە نەمابوو.

## دووشەممە، ٧:٣٠ی بەیانی

ڕۆژی دوای ڕووداوەکە، دۆمینگێز، بەبێ ئەوەی وەک بەیانییەکانی تر لە ڕێگە چۆرەک و شەربەت بۆ نانی بەیانی بکڕێت، زوو هات وەرشەکەی کردەوە. شاری یارییەکە داخرابوو، بەڵام ئەو، هەرچۆنێک بوو، هاتە ژوورەوە. چوو بۆ وەرشەکە و بەلووعەی سەر سینگەکەی کردەوە، پاشان دەستەکانی خستە بەر ئاوەکە و نیازی وا بوو هەندێک پارچەی یارییەکان بشوات، بەڵام ڕای گۆڕی و بەلووعەکەی گرتەوە. وەرشەکە، دوو ئەوەندەی پێشوو خامۆش بووەوە.

"چۆنی؟"

ویلی لەناو دەرگای وەرشەکەدا ڕاوەستابوو. کاوبۆیەکی فش و تیشێرتێکی سەوزی لەبەردا بوو، ڕۆژنامەیەکیشی بە دەستەوە بوو، کە لە پەڕەی یەکەمیدا بەگەورەیی نووسرابوو، *کارەساتێکی دڵتەزێن لە شارێکی یاری ڕوو دەدات.*

دۆمینگێز گوتی، "بڕوا بکە، یەک دەقیقە نەخەوتووم."

ویلی خۆی بۆ سەر کورسییەکی خولاوەی ئاسن بەرز کردەوە، "دەزانم... منیش."

ویلی، بەدەم سەیرکردنی ڕۆژنامەکەی دەستیەوە، نیوەخولانەوەیەک کورسییەکەی خولاندەوە، "بە ڕای تۆ، کەی

دەیکەنــەوە؟"

دۆمینگێز وەڵامی دایەوە، "پۆلیس دەزانێ."

ویلــی و دۆمینگێــز بــۆ ماوەیــەک بەجووتــە بەبێدەنگــی دانیشــتن، جارجــار - وەک ئــەوەی بەنــۆرە بێــت - بــەدوای یەکــدا شــێوەی دانیشــتنەکەیان دەگــۆڕی. دۆمینگێــز ئاهێکــی هەڵکێشــا. ویلی دەســتی کرد بە گیرفانی کراســەکەیدا و ویســتی بنێشــتەکەی دەر بهێنێت. بەیانیی دووشــەممە بــوو. هەردووکیان چاوەڕێی پیاوە پیرەکەیان دەکرد بێت و پێکەوە دەست بکەن بــە ئیشــەکانی ئــەو ڕۆژەیــان.

# سێیەم کەس، کە ئێدی لە بەهەشت دەیبینێت

گێژەڵووکەیەک ئێدیی بەرز کردەوە و هەر وەک کاتژمێرێکی گیرفان، کە بە کۆتاییی زنجیرێکەوە کرابێت، لوولی دا، ئینجا دووکەڵێکی چڕ دەوری گرت و لە هەورێکی ڕەنگاوڕەنگی هەڵکێشا. ئاسمانەکە ئێدیی ڕادەکێشا و لە خۆی نزیک دەکردەوە، تا ئەوەی ئێدی هەستی کرد ئاسمانەکە وەک بەتانییەکی قەدکراو بەر پێستی دەکەوێت. لەناکاو ئاسمان لا درا و یەکپارچە بوو بە سەوزی قەزوانی، ئینجا ملیۆنان ئەستێرە لەسەری دەر کەوتن و وەک خوێ بەسەر پانتاییە سەوزە فراوانەکەدا پرژان.

ئێدی چاوەکانی هەڵگلۆفی. ئێستا کەوتبووە نێوان کۆمەڵێک شاخەوە، بەڵام شاخی زۆر جوان و سەرنجڕاکێش، کە هەتا چاو بڕ بکات، درێژ بووبوونەوە و لووتکەکانیشیان کڵاوێک بەفریان لەسەر کردبوو. بەردی شاخەکان تیژ و بەرزونزم بوون، سەرەولێژەکانیشیان هەموو لە ڕەنگی مۆر هەڵکێشرابوون. دەریاچەیەکی گەورەی ڕەش کەوتبووە نێوان لووتکەی دوو شاخەوە و تیشکدانەوەی مانگ لەسەر ئاوەکەی دەدرەوشایەوە.

ئێدی تێبینیی کرد لەسەر یەکێک لە شاخەکان

ڕووناکییەکی ڕەنگاوڕەنگ دەسووتێت و تۆزناتۆزێک ڕەنگی دەگۆڕێت. بەرەو ڕووی ڕووناکییەکە هەنگاوی نا و لەگەڵ یەکەم هەنگاویدا، بینیی تا قولەپێی لە بەفردایە. ئێدی قاچی بەرز کردەوە و توند ڕای وەشاند، کلووەبەفرەکان کەوتن و لە کەوتنەخوارەوەیاندا ڕووناکیی سەر شاخەکە ڕەنگێکی ئاڵتوونیی تێدا دروست کردن. ئێدی دەستی لە کلووەبەفرەکان دا و تێگەیشت کلووەکان نە تەڕن و نە ساردیشن.

لە دڵی خۆیدا پرسیی، "باشە دەبێ لەکوێ بم؟"

ئێدی جارێکی تر جوان سەیری جەستەی خۆی کردەوە و دەستی لە شانەکانی و لە سینگی و سکی دا. هێشتا ماسولکەکانی قۆڵی ڕەق بوون، بەڵام ناوقەدی شل و گۆشتن بوو. دوودڵی دای گرت و بەتوندی ئەژنۆی چەپی خۆی گوشی. ئەژنۆی برووسکەی کرد و دەموچاوی لە ئازاردا گرژ بوو. پێشتر ئێدی دڵی خۆی بەوە خۆش کردبوو، کە لەگەڵ بەجێهێشتنی کاپتنەکەدا، ئازارەکەشی نامێنێت، بەڵام بەو هەموو ئازار و برین و چەوری و ورگەی ئێستایەوە، خەریک بوو بەتەواوی دەبووەوە بە پیاوەکەی سەر زەوی. باشە بڵێیت بۆچی لە بەهەشتدا دووبارە پیربوون و تێکچوونی جەستەی خۆت ئەزموون بکەیتەوە؟

ئێدی بەرەو ڕووناکیی سەر شاخەکە هەنگاوی نا. لاپاڵی شاخەکە هێمن و ڕووتەن بوو، زۆر جوانیش دەینواند، هەر وەک ئەوەی ئێدی لە خەیاڵەکانیدا، لەسەر بەهەشت بینیبووی. بۆ ساتێک ئێدی بیری لەوە کردەوە، کە تۆ بڵێی کاپتنەکە هەڵەی نەکردبێت و لە ڕاستیدا کەسی تر نەمابێت ئێدی ببینێت. ئێدی بەناو بەفرەکەدا بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن،

بەتەنیشت تاشەبەردێکدا تێپەڕی و بۆشاییەکی بینی، کە ڕوناکییەکەی لێوە دەهاتە دەر. دووبارە چاوی هەڵگلۆفییەوە، بەڵام ئەم جارەیان بەحەپەساوییەوە.

لەوێ، لەناو بەفرەکەدا، باڵاخانەیەکی بینی، کە لە شێوەی فارگۆنێکی شەمەندەفەردا دروست کرابوو. ڕووکاری دەرەوەی بیناکە، ستیلێکی جوان و بێگەرد بوو، سەربانەکەشی قرمیتی سوور بوو. لەسەر بەشی پێشەوەی لەوحەیەک دانرابوو، کە دادەگیرسا و دەکوژایەوە، لەسەریشی نووسرابوو، "وەرە لێرە نان بخۆ!"

شوێنەکە چێشتخانە بوو.

ئێدی چەندین کاتژمێری لە شوێنی لەو شێوەیەدا بەسەر بردبوو. ئەو شوێنانە هەموو لەیەک دەچوون، پڕ بوون لە کورسیی پشتبەرز و مێزی پاک و بریقەدار، بەشی پێشەوەشیان هەمووی پەنجەرەی بچووک بوو – بە شێوەیەک کاتێک لە دەرەوە سەیری ناوەوەت دەکرد، ئەوانەی لە ژوورە دانیشتبوون وەک ئەوە دەهاتنە بەرچاو، کە لە شەمەندەفەێکی مۆدێلکۆندا دانیشتبن. ئێستا ئیتر ئێدی دەیتوانی خەڵکەکەی ناوەوە - کە قسەیان دەکرد و دەجووڵانەوە - ببینێت. بە هەنگاوی بەفراوییەوە بەرەو دەرگای سەرەکیی باڵاخانەکە، کە دەرگایەکی دووتاکی بوو، ڕۆیشت. لەوێدا وەستا و سەیرێکی ناوەوەی کرد.

لە ژوورەوە، لای دەستەڕاست، ژن و مێردێکی بەساڵاچوو دانیشتبوون و خەریک بوون شیرینییان دەخوارد. هیچ سەیری ئێدییان نەکرد. شوێنەکە خەڵکی تریشی لێ بوو، هەندێک لە بەردەم بارە مەڕمەڕەکەدا، لەسەر کورسیی

خولاوە دانیشتبوون، هەندێکی تر لەسەر کورسییەکانی ناوەوە بڵاو بووبوونەوە و قەمسەڵەکانیان بەو عەللاگانەوە هەڵواسیبوو، کە بە دیوارەکانەوە داکوترابوون. خەڵکەکە، بە شێوە و ڕووخسارياندا وا دەر دەکەوت، خەڵکی سەردەمی جیاجیا بن، بۆ نموونە، ئێدی چاوی چووە سەر ژنێک، کە عەزییەکی ئێخەگەورەی مۆدێلی سالانی ١٩٣٠یەکانی لەبەردا بوو، پیاوێکی تری بینی، کە قژێکی درێژی بەر دابووەوە و تاتۆیەکی *نیشانەی ئاشتی* لەسەر شێوازی سالانی ١٩٦٠ەکان لەسەر قۆلی دروست کردبوو. وا دیار بوو زۆربەی ئەوانەی لە ژوورەوە بوون، پێشتر بریندار بووبووبن. پیاوێکی ڕەشپێست، کە بە کراسی ئیشەوە هاتبوو، قۆڵێکی نەمابوو، کچێکی هەرزەکار یەک برینی کراوەی گەورە لەسەر دەموچاوی بوو. ئێدی یەک-دوو جار لە شووشەی سەر دەرگاکەی دا، بەلام کەس لای لێ نەکردەوە. دواتر چەند چێشتلێنەرێکی بینی، کە کلاوی سپییان لەسەردا بوو، ئینجا چاوی چووە سەر هەندێک قاپ، کە خۆراکەکەی سەریان هەڵمی لێ هەڵدەستا و چاوەڕێی ئەوە بوون بخرێنە بەردەم میوانەکان. خۆراکەکان ڕەنگاوڕەنگ بوون، ساسی جەرگی، کەرەی زەرد... لەو ساتەدا چاوەکانی ئێدی چوونە سەر دوا مێزی ناو چێشتخانەکە، کە لە سووچی دەستەڕاستدا دانرابوو. ئێدی لە جێی خۆی وشک بوو.

ئەوەی ئێدی لەوێدا بینی، جێی باوەڕپێکردن نەبوو!

ئێدی گوێی لە خۆی بوو بەچرپە گوتی، "نااااا! شتی وا نابێ!" ئینجا ڕووی وەر گێڕا و چەند هەناسەیەکی قووڵی

هەڵکێشا. دڵی زۆر خێرا لێی دەدا. ئەم جارە ڕووی کردەوە بەودیودا و دووبارە سەیرێکی سووچەکەی کردەوە. ئینجا بەقاییمی کێشای بە پەنجەرەکەدا.

"نااا! نابێتی!" ئێدی ئەوەندە بەقایمی دەیکێشا بە پەنجەرەکەدا، دڵنیا بوو ئەوەندە نابات شووشەکە دەشکێت. بەردەوام وشەی "نااا!"ی دووبارە دەکردەوە، تا دواجار وشەیەکی تر، کە دەیان ساڵ بوو لە دەمی نەهاتبووە دەرەوە، لە قورگیدا دروست بووەوە. ئێدی بەهاوارەوە ئەو وشەیەی دەگوت و دەگوتەوە، بە شێوەیەک، کە وشەکە ئەوەندە بەبەرزی لە قورگیەوە دەهاتە دەرەوە، کەللەی سەری دەزرینگایەوە، بەڵام ئەو کەسەی لە سووچەکەدا دانیشتبوو، ئاگای لە ئێدی و دەوروبەرەکەی نەبوو، خۆی بەسەر مێزەکەدا نووشتاندبووەوە، دەستێکی خستبووە سەر مێزەکە و بە دەستەکەی تری جگەرەیەکی گرتبوو. هەرچەندە ئێدی بە هەموو هێزی خۆی یەکلەسەر یەک هاواری دەکرد و دەیگوت، "باوکەەەە! باوکەەەە! باوکەەە،" بەڵام باوکی ئێدی گوێی لە هیچ نەبوو!

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

لــە ڕاڕەوە تاریــك و خاوێنەکــەی *نەخۆشــخانەی ســەربازە دێرینەکانــــ*ــدا، دایکــی ئێــدی پاکەتــە ســپییەکە هەڵدەپچڕێــت، مۆمــەکان لەســەر کێکەکــە ڕێــك دەخاتــەوە و بەیەکســانی دابەشیان دەکات: دوانــزە لەمبــەر و دوانــزە لەوبــەر. ئەوانــی تــر - باوکــی ئێــدی و جــۆ و مارگرێــت و میکــی شــی - بــەدەوری دایکــی ئێدیــدا وەســتاون و ســەیری دەکــەن.

دایکی ئێدی دەڵێت، "کەس شقارتەی پێیە؟"

هەمــوو دەســت بــە گیرفانەکانیانــدا دەکــەن. میکــی پاکەتێــك شــقارتە لــە گیرفانــی چاکەتەکەیــدا دەر دەهێنێــت و دوو جگــەرەی شلوشــێواوی لــێ بــەر دەبێتــەوە بــۆ ســەر زەوییەکــە. دایکــی ئێــدی مۆمــەکان دادەگیرســێنێت. بەرزکەرەوەیــەك لــە بەردەمیانــدا دێتــە خــوارەوە و دەوەســتێت. قەرەوێڵەیەکــی نەخۆشگواســتنەوە لــە بەرزکەرەوەکــەوە دێتــە دەرەوە.

دایکی ئێدی دەڵێت، "با بڕۆین."

هەمــوو بــەرەو نــاو بەرزکەرەوەکــە دەجووڵێــن و لەگــەڵ هەنگاوەکانیانــدا، گــڕی بچووکــی مۆمــەکان دەکەونــە ســەما. هەمــوو بەگۆرانیگوتنــەوە خۆیــان دەکــەن بــە ژوورەکــەی ئێدیــدا، "هەمــوو ســاڵێ بەخۆشــیبیی، هەمــوووو ســاڵێ بــەخ..."

ئـەو سـەربازەی لەسـەر قەرەوێڵەکـەی تەنیشـت ئێـدی پـاڵ کەوتـووە، ڕاسـت دەبێتـەوە و هـاوار دەکات، "ئـەرێ ئـەوە چییـەەەە؟" بـەڵام هـەر زوو بیـری دەکەوێتـەوە شـوێنەکە کوێیە، بۆیـە بەشـەرمەوە خـۆی دەداتـەوە بـە جێگەکەیـدا. گۆرانییەکـە لـە ناوەڕاسـتدا پچڕێنـدراوە و ئێسـتا زۆر ئەسـتەمە دووبـارە گـرێ بدرێتـەوە، بۆیـە هەمـوو بێدەنـگ دەبـن، تەنیـا دایکـی ئێدییـە، کـە بـەردەوام دەبێـت و دەنگـی لـە تەنیاییـی خۆیـدا دەکەوێتـە لەرزیـن.

"هەموو... ساڵێ... بەخۆشی... ئێدی گیاااان."

ئینجـا هـەر دایکـی لەسـەر ئاوازێکـی خێراتـر دەڵێـت، "هەمـوو سـاڵێ بەخۆشـی!"

ئێـدی پـاڵ بەسـەرینەکەیەوە دەدات. سـووتاوییەکانی بـە لەفـاف پێچـراون و قاچیشـی لـە سـەرەوە تـا خـوارەوە، لـە گـەچ گیـراوە. دوو دارشـەق لەتەنیشـت جێگەکەیـەوە دانـراون. ئێـدی سـەیری دەموچـاوەکان دەکات و حـەزی ئـەوەی تێـدا دروسـت دەبێـت، هەسـتێت و ڕابـکات!

جۆ قوڕگی پاك دەکاتەوە و دەڵێت، "نا! نا! زۆر باشی!"

خێـرا ئەوانـی تریـش هاوڕابوونـی خۆیـان لەگـەڵ جـۆ دەر دەبـڕن.

"وایە."

"ڕاستە."

"کوڕە هەر زۆریش باشە."

مارگریت بەچپە دەڵێت، "دایکت کێکی بۆ هێناوی!"

دایکـی ئێـدی، وەك ئـەوەی ئێسـتا ئیتـر سـەرەی هاتبێـت، دێتـە پێشـەوە. پاکەتەکـە دەخاتـە بـەردەم ئێـدی.

ئێدی بە دەنگێکی نزم دەڵێت، "سوپاس، دایە گیان."
دایکی ئێدی چاوێك بە ژوورەکەدا دەگێڕێت، "لەکوێ دایبنێین؟"
میکی کورسییەك نزیك دەکاتەوە، جۆ خێرا سەرمێزێکی بچووکی ژوورەکە چۆڵ دەکات، مارگرێت دارشەقەکانی ئێدی دەگوێزێتەوە، تەنیا باوکی ئێدییە، کە پشتی داوە بە دیوارەکەوە و لەجێی خۆی جووڵە ناکات، چاکەتێکیشی بەسەر دەستیدا داوە و هەر لە قاچی ئێدی - کە لە قولەپێیەوە تا بنی ڕانی لە گەچدایە - ورد دەبێتەوە.
ئێدی چاوی دەچێتە سەر چاوی باوکی. باوکی خێرا چاو لا دەبات و سەیری بەرپێی خۆی دەکات، ئینجا دەست بەسەر تاقی پەنجەرەکەدا دەگێڕێت. ئێدی گشت ماسوولکەکانی جەستەی گرژ دەکات و بە هەموو هێزی خۆی هەوڵ دەدات پاڵ بە فرمێسکەکانیەوە بنێتەوە بۆ دواوە.

هەموو دایک و باوکێک، بە شێوەیەک لە شێوەکان، زیان لە منداڵی خۆیان دەدەن. ئەوە قسەی تێدا نییە. تەمەنی لاوی، کە وەک پارچەشووشەیەکی بێگەرد وایە، بەڕوونی جێدەستی ئەوانەی لەسەر دەر دەکەوێت، کە هەڵی دەگرن. هەندێک دایک و باوک، شووشەکە تەواو پیس دەکەن، هەندێکی تر درزی تێ دەکەن، هەندێکیش وردوخاشی دەکەن، بە شێوەیەک، کە هەرگیز چاک نەکرێتەوە.

ئەو زیانانەی باوکی ئێدی لە کوڕەکەی خۆی دان، لە سەرەتاوە بە فەرامۆشکردن دەستیان پێ کرد. ئێدی، کاتێک ساوا بوو، باوکی بەدەگمەن دەیکردە باوەش، کاتێکیش گەورەتر بوو، زۆربەی کات هەر قۆڵی دەگرت - قۆڵگرتنەکەشی زیاتر بێزاریی پێوە دیار بوو، نەک خۆشەویستی. لەبەر ئەوە، ئەو کەسەی نەرمونیانی و خۆشەویستیی بە ئێدی بەخشی، دایکی بوو، نەک باوکی، باوکی تەنیا فێری دەکرد چۆن هەستێ و دانیشێ.

شەممان، باوکی ئێدی، ئێدیی دەبرد بۆ شاری یارییەکە. ئێدییش، بە خەیاڵی یاریی بابەخولێی ئەسپەکە و کڕینی پەشمەک، لەگەڵ باوکی لە شوقەکەیان دەهاتە دەرەوە، بەڵام پاش سەعاتێک کەمتر یان زیاتر، باوکی ئێدی ناسیاوێکی دەبینی و پێی دەگوت، "بێزەحمەت چاوێکت لەم منداڵە

بێ بۆم." بەم شێوەیە ئێدیی داماو تا ئەو کاتەی باوکی عەسرێکی درەنگ – زۆربەی جاریش بەسەرخۆشی – دەگەڕایەوە، لەژێر چاودێریی نمایشکارێک یان ڕاهێنەرێکی ئاژەڵاندا دەمایەوە.

لەسەروو ئەمانەشەوە، بەدرێژاییی ئەو هەزاران کاتژمێرەی سەردەمی لاویی خۆی، کە بە دانیشتن لەسەر محەجەرەی ڕێگە دارینەکە، یان دانیشتن بە شۆرتەکەیەوە لەسەر سندوقەکانی ناو وەرشەکەوە بەسەری بردبوون، ئێدی بەردەوام چاوەڕێی ئەوە بووبوو باوکی کەمێک گرنگیی پێ بدات. بۆیە زووزوو بە باوکی دەگوت، "بابە، با یارمەتیت بدەم... بابە، با من ئەو ئیشەیانت بۆ بکەم،" بەڵام تاکە ئیش کە ئێدی دەیکرد، ئەوە بوو بەیانییان، پێش ئەوەی شاری یارییەکە بکرێتەوە، بەسینگەخشکێ بچێتە ژێر چەرخ و فەلەکەکەوە و ئەو پارە وردانەی کۆ بکاتەوە، کە شەوی پێشوو لە گیرفانی ئەو کەسانەی سوار یارییەکە بووبوون، کەوتبوونە خوارەوە.

باوکی ئێدی، هەفتانە بە لایەنی کەمەوە چوار شەو قوماری دەکرد. مێزەکەیان پارە و بتڵ و جگەرە و یاسای لەسەر بوو. یاساکەی ئێدی زۆر ئاسان بوو، "بێزارمان مەکە." جارێکیان، ئێدی هەوڵی دا لەتەنیشت باوکیەوە بوەستێت و سەیری کارتەکانی بکات، بەڵام باوکە پیرەکەی جگەرەکەی دانا و وەک فیشەکەشێتە هەڵچوو، ئینجا بە پشتەدەستی دانەیەکی بە دەمی ئێدیدا کێشا و گوتی، "ئەرێ دە ئەوەندە هەناسەت مەکە بەسەرمدا!" ئێدی دەستی کرد بە گریان، دایکی نووساندی بە ناوقەدیەوە و بەمۆڕەوە سەیرێکی

مێردەکەی کرد. لەوە بەدوا، جارێکی تر ئێدی ئەوەندە لە باوکی نزیک نەبووەوە.

شەوانی تر، کاتێک باوکی ئێدی لە یارییەکەدا بۆی نەدەهات و بتڵەکانی خاڵی دەبوونەوە، توورەبییەکەی خۆی دەبردە ژوورەکەی جۆ و ئێدی. لەو کاتانەشدا کە دایکی ئێدی دەمێک بوو خەوی لێ کەوتبوو، مێردەکەی یارییە کەم و سادەکانی جۆ و ئێدیی هەڵدەگرت و دەیکێشان بە دیوارەکەدا، ئینجا بەزۆر کوڕەکانی لەسەر جێگەکەی خۆیان دەخستە سەر دەم و بە قاییشەکەی دەکەوتە لێدانیان، هەر بەدەم لێدانیشیانەوە هاواری دەکرد، کە گوایە منداڵەکانی پارەکەی ئەویان لە شتی پڕوپووچدا بەفیڕۆ داوە. هەموو جارێک ئێدی لە خوا دەپاڕایەوە کە دایکی خەبەر بکاتەوە، بەڵام ئەو جارانەشی کە دایکی ئێدی بەڕاستی خەبەری دەبووەوە، باوکی لێی توورە دەبوو و دەیگوت، "تۆ هەقت نەبێ!" بۆیە دایکیشی، بە هەمان شێوەی ئێدی، بەبێدەسەڵاتی لە ڕاڕەوەکەدا دەوەستا و ڕۆبەکەی لە خۆی توند دەکرد. بینینی ئەو دیمەنەی دایکی، ئەوەندەی تر دۆخەکەی لە ئێدی قورس دەکرد.

ئەو دەستانەی دواتر کەوتنە سەر شووشەی سەردەمی لاویی ئێدی ڕەق و قڵیشاو بوون و پڕ بوون لە توورەیی، لەبەر ئەوە ئێدی ئەو قۆناغەی ژیانی بە لێدان و تێسرەواندن و پێداکێشان بەڕێ کرد. دوای *فەرامۆشکردن*، دووەم زیان کە بە ئێدی گەیشت، *توندوتیژی* بوو. وای لێ هات کاتێک باوکی ئێدی بە ڕاڕەوەکەدا، بەرەو ژوورەکەی ئێدی و جۆ دەهات، ئێدی، هەر بە دەنگی تەپەی پێیەکانی باوکیدا دەیزانی

چ جۆرە لێدانێک دەخوات.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هێشتا ئێدی هەر باوکی زۆر خۆش دەویست، لەبەر ئەوەی کوڕان بەگشتی، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە خراپترین مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، هێشتا هەر باوکیان زۆر خۆش دەوێت. لە ئەمەشەوە فێری دڵسۆزی دەبن. کوڕ پێش ئەوەی دڵسۆزیی خۆی بۆ خودا، یان کچێک نیشان بدات، دڵسۆزی و سەرڕاستیی خۆی بۆ باوکی نیشان دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەو دڵسۆزی و سەرڕاستییە نەزانانە و بێبنەماش بێت.

جارجار، باوکی ئێدی، وەک ئەوەی ئاگرێکی نیوەکوژاوە بگەشێنێتەوە، ترووسکاییەک شانازیی بە کوڕەکەیەوە دەکرد. لە یاریگەی بەسیبۆڵەکەدا، کە لە تەنیشت قوتابخانەکەی سەر شەقامی ژمارە ١٤ بوو، لەپشت پەرژینەکەوە دەوەستا و تەماشای کوڕەکەی دەکرد. ئەگەر ئێدی بە یەک لێدان تۆپەکەی بخستایەتە دەرەوەی یاریگەکە، باوکی سەرێکی دەلەقاند، بەوەش ئێدی لە خۆشییاندا خێرا بەدەوری هەموو بنکەکاندا دەخولایەوە. جارانی تریش، کاتێک ئێدی لە کۆڵان شەڕی دەکرد و دەهاتەوە بۆ ماڵەوە، باوکی سەرنجی برینی سەر ڕەقاییی پەنجەکانی، یان لێوە تەقیوەکەی دەدا و دەیپرسی، "چیت لێ کرد؟" ئێدییش دەیگوت، "بەدڵی تۆ کوتام." باوکی ئێدی ئەمەشی بەدڵ بوو. کاتێک ئێدی لەو منداڵانەی دا کە شەڕیان بە جنێوی برای فرۆشتبوو، دایکی ئێدی خێرا هەردوو کوڕەکەی بانگ کردەوە ژوورەوە. جۆ شەرمی دەکرد و چووە ژوورەکەی و خۆی دەشاردەوە،

بەڵام باوکی ئێدی، بە ئێدیی گوت، "گوێی مەدەرێ، تۆ بەھێزتری، بۆیە تۆ ئاگات لە براکەت بێ و نەھێڵی کەس پەنجەی بۆ بەرێ."

کاتێک ئێدی گەیشتە قۆناغی بنەڕەتی، ھاوینان ھەمان خشتەی کارکردنی ڕۆژانەی باوکی پەیڕەو دەکرد. پێش ئەوەی خۆر بکەوێت، لە خەو ھەڵدەستا و تا ئەو کاتەی شەو دادەھات کاری دەکرد. سەرەتا یارییە سادە و ئاسانەکانی بەڕێوە دەبرد، ئیستۆپەکانیانی تایم دەدا بۆ ئەوەی لەسەرخۆ بوەستنەوە. ساڵانی دواتر، چووە وەرشەکە. سەرەتا باوکی تاقیی دەکردەوە و فێری دەکرد چۆن پارچەی یارییەکان چاک بکاتەوە. باوکی سووکانێکی شکاوی دەدایە دەست و دەیگوت، "چاکی بکەرەوە!" دەستی بۆ زنجیرێکی لێکئاڵۆزکاو ڕادەکێشا و دەیگوت، "چاکی بکەرەوە!" چەمەلەغێکی ژەنگاوی و پارچەیەک سمارتەی دەخستە بەردەمی و دەیگوت، "چاکی بکەرەوە!" ھەموو جارێکیش ئێدی، دوای ئەوەی ئیشەکەی دەکرد، شتەکەی دەبردەوە بۆ باوکی و دەیگوت، "عەیبی نەما، باوکە."

شەوان، ئەندامانی خێزانەکە بۆ نانی ئێوارە یەکیان دەگرت. دایکی ئێدی، کە قەڵەو بووبوو، لەسەر تەباخەکە چێشتی لێدەنا و ئارەقەی دەر دەدا، جۆی براشی، لەژێر خۆیەوە ھەر قسەی دەکرد و پێست و قژی بۆنی ئاوی دەریایان لێ دەھات. جۆ مەلەوانێکی زۆر باشی لێ دەر چووبوو، کاری ھاوینانیشی لە مەلەوانگەکەی شاری یاریی ڕووبی بوو. جۆ باسی ھەموو ئەو کەسانەی دەکرد، کە لەوێ دەیبینین، باسی جلی مەلەکانیان، باسی پارەکەیان... باوکی ئەمەی

بەدڵ نەبوو. جاریکیان ئیدی گوێی لێ بوو باوکی باسی جۆی بۆ دایکی دەکرد و دەیگوت، "ئەو هەتیوەیان ئەوەندە نەرمە، بۆ ئاو نەبێ، بۆ هیچ تر باش نییە."

سەرەڕای ئەمەش، ئیدی هێشتا ئیرەییی بە براکەی دەبرد، کە ئێواران زۆر پاکوخاوێن و بە پێستێکی جوانەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. نینۆکەکانی ئیدی، وەک ئەوانەی باوکی، پڕ بووبوون لە گریس، ئیدییش لەسەر نانی ئێوارە، بە نینۆکی پەنجەگەورەی ژێرەکەیانی پاک دەکردەوە. جاریکیان تێبینیی کرد باوکی سەیری دەکات و بزەی بۆ دەکات.

باوکی ئیدی نینۆکە پیسەکانی خۆی بەرز کردەوە و بە کوڕەکەی گوت، "وا دیارە ئەمڕۆ ئیشی چاکت کردووە." وای گوت و پەنجەکانی لە قەدی پەرداخێک بیرە ئاڵاند. ئیدی، کە بووبوو بە هەرزەکاریکی کەتە و چوارشانە، تەنیا سەرێکی بۆ باوکی لەقاند. لەو کاتەوە، ئیدی، بەبێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات، وازی لەوە هێنابوو بە وشە یان بە بەرکەوتن خۆشەویستی خۆی بۆ باوکی دەر ببڕێت، بۆیە بەتەواوی فێری بەکارهێنانی زمانی جەستە بووبوو لەگەڵ باوکیدا. هەموو شتەکان لە ناوەوە دەکران و دەگوتران و دەبووایە خۆت تێیان بگەیت. بەم شێوەیە، ئیدی زیانی سێیەمی بەسەرکەوتوویی پێ گەیەندرا: *زیانی دەرنەبڕینی خۆشەویستی.*

شەوێکیان، وای لێ هات باوک و کوڕ بەتەواوی قسەیان نەما. ئەمە دوای سالانی جەنگ بوو. ئیدی لە نەخۆشخانە دەر چووبوو، گەچ و لەفافەکان لە قاچی کرابوونەوە و هاتبووەوە

بۆ شووقەکەیان لە گەڕەکی بیچ ود و لەگەڵ خێزانەکەی سەرلەنوێ دەستی بە ژیان کردبووەوەوە. باوکیشی، کە لە یەکێک لە بارەکانی ئەو نزیکانە خەریکی خواردنەوە بووبوو، هاتبووەوە ماڵەوە و سەیری کردبوو ئێدی لەسەر قەنەفەکە خەوی لێ کەوتووە. تاریکیی جەنگ ئێدیی گۆڕیبوو، بە شێوەیەک، ئێدی زۆر کەم دەچووە دەرەوە، بەدەگمەن قسەی دەکرد، تەنانەت لەگەڵ مارگریتیش. جاری وا هەبوو بە سەعات لە بەردەم پەنجەرەی مەتبەخەکە ڕادەوەستا و سەیری دەرەوەی دەکرد، لەوێوە بۆ خۆی لە یاریی بابەخولێی ئەسپەکە ڕادەما و دەستی بە ئەژنۆ زامدارەکەیدا دەهێنا. دایکی هەموو جارێک بەچرپە دەیگوت، کە ئێدی "پێویستی بە کاتی زیاترە،" بەڵام باوکی، تا دەهات، بەو هەڵسوکەوتانەی ئێدی بێزارتر دەبوو. باوکی ئێدی لە خەمۆکیی کوڕەکەی تێنەدەگەیشت. لای ئەو خەمۆکی، لاوازی بوو.

بۆیە ئەو شەوە هاواری بەسەر ئێدیدا کرد و ئەم وشانە بەخێراییی لە دەمی هاتنە دەرەوە، "هەستە بڕۆ ئیشێک بدۆزەرەوە."

ئێدی کەمێک جووڵا. باوکی دووبارە هاواری کردەوە، "دەڵێم هەستە... بڕۆ...ئیشێک بدۆزەرەوە."

پیاوە پیرەکە بەملاولادا دەکەوت، بەڵام هەرچۆنێک بێت، بەرەو ڕووی ئێدی هات و پاڵێکی پێوە نا.

"گوتم هەستە بڕۆ ئیشێک بدۆزەرەوە، هەستە بڕۆ ئیشێک بدۆزەرەوە، هەستە... بڕۆ... ئیشێێک بدۆزەرەوە."

ئێدی، بە ئانیشکەکانی، خۆی بەرز کردەوە.

"هەستە بڕۆ ئیشێک بدۆزەرەوە، هەستە... بڕ...."

ئێدی بەخێرایی هەستایە سەر پێ و ئەژنۆی زریکاندی، بەڵام هیچ گوێی پێ نەدا. دەموچاوی ئەوەندە لە دەموچاوی باوکی نزیک بووەوە، کە بەئاسانی بۆنی جگەرە و هەناسە پڕکحولەکەی باوکی هات بەسەریدا، ئینجا هاواری بەسەر باوکیدا کرد، "بەسەەەەەە!"

پیاوە پیرەکە سەیرێکی قاچی ئێدیی کرد و بە دەنگێکی نزمتر، کە پڕ بوو لە ڕق، گوتی، "ئەوەتا... عەیبی... نییە."

باوکی ئێدی گوڕمی خواردەوە بۆکسێک لە ئێدی بدات، بەڵام ئێدی دەستبەجێ خۆی ڕاوەشاند و قۆڵی باوکی لە نیوەی ڕێدا گرت. چاوەکانی پیاوە پیرەکە زەق بوون. ئەمە یەکەم جار بوو ئێدی بەرگری لە خۆی بکات، یەکەم جار بوو شتێک بکات، جگە لە ڕاوەستان بۆ لێدان - وەک ئەوەی لێدان شایانی بێت و بۆی برابێتەوە. باوکی سەیرێکی مشتە نووقاوەکەی خۆی کرد، کونەلووتەکانی فش بوون و ددانەکانی لەسەر یەک جیڕەیان هات، ئینجا خۆی بۆ دواوە ڕاوەشاند و قۆڵی خۆی لە ئێدی وەر گرتەوە. باوکی ئێدی، بە چاوی پیاوێک کە سەیری شەمەندەفەرێک بکات لە کاتی بەڕێکەوتندا، سەیری چاوەکانی کوڕەکەی کرد.

ئیتر لەوە بەدوا، قسەی لەگەڵ ئێدی نەکردەوە.

ئەمە دوا جێدەست بوو، کە لەسەر شووشەی لاویی ئێدی دەر چووەوە، دوازیان بوو، کە بە ئێدی گەیشت: *زیانی بێدەنگی*، بێدەنگییەک، کە بەدرێژاییی ئەو ژیانەی لەگەڵ باوکی مابوویان درێژەی کێشا. کاتێک ئێدی ماڵی جیا کردەوە و چووە شوقەکەیەکی تر، باوکی بێدەنگ بوو، ئەو کاتەی ئێدی گوتی دەبم بە شۆفێری تاکسی، باوکی هەر

بێدەنگ بوو، لە زەماوەندەکەی ئێدیدا، هەر بێدەنگ بوو، کە ئێدی دەهاتەوە بۆ سەردانی دایکی، هەر بێدەنگ بوو. دایکی چەندین جار بەگریانەوە لە مێردەکەی دەپاڕایەوە و داوای لێ دەکرد لەگەڵ کوڕەکەی ئاشت ببێتەوە، بەڵام هەموو جارێک باوکی ئێدی بەحاڵ دەمی هەڵدەهێنایەوە و لە یەک ڕستەدا ئەو وەڵامەی بە ژنەکەی دەدا، کە دەیدا بە هەرکەسێکی تر کە ئەو داوایەی لێ بکردایە: "ئەو کوڕە دەستی لێ بەرز کردمەوە!" ئیتر ئەو ڕستەیە دەبوو بە کۆتاییی هەموو گفتوگۆکە.

هەموو دایک و باوکێک، بە شێوەیەک لە شێوەکان، زیان لە منداڵەکانیان دەدەن. ئەمە ژیانی ئێدی و باوکی بوو پێکەوە: *فەرامۆشکردن، توندوتیژی، بێدەنگی.* ئێستاش لە شوێنێک لەودیوی مردنەوە، ئێدی پاڵی دابوو بە دیوارێکی ستیلی بێگەردەوە و لەناو بەفردا دانیشتبوو، دیسانیش فەرامۆشکردنی پیاوێک، وەک مار گەستبووی، پیاوێک، کە هێشتاش ئێدی خەوی بە خۆشەویستییەکەیەوە دەبینی، پیاوێک، کە بەتەواوی ئێدیی فەرامۆش کردبوو، تەنانەت لە بەهەشتیش. بەم شێوەیە ئێدی هەموو زیانەکانی بەسەرکەوتوویی پێ گەیشت.

دەنگی ژنێک هات، "خۆت سەغڵەت مەکە. گوێی لێت نییە."

ئێدی سەری هەڵبڕی. لەناو بەفرەکەدا، ژنێکی پیر لە بەردەمیدا وەستابوو. ژنەکە دەموچاوی قووپاو و ڕوومەتەکانی داکەوتبوون، سووراوێکی پەمەییی کردبوو و قژە سپییەکەشی، کە لەدواوە بەتوندی بەستبووی، لە هەندێک

شـوێندا ئەوەنـدە تەنـک بووبـووەوە، کـە پێسـتە پەمەیییەکـەی کەللەسـەری جـوان دیـار بـوو، چـاوە شـینە بچووکەکانیشـی کەوتبوونـە ئەودیـو چاویلکەیەکـی چوارچێوەباریکـەوە.

ئێـدی نەیدەزانـی ئـەو ژنـە کێیـە، جلوبەرگەکانـی هیـی سـەردەمی ئێـدی نەبـوون. ژنەکـە عەزییەکـی لەبـەردا بـوو، کـە لـە ئاوریشـم و قوماشـی شـیفۆن دروابـوو، ئێخەکەشـی، کـە وەک بەروانکـە وا بـوو، بـە مـووروروی سـپی بـە عەزییەکـەوە درووابـوو، سـەری ئێخەکـەش، ڕێـک لەخـوار ملیـەوە، قردێلەیەکـی سـەوزی قەیفـەی پێـوە کرابـوو. بەشـی خـوارەوەی عەزییەکـە پشـتێنێکی لەسـەر بـوو، کـە نقێمێکـی زڕگـۆن لەسـەر ناوەڕاسـتەکەی بـوو، لەولاشـەوە، چەندیـن تـەرەقـەی پێـوە بـوو. ژنەکـە زۆر بەڕێکوپێکـی وەسـتابوو، چەترێکـی ژنانـەی ناسـکی بـە هـەردوو دەسـتی گرتبـوو. ئێدی وای بۆ چـوو، کاتـی خـۆی دەوڵەمەنـد بووبێـت.

ژنەکـە، وەک ئـەوەی گوێـی لـە ئێدی بووبێـت، بـە لایەکـی دەمی، نیوەزەردەخەنەیەکی کرد و گوتی، "لە ڕاستیدا، هەمیشـە ئاوا دەوڵەمەند نەبووم، منیش وەک تۆ، لە دەوروبـەری شـار گـەورە بـووم، لـە تەمەنـی چواردەسـاڵیدا، بەناچـاری وازم لـە خوێنـدن هێنـا و دەسـتم کـرد بـە ئیش. خوشکەکانیشـم بە هەمان شـێوە، چیشـمان دەسـت کـەوت، دەمانـدا بـە خێزانەکەمـان..."

ئێـدی نەیدەویسـت گوێـی لـە چیرۆکێکـی تـر ببێـت، لەبـەر ئـەوە قسـەکەی بـە ژنەکـە بـڕی و پرسـیاری لـێ کـرد، "ئێسـتا پێـم بڵـێ بۆچـی باوکـم گوێـی لێـم نییـە؟"

ژنەکـە زەردەخەنەیەکـی کـرد، "لەبـەر ئـەوەی، سـەلامەتی و ئاسـوودەیی ڕووحـی باوکـت بەشـێکە لە بەهەشـتی هەتاهەتاییی

مـن. ئـەو ئێستا بەڕاسـتی لێرە نییە، ئـەوە تـۆی، کـە بەڕاسـتی لێرەی."

"باشـە بۆچـی سـەلامەتی و ئاسـوودەیی ڕووحـی باوکـی مـن بەشـێک بـێ لـە بەهەشـتی هەتاهەتاییـی تـۆ؟"

ژنەکە بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، ئینجا گوتی، "دوام بکەوە!"

ئێدی و ژنەکە لـە چاوترووکانێکدا گەیشـتنە بنـاری چیاکە. ئـەو ڕووناکییـەی لـە چێشـتخانەکەوە دەهـات، تـرووسـکاییەکی کەمـی لـێ مابـووەوە، وەک ئـەوەی ئەسـتێرەیەک بووبێت و بـەر بووبێتـە نـاو چاڵێکـی قووڵـەوە.

ژنـە بەتەمەنەکـە گوتـی، "جوانـە، وا نییـە؟" ئێـدی سـەیرێکی چاوەکانـی ژنەکـەی کـرد، شـتێکی سـەیریان تێدا بوو، دەتگوت ئێدی لـە شـوێنێک وێنـەی ئـەم ژنـەی بینیوە و بیـری نایاتـەوە.

"تۆ... سێیەم کەسی منی؟"

ژنەکە وەڵامی دایەوە، "ئێستا پێت دەڵێم."

ئێـدی دەسـتێکی بـە قژیـدا هێنـا و لـە دڵـی خۆیـدا گوتـی، "باشـە دەبێ ئەم ژنە کێ بێ؟" بە لایەنـی کەمەوە ئێدی لەگەڵ پیـاوە شـینەکە و لەگـەڵ کاپتنەکـەش، هەندێـک شـت و شـوێنی بیر کەوتبووەوە، کە لـە ژیانیدا لەگـەڵ ئـەو دووانـە ئەزموونـی کردبـوون، بـەڵام ئـەم نەناسـیاوە بـۆ؟ ئـەی بـۆ لـەم کاتـەدا؟ ئێدی ڕۆژێک لە ڕۆژان هیـوای خواسـتبوو مـردن شـادبوونەوە بێـت بـەو کەسـانەی پێـش خـۆی کۆچیـان کردبـوو، ئـەو بـە قـات و قۆنـدەرەی ڕەش و کڵاوێکـەوە بـۆ چەندیـن مەراسـیمی بەخاکسـپاردن چووبـوو، هەمـوو جارێکیـش لـە گۆڕسـتانەکەدا هەمـان پرسـیار لـە مێشـکیدا دروسـت بووبـوو، "بۆچـی ئـەو

هەموو ئازیزانەم دەڕۆن و من هێشتا هەر لێرەم؟" دایکی، براکەی، پووری و خاڵەکانی، نۆلی هاوڕێی، مارگریت... لە هەموو بەخاکسپاردنەکانیشدا، قەشەکە گوتبووی، "ڕۆژێک دێ هەموومان لە ئاسمانەکان بەیەک شاد دەبینەوە."

ئەی کە وایە، ئێستا ئەو ئازیزانە لەکوێ بوون؟

ئێدی دووبارە بەوردی تەماشای ژنە پیرەکەی کردەوە و لە هەموو کاتێک زیاتر هەستی بە تەنیایی کرد.

بەچرپە گوتی، "دەتوانم زەوی ببینم؟"

ژنەکە هەر بە سەربادان بە *نەخێر* وەڵامی دایەوە.

"ئەی دەتوانم قسە لەگەڵ خوا بکەم؟"

"هەموو کاتێ دەتوانی ئەوەیان بکەی."

ئێدی، پێش ئەوەی پرسیاری دواتر بکات، کەمێک شڵەژا.

"ئەی دەتوانم بگەڕێمەوە؟"

ژنەکە چاوەکانی کز کرد، "بگەڕێیتەوە؟"

ئێدی دووبارەی کردەوە، "بەڵێ، بگەڕێمەوە. بگەڕێمەوە بۆ ژیانی خۆم، بۆ ئەو ڕۆژەی تێیدا مردم... هیچ هەیە بتوانم بیکەم؟ دەتوانم بگەڕێمەوە و بەڵێن بدەم کەسێکی باش بم؟ هەمیشە بچم بۆ کڵێسا؟ شتی وا دەکرێ؟"

وا دیار بوو ژنەکە کەیفی بە بابەتەکە بێت، بۆیە گوتی، "بۆچی؟"

ئێدی وشەکەی دووبارە کردەوە، "بۆچی؟" ئینجا دەستێکی لە بەفرەکە دا، کە نە سارد بوو، نە تەڕ بوو، پاشان وەڵامی دایەوە، "لەبەر ئەوەی ئەم شوێنە زۆر بێمانایە و سەر لە هیچی دەر ناکەم، تەنانەت مردنەکەی خۆشمم بیر نایاتەوە. ڕووداوەکەم بیر نییە. تاکە شتێک کە بیرمە ئەو دوو دەستە

بچووکانەی ئەو کچەن، کە ویستم ڕزگاری بکەم، تێدەگەی؟ ویستم پاڵی پێوە بنێم و لەسەر ڕێگەکە لای بەرم، دەستم بەر دەستی کەوت، بەس ئیتر لەو کاتەدا..."

ئێدی شانێکی هەڵتەکاند.

ژنە بەتەمەنەکە بەزەردەخەنەوە گوتی، "مردی؟ کۆچی دواییت کرد؟ بەرز بوویتەوە؟ گەیشتیت بە دروستکەرەکەی خۆت؟ وا نییە؟"

ئێدی بەهەناسەهەڵکێشانەوە وتی، "بەڵێ، لەو کاتەدا مردم. هەر ئەوەندەشم بیرە، دوای ئەوەش کە هاتم، تۆ و ئەوانی ترم بینی. باشە ئەی نابێ کە مردی، بگەیتە ئارامی و ئاسوودەیی؟"

ژنە بەتەمەنەکە گوتی، "ئەو کاتە دەگەیتە ئارامی و ئاسوودەیی، کە هەر خۆت بڕیار بدەی لەگەڵ خۆتدا ئارام و ئاسوودە ببی."

ئێدی بەسەربادانەوە گوتی، "نا، وا نییە." ئێدی لەو کاتەدا بیری لەوە کردەوە باسی هەموو دڵەڕاوکێکانی سەردەمی جەنگ و خەوە ناخۆشەکانی و دڵخۆشنەبوونەکانی بۆ ژنە بەتەمەنەکە بکات، باسی ئەو کاتانەی بۆ بکات، کە دەچوو بۆ سەر کەنارەکە و دەیبینی چۆن ماسیگرەکان ماسییەکانیان بە تۆڕە سپییەکانەوە دەهێنایە دەرەوە، ئەویش بەشەرمەوە لەوێدا دەوەستا و خۆی وەکوو ئەو ماسییە داماوانە دەهاتە بەرچاو، کە بە داوەکەوە بووبوون و هەرچەندە هەڵدەبەزینەوە، نەیاندەتوانی دەربازیان ببێت.

بەڵام ئێدی هیچکام لەو شتانەی بۆ ژنەکە باس نەکرد، لەجیاتیی ئەوە گوتی، "خانم، نابێ پێت ناخۆش بێ، من تۆ

هەر ناناسم."

ژنەکە گوتی، "بەڵام من تۆ دەناسم."

ئێدی ئاهێکی هەڵکێشا، "بەڕاست؟ چۆن؟"

ژنەکە وەڵامی دایەوە، "ئەگەر پەلە نەکەی، پێت دەڵێم."

هیچی لێ نەبوو ژنەکە لەسەری دابنیشێت، بۆیە زۆر بەسادەیی هەر لەسەر هەواکە دانیشت و زۆر خانومانانە قاچی خستەسەر قاچ و پشتی ڕێک کردەوە. عەزییە درێژەکەی زۆر بەڕێکوپێکی بەملاو بەولایدا هاتە خوارەوە. شەماڵێک هات و بۆنە خۆشەکەی بۆ ئێدی هێنا.

"وەک پێشتر گوتم، منیش سەردەمانێک کرێکار بووم. لە خواردەمەنی و خواردنەوەیەکدا، کە ناوی *برژاوی ئەسپی دەریا* بوو، شاگرد بووم و خۆراکم بۆ میوانەکان دادەنا. شوێنەکە نزیک بوو لەو کەناردەریایەی تۆی لێ گەورە بووبووی. ڕەنگە ئەو شوێنەت بیر مابێ، ها؟"

ژنەکە بە ئاڕاستەی چێشتخانەکە سەری لەقاند و ئێدی هەموو شتەکانی بیر کەوتەوە. ئەوە ئەو شوێنە بوو، کە ئێدی نانی بەیانیی لێ دەخوارد، ئەوان خۆیان شوێنەکەیان ناو نابوو *شوێنە چەورەکە*. چەندین ساڵ بوو ئەو شوێنە ڕووخێندرابوو.

ئێدی، بە کەمێک پێکەنینەوە، پرسیی، "تۆ لە *ئەسپی دەریا* شاگرد بووی؟"

ژنەکە بەشانازییەوە گوتی، "بەڵێ! قاوەم بۆ کرێکارەکانی بارکردن و داگرتنی بارەکانی سەر کەنارەکە دادەنا و نان و گۆشتی بەرازم بۆ دەبردن.

"بە دەمی خۆم نەبێ، ئەو ساڵانە، کچێکی زۆر جوان

بووم. چەندین داواکارم هاتن و هەموویانم ڕەت کردەوە، خوشکەکانم سەرزەنشتیان دەکردم و دەیانگوت، 'تۆ خۆت بەچی دەزانی وا بەئارەزووی خۆت خەڵک ڕەت دەکەیەوە و هەڵدەبژێری، تا درەنگ نەبووە، پیاوێک بدۆزەرەوە و تەواو.'

"بەیانییەکیان، کوڕێکی زۆر قۆز و کەشخە هاتە چێشتخانەکە. قاتێکی خەتخەتی لەبەردا بوو، کڵاوێکی کەشخەشی لەسەردا بوو. قژە ڕەشەکەی زۆر جوان چاک کرابوو، زەردەخەنەیەکیش بەردەوام لەژێر سمێڵیەوە بوو. کاتێک خۆراکەکەیم بۆ دانا، سەرێکی بۆ لەقاندم. منیش هەوڵم دا سەیری نەکەم، بەڵام کاتێک لەگەڵ هاوڕێکەی قسەی دەکرد، گوێم لە پێکەنینە بەرزەکەی بوو، کە پڕبوو لە بڕوابەخۆبوون. دوو جار چاوم چووە سەری و بینیم سەیرم دەکات. کاتێک تەواو بوون و هات پارەکەی دا، پێی گوتم کە ناوی ئێمیلە و گوتیشی ئەگەر ئاسایی بێ بەلامەوە، حەز دەکا دووبارە بێتەوە بۆ لام. هەر ئەو کاتە تێگەیشتم، ئیتر پێویست ناکا خوشکەکانم جارێکی تر زۆرم لێ بکەن تا بڕیاری شووکردن بدەم.

"ئێمیل زۆر دەوڵەمەند بوو، لەبەر ئەوە پەیوەندییەکەمان زۆر خۆش بوو. بۆ شوێنی وای دەبردم، بە هەموو تەمەنم نەمبینیبوو، جلی وای بۆ دەکڕیم، بە خەویش لەبەرم نەکردبوو، خۆراکی وای بۆ دەکڕیم، کە بەدرێژای ژیانە سادەکەم تامم نەکردبوو. ئێمیل لە ماوەیەکی کەمدا و بە بازرگانیی تەختە و ستیل دەوڵەمەند بووبوو. بەدڵی خۆی پارەی خەرج دەکرد و سەرکێشیی دەکرد، هەرکاتێکیش بیرۆکەیەکی تازەی بۆ دەهات، یەکسەر دەستی دەدایە و تا

کۆتایی لەگەڵی دەڕۆیشت. وا بزانم هەر ئەوەش بوو کە دڵی بە کچێکی هەژاری وەک مندا چوو. زۆر ڕقی لەو کەسانە بوو، کە بەدەوڵەمەندی لەدایک بووبوون، بۆیە زیاتر کەیفی بەو شتانە دەهات، کە هەرگیز *دەوڵەمەندە بۆزلێدەرەکان* نەیاندەکردن.

"یەکێک لەو شتانەش سەردانکردنی شوێنە گەشتیارییەکانی سەر کەناردەریا بوو. ئێمیل زۆر حەزی لە یارییەکان بوو، لە خۆراکە سوێرەکان، لە قەرەج و دەستگرەوەکان، لەوانەی بەگۆترە کێشی خۆتیان پێ دەگوتی، لەو کچانەی بە سەردا خۆیان هەڵدەدایە ئاوەکەوە. من و ئێمیل، هەردووکمان حەزمان لە دەریا بوو. ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا لەسەر لمەکە دانیشتبووین و شەپۆلەکان بەهێمنی تا لای قاچمان دەهاتن، داوای هاوسەرگیریی لێ کردم.

"ئەوەم زۆر زۆر پێ خۆش بوو، بۆیە هەر لەوێدا ڕازی بووم. لەو کاتەدا دەنگی هەراوهوریای ئەو منداڵانە دەهات، کە لە زەریاکەدا یارییان دەکرد. ئێمیل دووبارە زیادەڕۆییی کرد و هەر لەوێدا سوێندی خوارد شارێکی یاری بەتەنیا بۆ من دروست بکات، بۆ ئەوەی خۆشیی ئەو ساتەمان هەمیشە تازە و زیندوو بمێنێتەوە."

ژنە بەتەمەنەکە زەردەخەنەیەکی کرد و بەردەوام بوو، "ئێمیل بەڵێنەکەی خۆی بردە سەر. دوای یەک-دوو ساڵ، بۆندێکی لەگەڵ کۆمپانیایەکی هێڵی شەمەندەفەر مۆر کرد. ئەو هێڵە شەمەندەفەرە خۆی بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا، بۆ ئەوەی ژمارەی گەشتیارانی کۆتاییی هەفتەی زیاد بکات. ئیتر خۆشت دەزانی زۆربەی شارە یارییەکان هەر ئاوا دروست کراون."

ئێدی سەری لەقاند، چونکە خۆشی – بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵکییەوە – ئەوەی دەزانی. زۆر کەس وایان دەزانی شارە یارییەکان لەلایەن جنۆکەوە، بەو نوقڵ و شیرینییانەی لە شێوەی گۆچانی سوروسپیدان، دروست کراون. لە ڕاستیدا، ئەو شاری یارییانە دەرفەتێکی باش بوون بۆ کۆمپانیاکانی هێڵی شەمەندەفەر تا قازانج بکەن، هەر بۆیە شارە یارییەکانیان لە کۆتاییی هێڵە ئاسنینەکەدا دروست دەکرد و بەم شێوەیەش لە کۆتاییی هەفتەدا خەڵکێکی زۆر ناچار دەبوون سواری شەمەندەفەر ببن و بڕۆن بۆ شاری یارییەکە. هەموو جارێک ئێدی بە خەڵکی دەگوت، "دەزانی لەکوێ ئیش دەکەم؟... دواوێستگەی هێڵەکە دەزانی؟... لە ئەوێ!"

ژنە بەتەمەنەکە بەردەوام بوو لە قسەکردن، "ئێمیل سەرنجڕاکێشترین شوێنی بنیات نا، بەو ستیل و تەختەیەی هەیبوو، شارێکی یاریی زۆر گەورەی دروست کرد. دواتریش پڕی کرد لە یاریی نایاب، پێشبڕکێی خۆش خۆش، گەشتی بەلەم، شەمەندەفەری بچووک... بابەخولێیەکی لە فەرەنساوە بۆ هێنا، چەرخوفەلەکێکی لە یەکێک لە پێشانگە نێودەوڵەتییەکانی ئەڵمانیا بۆ کڕی. لە شاری یارییەکەدا چەندین تاوەری بەرز و منارە و هەزاران گڵۆپی دانا، تا ئەوەی شوێنەکە بە شەو ئەوەندە ڕووناک بوو، لەناو زەریاکەوە و لەسەر کەشتییەکانەوە دەتبینی.

"ئێمیل هەزاران کرێکار و کرێکاری شارەوانی و کرێکاری بیانی و شارەزای بواری ڕێکخستنی کەرنەڤاڵی بەکرێ گرت. چەندین ئاژەڵ و نمایشکار و قەرەقۆزی بۆ شاری یارییەکە

هێنا. دواشوێن کە تەواو بوو، دەروازەکەی بوو، کە بەڕاستی زۆر گەورە و تایبەت بوو. هەموو خەڵک پێیان جوان بوو. کاتێک دەروازەکە تەواو بوو، ئێمیل چاوی بەستمەوە و بردمی بۆ شوێنەکە. دواجار چاوی کردمەوە و دەروازەکەم بینی."

ژنە بەتەمەنەکە هەنگاوێک لە ئێدی چووە دواوە و بەسەیری لێی ڕوانی، وەک ئەوەی ئێدی نائومێدی کردبێت، ئینجا گوتی، "دەروازەکە؟ بیرت نایەت؟ قەت بیرت لە ناوەکەی نەکردۆتەوە؟ مەبەستم ناوی ئەو شوێنەیە، کە خۆت کارت لێ دەکرد، کە باوکت کاری لێ دەکرد؟"

ژنەکە، پەنجەکانی، کە لە دەستکێشی سپیدا بوون، بەنەرمی خستە سەر سینگی و لەسەرخۆ، وەک ئەوەی زۆر بە شێوازێکی ڕەسمییانە خۆی بناسێنێت، کەمێک چەمایەوە و گوتی، "ئێ من ڕووبیم!"

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

ئێـدی سیوسـێ سـاڵە. لەنـاکاو بەهەناسـەبڕکێوە خەبـەری دەبێتـەوە. قـژە ڕەشـە پڕەکـەی سـەر ئارەقـە گـەڕاوە. لـە تاریکییەکـەدا، خێراخێـرا چـاوی دەترووکێنێـت و زۆر لـە خـۆی دەکات تـا هەمـوو ئاگاییـی خـۆی بخاتـە سـەر قۆڵـی و دەسـت و پەنجەکانـی، لە ڕاستیدا سـەر هەرشـتێك، کـە بۆی بسـەلمێنێت ئێسـتا ئیتـر لـە شـوقەکەی خۆیدایەتـی و لـە بەرەکانـی جەنـگ نەمـاوە، لـە ماڵـی خۆیەتـی و لەنـاو کووخەکـە دارینەکـە یـان ئاگرەکـەدا نییـە.

تۆ بڵێیت هەرگیز ئەو خەونە بەرۆکی بەر بدات؟

دەوروبـەری کاتژمێـر چـوارە. ئەوەنـدەی شـەو نەمـاوە تـا بخەوێتـەوە، بۆیـە چـاوەڕێ دەکات تـا هەناسـەدانی هێـور دەبێتـەوە، ئینجـا، زۆر بەهێواشـی - بـۆ ئـەوەی ژنەکـەی خەبـەری نەبێتـەوە - لەسـەر جێگەکـەی دادەبەزێـت. فێـر بـووە یەکـەم جـار قاچـی ڕاسـتی دابنێـت و نەهێڵێـت قاچـی چەپـی گـرژ ببێـت و ئـازاری پـێ بـگات. ئێـدی هەمـوو بەیانییـەك بـەم شـێوەیە ڕۆژ دەکاتـەوە، یـەك هەنـگاو بەڕێکوپێکـی و یـەك هەنـگاو بـە شەلەشـەل.

لـە بـەردەم مێـزی تەوالێتەکـەدا سـەیرێکی چـاوە

خوێنتێزاوەکانی دەکات و شڵپێك ئاو بە دەموچاویدا دەدات. هەمیشە هەمان خەون دەبینێت و دەبینێتەوە، لە خەونەکەدا لە فلیپینە، دواشەویەتی لە جەنگ و بەناو پشکۆی سوورەوەبوودا دێت و دەچێت. کووخەکانی ناو گوندەکە لە بڵێسەدا دیار نین، بەبەردەوامییش زیقەیەکی بەرز دێت. شتێکی نەبینراو لە قاچەکانی ئێدی دەدات، ئێدی بەخێرایی دەست دەبات بیگرێت، بەڵام بۆی ناگیرێت، جارێکی تریش هەوڵ دەداتەوە، بەڵام هیچ شتێکی بە دەستەوە نایات. بڵێسەکان چڕتر دەبن و وەك مەکینەیەکی گەورە دەنەڕێنن، لەو کاتەدا سمیتی دەر دەکەوێت و هاوار لە ئێدی دەکات، "دەی وەرە با بڕۆین! خێرا وەرەەەە!" ئێدی هەوڵ دەدات شتێك بڵێت، بەڵام کاتێك دەمی دەکاتەوە، زیقە بەرزەکە لە قوڕگی خۆی دێتە دەرەوە. لەو ساتەدا، شتێك قاچی دەگرێت و بە ناو قوڕەکەدا ڕای دەکێشێت.

پاشان ئێدی خەبەری دەبێتەوە و دەبینێت ئارەقەی کردووەتەوە و هەناسەبڕکێی پێ کەوتووە. هەمیشە خەوەکە بەم شێوەیە، خراپترین بەشیشی ئەوە نییە کە خەوی لێ ناکەوێتەوە، بەڵکوو ئەو تاریکییەیە، کە خەوەکە بۆ ئێدیی دەهێنێت و وەك هەورێکی چڕ، تەواوی ڕۆژەکەی تاریك دەکات، بە شێوەیەك، کە تەنانەت ساتە خۆشەکانیشی بەناخۆشی دەور دەدرێن.

ئێدی لەسەرخۆ خۆی دەگۆڕێت و بە پلیکانەکاندا دەچێتەوە خوارەوە. تاکسییەکەی لەسەر سووچەکە ڕاگرتووە، ئەوێ شوێنی خۆیەتی. ئێدی تەمی سەر جامی پێشەوەی تاکسییەکەی دەسڕێت. هەرگیز باسی ئەو تاریکییە

بـۆ مارگرێـت نـاکات. مارگرێـت دەسـت بـە قـژی ئێدیـدا دەهێنێـت و دەڵێـت، "چـی بـووە؟" ئێـدی وەڵام دەداتـەوە و دەڵێت، "هیـچ نییـە، تـۆزێ هیلاکـم و تـەواو." ئێـدی هـەر بـەوە دەیبڕێنێتـەوە. ئاخـر چـۆن دەتوانێـت باسـی ئـەو هەمـوو خەمـە بـۆ مارگرێـت بـکات، لـە کاتێـدا هەمـوو خەونـی مارگرێـت دڵخۆشـی و ئاسـوودەیی ئێدییـە؟ لـە ڕاسـتیدا، ئێـدی ناتوانێـت ئـەو بابەتـە تەنانـەت بـۆ خۆشـی ڕوون بکاتـەوە. هەمـوو ئـەوەی دەیزانێـت، ئەوەیـە کـە شـتێك هاتـە بەردەمـی و ڕێـی لـێ گـرت، تـا ئـەوەی وازی لـە زۆر شـت پـێ هێنـا، وەك خوێندنـی ئەندازیـاری و بیرۆکـەی گـەڕان و گەشـتکردن بـە دونیـادا. شـتێك ڕووی دا و ئێدیـی ناچـار کـرد بەدیـار ژیانـی خۆیـەوە دابنیشـێت، دانیشـتنێك، کـە ئیتـر هەسـتانەوەی لـەدوا نەبـوو.

ئێـوارەی ئـەو ڕۆژە، کاتێـك ئێـدی لـە ئیـش دێتـەوە، تاکسـییەکەی لـە سـووچەکەدا ڕادەگرێتـەوە. لەسـەرخۆ بـە پلیکانەکانـدا دێتـە سـەرەوە. هـەر لەسـەر پلیکانەکانـەوە گوێـی لـە گۆرانییـەك دەبێـت، گۆرانییـەك، ئاشـنا بـە گوێیەکانـی:

تۆ وات کرد خۆشم بوێیت،
من ئەوەم نەدەویست،
من ئەوەم نەدەویست...

دەرگاکـە دەکاتـەوە و کێکێك و عەللاگەیەکی سپیی بچووك، کـە بە قردێلەیەك بەستراوە، لەسـەر مێزەکە دەبینێت.

مارگرێـت لـە ژووری خەوتنەکـەوە هـاواری لـێ دەکات، "تۆیـت، بەسـاقە؟"

ئێدی عەللاگە سپییەکە هەڵدەگرێت. ئەو نوقڵە تۆفییانەی تێدایە، کە لە شاری یارییەکە دەیانفرۆشن.

مارگرێت دەر دەکەوێت و بە دەنگە نەرم و ناسکەکەی خۆی بەگۆرانییەوە دەڵێت، "هەموو ساڵێ بەخۆشیی..."

مارگرێت زۆر جوانە. ئەو عەزییە گوڵگوڵەشی لەبەردایە، کە ئێدی حەزی لێیەتی، قژی جوان داهێناوە و سووراوی کردووە. ئێدی هەست دەکات پێویستە هەناسەیەکی قووڵ هەڵبکێشێت - وەك ئەوەی ساتێکی ئاوا، شایانی ئەو نەبێت. لەگەڵ ئەو تاریکییەی ناو ناخی دەجەنگێت و پێی دەڵێت، "برۆ وازم لێ بێنە و بهێڵە ئەو هەستەم بۆ دروست بێ، کە دەبێ بۆم دروست بێ."

مارگرێت گۆرانییەکە تەواو دەکات و ماچێکی لێوەکانی ئێدی دەکات، ئینجا بەچرپە پێی دەڵێت، "نوقڵەکان بخۆ، ئەگینا خۆم هەموویان دەخۆم؟"

ئێدی خۆی دەباتە پێش ماچی مارگرێت بکاتەوە. کەسێك بەقاییمی لە دەرگا دەدات.

"ئێدی، لە ماڵی؟... ئێدییی؟"

*کاك نەیسانسۆن* نانەوایە، کە لە نهۆمی خوارەوەی باڵاخانەکە، لە بەشی پشتەوەی دوکانەکەیدا دەژی و تەلەفۆنی هەیە. کاتێك ئێدی دەرگاکە دەکاتەوە، کاك نەیسانسۆن لەناو دەرگاکەدا، بە خۆی و ڕۆبێکی حەمامەوە، ڕەق وەستاوە و دەموچاوی باش نالێت.

کاك نەیسانسۆن دەڵێت، "ئێدی... تەلەفۆنە... وەرە خوارەوە. وا بزانم باوکت شتێکی بەسەر هاتووە."

"من ڕووبیم."

ئێدی تێگەیشت بۆچی ژنەکە نامۆ نەبوو لای. ڕۆژێک لە ڕۆژان، لە بەشی پشتەوەی وەرشەکەدا، لەنێوان کاغەز و نووسراوی تایبەت بە خاوەندارێتیی یەکەم جاری شاریی یارییەکەدا، وێنەیەکی ئەم ژنەی بینیبوو.

ئێدی گوتی، "دەروازە کۆنەکە..."

ژنەکە ڕەزامەندانە سەرێکی لەقاند. دەروازەی یەکەم جاری شاری یاریی ڕووبی ئەوەندە گەورە بوو، لە بنی دونیاوە دەبینرا، لەسەر شێوازی بیناسازیی پەرستگەیەکی کۆنی فەرەنسی دروست کرابوو. دەروازەکە چەندین پایەی خەتخەتی لەژێردا بوو، کە هەموو پێکەوە گومەزێکیان هەڵگرتبوو. لەدیوی ناوەوەی گومەزەکەش - کە هەموو سەردانکەران بەژێریدا دەهاتن و دەچوون - وێنەی دەموچاوی جوانی ژنێک کێشرابوو، وێنەی ئەم ژنە، ئەم ڕووبییە.

ئێدی گوتی، "بەڵام ئەو شوێنە دەمێک بوو کاول بووبوو. هینێکی گەورە کەوتەوە..."

ئێدی وەستا.

ژنە بەتەمەنە گوتی، "ئاگر! ڕاست دەکەی، ئاگرێکی زۆر گەورە کەوتەوە."

ژنەکە چەناگەی نزم کردەوە و لەودیو چاویلکەکەیەوە

سەیرێکی خوارەوەی کرد، وەک ئەوەی شتێکی لەسەر کۆشی دانابێت و بیخوێنێتەوە.

"٤ی تەمموز بوو، یادی ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمەریکا، لەبەر ئەوە، پشووی فەرمی بوو. ئێمیل زۆر کەیفی بە پشووەکان دەهات. هەمیشە دەیگوت، 'بۆ ئیشەکەی ئێمە زۆر باشن.' ئەگەر پشووی یادی ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمەریکا بەباشی بڕۆیشتایە، تەواوی هاوینەکە بەباشی دەڕۆیشت، لەبەر ئەوە، ئێمیل بڕێکی زۆر یاریی ئاگرینی بۆ بۆنەکە ئامادە کرد. گرووپێکی مۆسیقای هێنا، کە بەرێڕۆیشتنەوە مۆسیقایان دەژەنی، تەنانەت چەندین کرێکاری زیادەشی تەنیا بۆ ئەو بۆنەیە بەکرێ گرت، کە زۆربەیان ئەندامی گرووپەکانی سێرک و نمایش بوون.

"بەڵام شەوی پێش یادەکە، شتێکی ناخۆش ڕووی دا. ئەو ڕۆژانە، تەنانەت دوای خۆرئاوابوونیش، دونیا هەر گەرم بوو، بۆیە هەندێک لە کرێکارەکان لە دەرەوە دەخەوتن. ئەو شەوە، هەر ڕێک لەپشت ئەو شوێنەوەی بۆ حەوانەوەی خۆیان دروست کرابوو، چەند کرێکارێک لە بەرمیلێکی ئاسندا، ئاگرێکیان بۆ گۆشتبرژاندن کردبووەوە.

"لەگەڵ هەڵکشانی شەودا، کرێکارەکان دەستیان کردبوو بە خواردنەوە و گاڵتەوگەپ. هەندێک یاریی ئاگرینی بچووکیان هێنابوو و هەڵیان کردبوون. ئەو شەوەش، بایەکی بەهێزی هەبووبوو. دواتر بایەکە بەخێرایی ئاگرەکەی فڕاندبوو. ئێ خۆشت دەزانی ئەو سەردەمە، هەموو شتێک لە تەختە و قیر دروست کرابوو..."

ژنەکە سەرێکی با دا.

"کارەساتەکە بەخێرایی قەوما. ئاگرەکە زوو کەوتەوە و گەیشتە ڕێگە سەرەکییەکە، لەوێشەوە بۆ مێزی لەفەفرۆشەکان و لەوێشەوە بۆ قەفەسی ئاژەڵەکان. کرێکارەکان هەر زوو قووچاندبوویان. تا ئەو کاتەی کەسێک گەیشتە ماڵمان و خەبەری کردینەوە، شاری یاریی ڕووبی یەکپارچە ئاگر بوو. لە پەنجەرەی ماڵی خۆمانەوە، بڵێسە پرتەقاڵییە ترسناکەکانیمان دەبینی. گوێمان لە دەنگی ناڵی ئەسپەکان و ئامێری ئاگرکوژاندوەی عەرەبانەی کۆمپانیاکانی ئاگرکوژاندنەوە بوو*. خەڵک هەموو لە دەرەوە بوون.

"لە ئێمیل پاڕامەوە نەڕوا، بەڵام بێسوود بوو. بەدڵنیاییەوە، دەڕۆیشت و هەوڵی دەدا ئەو ساڵانەی تەمەنی ڕزگار بکات، کە بەو شوێنەوە بەسەری بردبوون. ئێمیل دەترسا و تووڕەش بوو، کاتێکیش دەروازەکە - کە ناو و وێنەی منی پێوە بوو - ئاگری گرت، بەرچاوی تاریک بوو، بەشێوەیەک، چیی تر نەیدەزانی لەکوێیە. لە کاتێکیشدا کە سەتڵەئاوی دەپرژاند، ستوونێک بەسەریدا کەوت."

ژنەکە دەستی گرت بە دەمیەوە. "لە ماوەی تاقە یەک شەودا، ژیانمان بۆ هەتاهەتایە گۆڕا. ئێمیلیش ئەوەندە سەرکێش بوو، تەنیا دڵنیاییەکی کەمی داراییی خستبووە سەر هەندێک شتی شاری یارییەکە، بۆیە سامانەکەی لەدەست دا، ئەو دیارییە نایابەی دابووشی بە من، نەما.

---

* لەو سەردەمەدا، ئەمەریکا بنکەی ئاگرکوژێنەوەی حکومیی نەبوو، بۆیە لە کاتی ئاگرکەوتنەوەدا، بنکە ئاگرکوژێنەوە ئەهلییەکان پێشبڕکێیان دەکرد لەسەر ئەوەی کامیان زووتر دەگاتە شوێنی ئاگرەکە و دەیکوژێنێتەوە، بۆ ئەوەی دواتر کۆمپانیاکان پەیوەندییان پێوە بکەن، گرێبەستیان لەگەڵ واژۆ بکەن و کرێی دڵنیاییی ساڵانەیان بدەنێ.

بۆیە بەناچاری، زەوییە قەرەبرووتەکەی بەنیوەقیمەت بە بازرگانێکی خەڵکی پەنسلڤانیا فرۆشت. ئەو بازرگانە شارە یارییەکەی هەر بە ناوی منەوە هێشتەوە، بەڵام دوا ئەوەی هەموو شتەکانی چاک کردەوە و دووبارە پارکەکەی کردەوە، چیی تر هیی ئێمە نەمابوو.

"ئێمیل بەتەواوی لە ناخەوە و لە دەرەوە ڕووخابوو. دوای سێ ساڵ، ئینجا توانی بە پێی خۆی بڕواتەوە. ماڵمان ڕۆیشت بۆ شوێنێک لە دەرەوەی شار، بۆ شوقەیەکی بچووکتر، کە ژیانێکی سادەمان تیادا دەگوزەراند. من بەدیار مێردە بریندارەکەمەوە دانیشتبووم و بەبێدەنگی بیرم لە یەک تاقە خۆزگەی خۆم دەکردوە."

"خۆزگەی چی؟"

"خۆزگەی ئەوەی کە هەرگیز ئەو شاری یارییەی دروست نەکردایە."

ژنەکە بەبێدەنگی دانیشت، ئێدییش سەیری ئاسمانە پیرۆزەیییەکەی کرد و و بیری لەو هەموو جارانە کردەوە، کە خۆشی هەمان خۆزگەی خواستبوو، خۆزگەی ئەوەی خاوەنی شاری یاریی ڕووبی، پارەکەی لە شتێکی تردا بەگەڕ بخستایە.

ئێدی، زیاتر لەبەر ئەوەی هیچی تری بۆ گوتن نەبوو، گوتی، "بەداخەوەم بۆ ئەوەی بەسەر هاوسەرەکەتدا هات."

ژنە بەتەمەنەکە زەردەخەنەیەکی کرد. "سوپاست دەکەم، بەڵام دوای ئەو ئاگر و بڵێسانەش، چەندین ساڵی ترمان بردە سەر. سێ منداڵمان گەورە کرد. ئێمیل هەر بەڕێی

نەخۆشخانەوە بوو. لە پەنجاکانی تەمەنمدا، بەجێی هێشتین و کردمی بە بێوەژن. ئەم دەموچاوەی ئێستا دەیبینی، ئەم چرچولۆچییانە..."

ڕووبی ڕوومەتەکانی بەرز کردەوە، تا چرچییەکانی دەوری چاوەکانی دەر بکەون.

..." دانەبەدانەیانم لە دەستی ڕۆژگار وەر گرتووە."

ئێدی ناوچاوانی گرژ کرد. "من تێناگەم! من و تۆ قەت یەکترمان بینیوە؟ تۆ دەهاتی بۆ شاری یارییەکە؟"

ڕووبی وەڵامی دایەوە، "نەخێر. دوای ئەو ڕووداوە، نەمویست بیبینمەوە. منداڵەکانم و نەوەکانم دەچوون، بەس خۆم نا. بەهەشتی من، جێگەیەک بوو دوور لە زەریا، ئەو کافتریایە بوو، کە کارم تێدا دەکرد، ئەو کاتەی ڕۆژەکانی ژیانم سادە بوون و لەگەڵ ئێمیلدا دڵدارییمان دەکرد."

ئێدی دەستێکی بە لاجانگەکانیدا هێنا. کە هەناسەی دەدایەوە، تەم لە دەمیەوە دەهاتە دەر. پرسیی، "کەواتە من بۆ لێرەم؟ مەبەستم ئەوەیە، ئەوەی باست کرد، چیرۆکی ئاگرەکە، هەمووی پێش لەدایکبوونی من ڕووی داوە."

ڕووبی گوتی، "ئەو شتانەش کە پێش لەدایکبوونت ڕوو دەدەن، هەر کاریگەرییان لەسەر ژیانت دەبێ. نەک هەر ئەوە، ئەو کەسانەی لەپێش تۆدا ژیاون، هەر کاریگەرییان لەسەرت دەبێ.

"ئێمە، ڕۆژانە، بە هەندێک جێگەدا دێین و دەڕۆین، کە ئەگەر بە هۆی ئەوانەی پێش خۆمانەوە نەبووایە، بە ژیانمان ئەو شوێنانەمان نەدەبینی. بۆ نموونە، پێمان وایە شوێنی ئیشەکەمان - کە زۆربەی کاتەکانمانی لێ بەسەر دەبەین

- لەگەڵ دەستبەکاربوونی ئێمەدا دروست بووە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە.“

ڕووبی سەری هەر دە پەنجەکانی بەیەکدا کێشا. ”ئەگەر ئێمیل نەهاتایەتە ژیانمەوە، من شووم نەدەکرد، ئەگەر شووشم نەکردایە، شاری یارییەکە دروست نەدەکرا، ئەگەر شاری یارییەکەش دروست نەکرایە، تۆ لەوێ نەدەگیرسایتەوە و ئیشت نەدەکرد.“

ئێدی سەرێکی خوراند. ”کەواتە تۆ هاتووی، تا باسی ئیشم لەگەڵ بکەی، وا نییە؟“

ڕووبی، بەدەنگێکی نەرم، وەڵامی دایەوە، ”نا، گیان! من هاتووم تا پێت بڵێم بۆچی باوکت مرد.“

تەلەفۆنەکە دایکی ئێدی بوو. ئەو دوانیوەڕۆیە، باوکی ئێدی، لە کۆتاییی ڕێگە دارینەکەدا، تاکەی زۆر زۆر بەرز بووبووەوە و لە نزیک *یاریی ساروونخ*ەکە کەوتبوو.

دایکی ئێدی، بە دەنگێکی لەرزۆک، گوتی، ”ئێدی گیان، زۆر بەداخەوە...“

لەسەر تەلەفۆنەکە، دایکی ئێدی باسی ئەوەی بۆ کوڕەکەی کرد، کە چۆن چەند شەوێک پێش ئەوە، باوکی سەرتاپای گیانی تەڕ بووە و بەرەبەیان بە تاکێک پێڵاوەوە هاتووەتەوە بۆ ماڵەوە، جلەکانیشی پڕ بوون لە لم و بۆنی دەریای لێ هاتووە - ئێدی دڵنیا بوو بۆنی ویسکییشی لێ هاتووە.

دایکی بۆ ئێدیی ڕوون کردەوە، ”کە باوکت هاتەوە، دەکۆکی. تا دەشهات، خراپتر دەبوو، دەبووایە دەستبەجێ بانگی دکتۆرمان بکردایە...“

وشـەکانی دایکـی ئێـدی تێکەڵوپێکـەڵ دەبـوون. گوتـی کـە ڕۆژی دوای ئـەوە، مێردەکـەی بەنەخۆشـی و بـە نیتـاق و چەکوشـەکەیەوە، وەک ڕۆژانـی تـر، چـووە بـۆ ئیش، بـەڵام شـەوەکەی نانـی بـۆ نەخـوراوە و کاتێکیـش چووەتـە جێگـەوە، تـا ڕۆژ بووەتـەوە، سـینگی خیـزەی هاتـووە و هەمـوو گیانـی سـەر ئارەقـە گـەڕاوە. ڕۆژی دواتـر خراپتـر بـووە و دواجـار ئـەم دوانیوەڕۆیـە، لـە پەلوپـۆ کەوتـووە.

"دکتۆرەکـە پێـی گوتـم، کـە تووشـی هەوکردنـی سـییەکان بـووە. خوایـە گیـان، بـۆ هیچـم نەکـرد! دەبووایـە شتێک بکـەم..."

ئێدی لە دایکی پرسی، "جا چی بکەی؟ چیت پێ دەکرا؟"

ئێـدی پێـی ناخـۆش بـوو دایکـی خەتاکـەی خسـتبووە ملـی خـۆی. لای ئێـدی، هـۆکار، سەرخۆشـییەکەی باوکـی بـوو.

ئێدی لـە تەلەفۆنەکـەوە گوێـی لێ بـوو، دایکـی دەسـتی کـرد بـە گریـان.

باوکـی ئێـدی زووزوو دەیگـوت کـە ئەوەنـدەی سـاڵی لەسـەر ئـەو کەناردەریایـە بەسـەر بردبـوو، لەجیاتـی هـەوا، بـە ئـاوی دەریـا دەژیـا. بـەڵام ئێسـتا، دوای ئـەوەی لـە ماڵـەوە گواسـتبوویانەوە بـۆ نەخۆشـخانە، جەسـتەی خەریـک بـوو وەک لاشـەی ماسـییەکی سـەر ڕۆخـی دەریـا وشـک دەبـوو. کێشـی زیـادی کـرد. سـییەکانی هەویـان کردبـوو. بـۆ ماوەیـەک، بـاری تەندروسـتیی جێگیـر بـوو، بـەڵام دوای ئـەوە، زۆر خراپتـر لێـی دایـەوە. هاوڕێکانـی قسـەکەیان لـە "سـبەینێ لـە نەخۆشـخانە دەر دەچێـت"ەوە کـرد بـە "هەفتەیەکـی تـر دەر دەچێـت." لـەو ماوەیـەدا کـە باوکـی ناسـاغ بـوو، ئێـدی خـۆی، دوای ئیشـی

تاکسی، ئێواران ئیشوکاری شاری یارییەکەشی ڕادەپەڕاند. سکەکانی گریس دەکرد، ئیستۆپەکانی تایم دەدایەوە، سەیری مەکینەکانیانی دەکرد، تەنانەت لە وەرشەکەدا پارچەی شکاوی یارییەکانیشی چاک دەکردەوە.

لە ڕاستیدا، ئێدی نەیدەهێشت ئیشەکەی باوکی بفەوتێت، خاوەنکارەکانیش بە هەوڵ و ماندووبوونەکەیان دەزانی، بۆیە نیوەی ئەو پارەیەیان پێ دەدا، کە دەیاندا بە باوکی. ئێدییش پارەکەی دەدا بە دایکی. دایکی ئێدی هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆ نەخۆشخانە و زۆر شەویش هەر لەوێ دەمایەوە، ئێدی و مارگرێتیش شووقەکەیان پاک دەکردەوە و خۆراک و پێداویستییەکانی ماڵەکەیان دەکڕی.

کاتێک ئێدی هەرزەکار بوو، هەرکاتێک گلەییی لە دەست شاریی یارییەکە بکردایە یان وای نیشان بدایە کە بێزارە لێی، باوکی خێرا بە دەنگێکی تیژ دەیگوت، "بۆ؟ ناشێ بڵێی بەدڵت نییە؟" دواتریش کە باوکی پێشنیاری کرد ئێدی، دوای تەواوکردنی ئامادەیی، بچێت لە شاری یارییەکە ئیش بکات، ئێدی تۆزێک پێکەنینی بە پێشنیارەکە هات، باوکیشی دووبارە گوتیەوە، "بۆ؟ ناشێ بڵێی بەدڵت نییە؟" پێش ئەوەش کە بڕوات بۆ شەڕ، ئێدی، کاتێک باسی ئەوەی دەکرد دەیەوێت لەجیاتیی ئیشکردن لە شاری یارییەکە مارگرێت بخوازێت و ببێت بە ئەندازیار، باوکی پێی گوتەوە، "بۆ، ناشێ بڵێی شاری یارییەکەت بەدڵ نییە!"

ئێستاش، سەرەڕای ئەو هەموو خەونانە، ئێدی کەوتبووە شاری یارییەکەوە و چووبووە سەر ئیشەکەی باوکی. دواجار، شەوێکیان، بە هاندانی دایکی، ئێدی چوو بۆ نەخۆشخانە.

بەهێواشی خۆی کرد بە ژووردا. باوکی، کە چەندین ساڵ بوو دەمی هەڵنەهێنابووەوە قسەیەک لەگەڵ کوڕەکەی بکات، ئێستا ئیتر هێزی ئەوەی نەمابوو نووزەش بکات. بە دوو چاو، کە بەئەستەم بۆی هەڵدەهاتن، سەیرێکی کوڕەکەی کرد. ئێدی، دوای ئەوەی هەوڵەکانی بۆ دۆزینەوەی ڕستەیەک بێئاکام بوون، ئەو تاکە شتەی کرد، کە دەکرا لەو شوێنەدا لەبیری بێت، ئەویش ئەوە بوو، هەردوو دەستی بەرز کردەوە و پەنجە گریساوییەکانی خۆی نیشانی باوکی دا.

هەندێک لە کرێکارەکانی شاری یارییەکە لەوێ بوون و خێرا بە ئێدییان گوت، "خۆت هیلاک مەکە لەگەڵی، باوکە پیرەکەت هەڵدەستێتەوە. بڕوا بکە، تا ئێستا لەو بەهێزترمان تێدا نەبووە و ناشبێ."

دایک و باوک زۆر بەدەگمەن دەستبەرداری منداڵی خۆیان دەبن، ئەوە منداڵەکانن کە دەستبەرداری دایک و باوکیان دەبن و دوای ژیانی خۆیان دەکەون و دوور دەکەونەوە، ساتە گرنگەکانی ژیانیان –بۆ نموونە، ڕازیبوونێکی دایکیان لەسەر شتێک، سەرلەقاندنێکی باوکیان – دەگۆڕنەوە بە دەستکەوتی تایبەتیی خۆیان. دواتریش، هەتا پێستیان دانەکەوێت و دڵیان لاواز نەبێت، سەر لە شتەکان دەر ناکەن، ئەو کاتە ئینجا تێدەگەن، کە بەردبەبەردی چیرۆک و سەرکەوتنەکانیان لە دەریای ژیاندا لەسەر چیرۆک و سەرکەوتنەکانی دایک و باوکیان هەڵچنراون.

کاتێک هەواڵی مردنی باوکی ئێدی هات – کە پەرستارێک بە "بەداخەوە، بەبێ ماڵئاوایی ڕۆیشت" ئاشکرای کرد – وەک

ئەوەی چووبێت بۆ شیرکڕین - ئێدی هەستی بە بەتاڵترین جۆری تووڕەیی کرد، تووڕەیییەک، کە لە قەفەسەکەیدا هەر دێت و دەچێت. ئێدییش، وەک کوڕی زۆربەی کرێکارەکان، لە دڵی خۆیدا مردنێکی پاڵەوانانەی بۆ باوکی پێشبینی کردبوو، مردنێک، کە جیاواز بێت لەو ژیانە نەگۆڕ و سادەیەی بەسەری بردبوو، بەڵام، لە ڕاستیدا، هیچ شتێکی پاڵەوانانە لە مردنی سەرخۆشێکی لەهۆشخۆچوو لەسەر کەناردەریایەکدا نەبوو.

ڕۆژی دواتر، ئێدی چوو بۆ ماڵی باوکی، خۆی کرد بە ژووری خەوتنەکەدا و هەموو چەکمەجەکانی کردەوە، وەک ئەوەی چاوەڕێ بێت لە یەکێکیاندا پارچەیەک لە باوکی بدۆزێتەوە. دەستی بەناو شتەکاندا گێڕا، هەندێک پارەی وردە، دەرزییەکی بۆینباخ، بتڵێکی بچووک *براندی*، چەند لاستیکێکی پارە، چەند پسوولەیەکی کارەبا، چەند پاندانێک، چەرخێک - کە وێنەی پەرییەکی دەریا لەسەر یەکێک لەلاکانی بوو - لەگەڵ دەستەیەک کۆنکەن. ئێدی دەستە کۆنکەنەکەی هەڵگرت و خستیە گیرفانییەوە و ڕۆیشت.

مەراسیمی بەخاسکپاردنەکە بچووک و کورتخایەن بوو. تا دوای چەند هەفتەیەکیش لە کۆچی دوایی باوکی، دایکی ئێدی بەسەر دونیاوە نەبوو، بە جۆرێک، هێشتاش هەر قسەی بۆ مێردەکەی دەکرد، وەک ئەوەی تا ئەو کاتەش لە بەردەمیدا بێت. بۆ نموونە، هاواری بەسەردا دەکرد ڕادیۆکە کز بکات، یان چێشتی دوو کەسی لێدەنا، سەرینی لەسەر هەردوو لای سیسەمەکە دادەنا، هەرچەندە زۆر دەمێکیش بوو، کە تەنیا یەک لاشیان بەکار دەهات.

شەویکیان، ئێدی بینیی دایکی لەسەر کەوانتەرەکە قاپەکان دەخاتە سەر یەک.

ئێدی گوتی، "دایە، با یارمەتیت بدەم."

دایکی وەڵامی دایەوە، "نا، نا، قەینا، دوایی باوکت لایان دەبا."

ئێدی دەستێکی خستە سەر شانی دایکی و گوتی، "دایە گیان، باوکم ڕۆیشت!"

"ڕۆیشت؟ بۆ کوێ ڕۆیشت؟"

ڕۆژی دواتر، ئێدی چوو بۆ لای لێپرسراوی کۆمپانیای تاکسییەکە و پێی ڕاگەیاند، کە واز لە ئیشی تەکسییەکە دەهێنێت. پاش دوو هەفتە، خۆی و مارگریت ماڵیان گواستەوە بۆ ئەو شوقەیەی ئێدی تیایدا گەورە بووبوو: شوقەیەک لە گەڕەکی بییچ ود، بالاخانەی ٦ بی. ڕاڕەوەکانی بالاخانەکە باریک بوون و پەنجەرەی مەتبەخەکەش بەسەر *یاریی بابەخولێی ئەسپ*دا دەیڕوانی. ئەوێ ئەو شوێنە بوو، کە ئێدی تیایدا ئیشە نوێیەکەی خۆی قبوڵ کردبوو، ئیشێک، کە هاوین دوای هاوین ئێدی زیاتر ئامادە کرابوو بۆی. ئیشەکەش بریتی بوو لە چاودێر و کارمەندی وەرشە لە شاری یاریی ڕووبی. ئەو شوقەیە شوێنێک بوو، کە دەرفەتی دەدا بە ئێدی هەم ئیش بکات، هەم ئاگاشی لە دایکی بێت.

ئێدی ئەمەی خوارەوەی بە هیچ کەسێک نەگوت، نە بە ژنەکەی، نە بە دایکی، نە بە هیچ کەسێکی تر، بەڵام هەمیشە قسەی بە باوکی دەگوت بۆ مردنەکەی و تووشکردنی ئێدی بە ژیانێکەوە، کە ئێدی هەمیشە لێی هەڵهاتبوو، ژیانێک، کە ئێدی گوێی لێ بوو باوکە پیرەکەی لەناو گۆڕەکەیەوە پێی پێدەکەنی و پێی وا بوو دەبێ ئێستا ئێدی بەدڵی بێت!

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

سیوحەوت ساڵە. بەرچاییەکەی خەریکە سارد دەبێتەوە.

لە نۆل دەپرسێت، "ئەرێ خوێی لێ نییە؟"

نـۆل، کـە دەمـی پـڕە لـە سۆسـج و ملچەملـچ دەیجووێـت، خـۆی درێـژ دەکات و لەسـەر مێزێکـی تر خوێدانێـك دەهێنێت.

خوێدانەکـە دەداتـە دەسـت ئێـدی و بەورتـە دەڵێـت، "هـا، بگـرە، هەمـوو سـاڵێکیش بەخۆشـی."

ئێـدی خوێدانەکـە زۆر قاییـم ڕادەوەشـێنێت. "باشـە شـتێکی ئەوەنـدە قورسـە، هەمـوو مێزێـك خوێدانـی خـۆی لەسـەر بـێ؟"

نـۆل لێـی دەپرسـێت، "تـۆ چیت هـەر لەخۆتـەوە؟ بەڕێوبەری ئێـرەی، چی؟"

ئێـدی شـانێك هەڵدەتەکێنێـت. بەیانییەکـی گەرمـە و هـەوا زۆر شـێدارە. ڕۆتینـی ژیانـی نـۆل و ئێـدی ئەمەیـە: هەفتـەی جارێـك، بەیانییانـی شـەممە، پێـش ئـەوەی پارکەکـە جەنجـاڵ ببێـت، پێکـەوە نانـی بەیانـی دەخـۆن. نـۆل لـە شـتن و ئووتـووی شـاری یارییەکـە کار دەکات، سـەرەتا ئێـدی یارمەتیـی دا، تـا گرێبەسـتی شـتنی جلوبەرگـی کارمەندانـی شـاری یاریـی ڕووبـی بـۆ ئـەو دەر بچێـت.

نـۆل، کۆپییـەك لـە *گۆڤـاری لایفـ*ـی بـە دەسـتەوەیە و

لەسەر یەکێک لە لاپەڕەکانی، وێنەی کاندیدێکی سیاسیی گەنج دانراوە. نۆل لە ئێدی دەپرسێت، "ڕات چییە لەسەر ئەم کوڕە قۆزە؟ چۆن دەبێ کەسێکی وا خۆی بپاڵێوێ بۆ سەرۆکایەتی، جارێ هەر منداڵە."

ئێدی شانێك بەرز دەکاتەوە، "لە تەمەنی ئێمەدایە."

نۆل یەك بڕۆی لە ئێدی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت، "نەبابە؟ من وام دەزانی بۆ ئەوەی ببی بە سەرۆك، دەبێ تەمەنت هەبێ."

ئێدی بەچرپە دەڵێت، "جا ئێمەش تەمەنمان هەیە!"

نۆل گۆڤارەکە دادەخات و بە دەنگێکی نزم لە ئێدی دەپرسێت، "ئەری بیستتت لە برایتۆن چی قەوماوە؟"

ئێدی سەرێك دەلەقێنێت و قومێك لە قاوەکەی دەدات. بیستوویەتی. لە شاری یارییەکەی برایتۆن، پارچەیەکی *یاریی کەشتییە فڕیوەکە* لەناکاو شکاوە و دایك و کوڕێك لە بەرزیی شەست پێوە بەر بوونەتەوە و مردوون.

نۆل لە ئێدی دەپرسێت، "کەس لەوێ دەناسی؟"

ئێدی زمانی دەخاتە نێوان ددانەکانییەوە. ئەو خۆی زووزوو دەیبیستێت، کە چ شتێك لە فلانە پارك یان شاری یاری ڕووی داوە. ئێدی هەرکاتێك شتێکی وا دەیبیستێت - وەك زەردەواڵەیەك بەلای گوێیدا گیزەی کردبێت - شانەکانی گرژ دەکات و ملی دەهێنێتە خوارەوە. ڕۆژ نییە بیر لەوە نەکاتەوە و نەترسێت لەوەی لە شاری یاریی ڕووبییش، لە ماوەی چاودێریکردنی ئەودا، شتێکی وا بقەومێت.

ئێدی وەڵام دەداتەوە، "ئمم! نا، کەس لە برایتۆن ناناسم."

ئینجـا چاوەکانــی دەخاتــە ســەر پەنجەرەکــە و دەبینێــت یـەك کۆمـەڵ سـەردانکەر لـە ویسـتگەی شـەمەندەفەرەکە دێتـە دەرەوە. سـەردانکەرەکان سـەبەتەی چنـراو و خاولـی و چەتـر و لەفـەی پێچراوەیـان بـە دەسـتەوەیە. هەندێکیـان کورسـیی قەدکراویشـیان پێیـە، کـە تازەتریـن شـتی ئـەو سـەردەمەیە و لـە ئەلەمنیۆمێکـی سـووك دروسـت کـراوە.

پیرەمێردێــك، کــە کڵاوێکــی حەســیریی لەســەردایە و جگەرەیەکــی بــە دەمەوەیــە، بەوێــدا ڕەت دەبێــت.

ئێـدی دەڵێـت، "سـەیری ئەو پیـاوە بکـە، دڵنیـام جگەرەکەی لەسـەر ڕێگـە دارینەکە فـڕی دەدا."

نۆل دەڵێت، "بەڕاست؟ ئیَ جا چییە؟"

"چـۆن چییـە؟ دەکەوێتـە درزێکـەوە و ئاگرێـك دەکەوێتەوە. لێرەشــەوە دەتوانیــن بۆنــی بکەیــن، ئــەو مــاددە کیمیاییــەی بـە تەختەکانیانـدا کـردووە، یەکسـەر دووکـەڵ دەکات. دوێنـی منداڵێکـم گـرت، کـە هـەر چـوار ساڵان دەبـوو، سـەیر دەکـەم خەریکـە قنەجگەرەیـەك بخاتـە دەمیـەوە."

نۆل دەموچاوێك گرژ دەکات، "ئێێی؟"

ئێـدی لا دەکاتـەوە، "ئـیَ هیـچ. خەڵـك دەبـیَ وریاتـر بـن، هـەر ئەوەنـدە."

نــۆل چەتاڵێــك لــە سۆســجەکە دەدات و دەمــی لــیَ پــڕ دەکات. "بــە خــوا تــۆش خۆشــی، ئــەوە دایمــە لــە ڕۆژی لەدایکبوونەکەتــدا وا خۆشــی؟"

ئێـدی وەڵام ناداتـەوە. تاریکییەکـەی نـاو ناخی لەتەنیشـتیەوە دانیشـتووە و ئێسـتا ئیتـر ئەوەنـدە پێـی ڕاهاتـووە، کە هـەر وەك ئـەوەی لـە پاسـێکی قەرەباڵغـدا بێـت و شـوێن بـۆ نەفەرێـك

بکاتەوە، ئاوا شوێنی بۆ دەکاتەوە.

ئێدی بیر لە ئیشی ئەو ڕۆژە دەکاتەوە: گۆڕینی ئاوێنە شکاوەکەی ژووری ئاوێنە سیحراوییەکان، بەستنی چەمەلەغی تازە لە سەیارەی پیاکەوتنەکان، داواکردنی سیکۆتین. ئێدی بیری خۆی دەخاتەوە، کە دەبێت سیکۆتینی زیاتر داوا بکەن، ئینجا بیر لەو داماوانەی برایتۆن دەکاتەوە و لە دڵی خۆیدا دەڵێت، تۆ بڵێی لەوێ کێ چاودێر بووبێت.

نۆل لێی دەپرسێت، "ئەمڕۆ کەی تەواو دەبی؟"

ئێدی هەناسەیەك دەداتەوە. "ئەمڕۆ ئیشمان زۆرە، هاوینە و شەممەشە، ئیتر خۆت بزانە."

نۆل برۆیەك بەرز دەکاتەوە، "دەتوانین سەعات شەش بڕۆین بۆ سەیری پێشبڕکێکە."

ئێدی بیر لە مارگرێت دەکاتەوە. ئەو هەمیشە کە نۆل باسی یاریی پێشبڕکێی ئەسپەکان دەکات، مارگرێتی بیر دەکەوێتەوە.

نۆل دەست پێ دەکاتەوە، "کاکە تۆش ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونتە، با تۆزێ زووتر دەست هەڵبگرین."

ئێدی چەتاڵێك لە هێلکەکانی بەردەمی - کە لەوە ساردتر بوونەتەوە بخورێن - هەڵدەچەقێنێت و دەڵێت، "باشە."

# وانەی سێیەم

ژنە بەتەمەنەکە لە ئێدیی پرسی، "شاری یارییەکەت ئەوەندە بەلاوە ناخۆش بوو؟"

ئێدی وەڵامی دایەوە، "شتەکە بەدەست خۆم نەبوو، دایکم پێویستی بە هاوکاری بوو. شتەکان یەک بەدوای یەکدا ڕوویان دەدا. چەندین ساڵ تێپەڕین و من هەر لەوێ مامەوە، هەموو تەمەنم لەوێ بەسەر برد، هەرگیز پارەی باشیشم دەست نەکەوت... خۆت دەزانی شتەکە چۆنە، بەخۆت نازانی لەگەڵ ئیشێک ڕادێی و خەڵکەکەی چواردەوریشت پشت بە تۆ دەبەستن، ئیتر بۆخۆی ڕۆژێک لە خەو هەڵدەستیت و نازانیت سێشەممەیە یان پێنجشەممە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە لەو ئیشەتدا بەردەوام هەمان شتی ناخۆش دەکەی و دەکەیتەوە و بووی بە لێپرسراوی یارییەکان وەک..."

"وەک باوکت؟"

ئێدی هیچی نەگوت.

ژنە بەتەمەنەکە گوتی، "خراپ بوو لەگەڵت، ها؟"

ئێدی چاوەکانی نزم کردەوە، "بەڵێ، خراپ بوو... ئێ جا چییە؟"

"ڕەنگە تۆش هەر خراپ بووبی لەگەڵی؟"

"من وای نابینم. تۆ دەزانی بۆ دوایین جار باوکم چۆن قسەی لەگەڵ کردم؟"

"دوایین جار، کە هەوڵی دا لێت بدا."

ئێدی نیگایەکی لە ژنەکە گرت.

"ئەی دەزانی دوایین شت چی بوو کە پێی گوتم، 'برۆ ئیشێک بدۆزەرەوە' هەی لەم باوکە جوانەی من هەمبوو!"

ژنە بەتەمەنەکە لێوەکانی توند خستە سەر یەک. "بەلام دوای ئەوە، ئیتر کەوتیتە سەر ئیش و تۆزێ ژیانی خۆتت ڕێک خستەوە."

ئێدی لە ناوەوە تۆزێک تووڕە بوو، گوتی، "سەیر بکە، تۆ ئەو پیاوەت نەدەناسی!"

ژنەکە هەستایە سەر پێ، "ڕاست دەکەی، بەلام شتێکیش هەیە، من دەیزانم و تۆ نایزانی، ئێستاش کاتی ئەوەیە پێتی بلێم."

ڕووبی بە نووکی چەترەکەی، بازنەیەکی لە بەفرەکەدا کێشا. کاتێک ئێدی سەیری بازنەکەی کرد، هەستی کرد چاوەکانی لە کەللەسەری هاتبنە دەرەوە و گەڕابێتنەوە بۆ کات و سەردەمێکی تر. وێنەکانی ناو بازنەکە لە بەرچاوی ئێدیدا ڕوون بوونەوە. کات چەندین ساڵ لەوەوبەر بوو، شوێنەکەش، شوقە کۆنەکەی ماڵی ئێدی بوو. ئێدی دەیتوانی لە یەک کاتدا پێش و پاش و سەر و خواری شوقەکە ببینی.

ئەوەی ئێدی بینیی، ئەمە بوو:

دایکی بەخەمباری لەسەر مێزی مەتبەخەکە دانیشتبوو. مێکی شی بەرامبەری بوو. شی زۆر شێواو دیار بوو،

هەموو گیانی تەڕ بوو، خێراخێرا دەستی بە ناوچاوان و دەمولووتیدا دەهێنا. لەناکاو دەستی کرد بە گریان. دایکی ئێدی پەرداخێک ئاوی بۆ هێنا و هەر بە زمانی ئاماژە پێی گوت، کە لە جێگەی خۆی چاوەڕێی بکات. دوای ئەوە دایکی ئێدی چوو بۆ ژووری خەوتنەکە و لەدوای خۆی دەرگاکەی پێوە دا، ئینجا ماکسییەکەی بەری و پێڵاوەکانی داکەند و دەستی برد بلووز و تەنوورەیەکی تر لەبەر بکات.

ئێدی هەموو ژوورەکانی دەبینی، بەڵام گوێی لە دایکی و شی نەبوو، تەنیا دەنگەدەنگێکی ناڕوون دەهاتە گوێی و تەواو. لە مەتبەخەکەدا، شی پەرداخە ئاوەکەی نەخواردەوە و لەجیاتی ئەوە، دەستی برد شووشەیەکی لە گیرفانی چاکەتەکەی دەر هێنا و قومێکی لێ دا، ئینجا هێواش هێواش هەستایە سەر پێ و بەرەو ژووری خەوتنەکە ملی نا. دەرگاکەی کردەوە.

دایکی ئێدی، کە نیوەڕووت بوو، بەسەرسوورمانەوە لای کردەوە. شی بەملاولادا دەکەوت. دایکی ئێدی خێرا ڕۆبێکی لە خۆی ئاڵاند. شی نزیکتر بووەوە، بەڵام دایکی ئێدی، بۆ ئەوەی نەهێڵێت زیاتر بێتە پێشەوە، دەستێکی لە ڕۆبەکە دەر هێنا. شی بۆ ساتێک لە جێی خۆی وەستا، ئینجا دەستی درێژ کرد و دەستی دایکی ئێدیی گرت. شی نزیکتر بووە و دایکی ئێدیی پێش خۆی دا بۆ دیوارەکە و دەستی خستە سەر کەمەری. دایکی ئێدی کەوتە جووڵەجووڵ و هاوارهاوار، بە دەستێکی پاڵێکی بە سینگی شییەوە نا و بەدەستەکەی تریشی، ڕۆبەکەی گرتبوو. شی گەورەتر و بەهێزتر بوو، دەموچاوە تووکاوییەکەی خستە سەر ڕوومەتی دایکی ئێدی و فرمێسکەکانی لە ملی سوو.

لەو کاتەدا دەرگای سەرەکیی شوقەکە کرایەوە. باوکی ئێدی بوو هاتبووەوە. باران تەواو تەڕی کردبوو، چەکوشێکی بزمارداکوتانیش بە لاقەدیەوە بوو. باوکی ئێدی چوو بۆ ژووری خەوتنەکە و بینیی وا شی پەلاماری ژنەکەی داوە، بۆیە تا هێزی تێدا بوو، نەڕەیەکی کرد و چەکوشەکەی بەرز کردەوە. شی دەستی خستە سەر سەری و بەرەو دەرگاکە ڕای کرد، لەناو دەرگاکەدا باوکی ئێدیی بەپاڵێک لا دا و هەرچۆنێک بوو بۆی دەر چوو. دایکی ئێدی دەگریا و لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا، سینگی بستێک بەرز دەبووەوە. فرمێسکیش لەسەر دەموچاوی ڕێچکەیان بەستبوو. باوکی ئێدی شانی ژنەکەی گرت و بەتوندی ڕای دەوەشاند. ڕۆبەکەی دایکی کەوتە خوارەوە. دایک و باوکی ئێدی هەردووکیان لە یەک کاتدا دەیانقیژاند. باوکی ئێدی شوقەکەی بەجێ هێشت و هەر بەڕێوە، بە چەکوشەکەی دەستی، چرایەکی وردوخاش کرد، ئینجا بەخێرایی بە پلیکانەکاندا ڕۆیشتە خوارەوە و خۆی بەناو شەوە باراناوییەکەدا کرد.

ئێدی بەحەپەساوییەوە هاواری کرد، "ئەوە چی بووو؟ ئەو شتە چی بووو؟"

ژنە بەتەمەنەکە ورتەی لێوە نەهات. چووە تەنیشت ئەو بازنەیەی لەناو بەفرەکەدا بە نووکی چەترەکەی کێشابووی و ئەم جارەیان بازنەیەکی تری دروست کرد. ئێدی هەوڵی دا سەر دانەخات و سەیری ناو بازنەکە نەکات، بەڵام بەدەست خۆی نەبوو. بۆیە چاوەکانی دووبارە کەوتنەوە خوارەوە و چوونە سەر دیمەنێکی تر.

ئەم جارەیان ئێدی ئەمەی بینی:

لە سەری ئەوسەری شاری یاریی ڕووبی - کە پێیان دەگوت *بەشی باکوور* - ئێدی چاوی چووە سەر ئەو ڕێگە باریکەی تا سەر دەریاکە درێژ دەبووەوە. بارانێکی بەخوڕ دای کردبوو، ئاسمانیش نیلییەکی تۆخ بوو. بارانەکە ئەوەندە بەهێز بوو، دەتگوت بە سەتڵ دەیکەنە خوارەوە. میکی شی بەڕاکردن بەرەو ڕێگە باریکەکە دەڕۆیشت. لەناکاو کەوت. سکی خێراخێرا بەرزونزمی دەکرد. بۆ ساتێک، شی لەوێدا ڕووەو ئاسمانە تاریکەکە لەسەر پشت تەخت بوو، ئینجا خۆی خستە سەر لا و لەژێر سیاجە تەختەکەوە کەوتە خوارەوە بۆ ناو دەریاکە.

دوای چەند ساتێک، باوکی ئێدییش بەپەشۆکاوی دەر کەوت. چەکوشەکە هەر بە دەستیەوە بوو. دەستی بە سیاجەکەوە گرت و بەوردی سەیری ئاوەکەی کرد. بایەکە بارانەکەی بەملاولادا دەهێنا و دەبرد. جلەکانی باوکی ئێدی شەلاڵی باران بووبوون و تەنانەت نیتاقە چەرمەکەشی تەواو ئاوی هەڵمژیبوو. باوکی ئێدی شتێکی لەسەر شەپۆلەکان بینی. وەستا و قاییشەکەی دەر هێنا، ئینجا تاکێک پێڵاوی داکەند و هەوڵی دا ئەوەی تریش دابکەنێت، بەڵام کۆڵی دا، پاشان خۆی نزم کردەوە و لەژێر سیاجەکەوە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە و شڵپەی هات.

شی، بەنیوەبووراوەیی، بەردەوام لەسەر ئاوە سەرشێتەکەدا ون دەبوو و دەر دەکەوتەوە. کەفێکی زەرد لە دەمیەوە دەهاتە دەر. باوکی ئێدی، کە بایەکە هاوارەکانی پەرشوبڵاو دەکردەوە، بەمەلە بۆی چوو.

باوکی ئێدی، میکی شیی گرت. شیی بە دەستیەوە ڕادەژەنی. ئاسمانەکەش زووزوو بە هەورەتریشقەیەک چەپڵەیەکی لێدەدا و بارانەکە شی و باوکی ئێدیی زیاتر و زیاتر دەشتەوە. دواجار، دوو پیاوەکە یەکیان گرت و پێکەوە لە ناوەڕاستی شەپۆلە توندەکاندا دەهاتن و دەچوون.

شی خراپ دەکۆکی. باوکی ئێدی قۆڵی شیی گرت و خستیە سەر شانی خۆی. بە هۆی ئەمەشەوە ژێر ئاو کەوت، بەڵام یەکسەر سەری دەر هێنایەوە و هێزی خستە سەر ناوقەدی شی. بەم شێوەیە خۆی و میکی شیی بەرەو کەنارەکە پاڵ نا. باوکی ئێدی بەرەو پێشەوە گوژمی دەدا، شەپۆلێک بردنیەوە دواوە. دیسان بەرەو پێشەوە گوژمیان دایەوە. شەپۆلەکان بەرز دەبوونەوە و دەهاتنەوە خوارەوە، بەڵام باوکی ئێدی خۆی کردبوو بەژێر باڵی شیدا و خۆی لێ قاییم کردبوو، جگە لەوەش، خێراخێرا بە قاچەکانی سەوڵی لێدەدا و چاوی دەترووکاند، تا باشتر ببینێت.

باوکی ئێدی و میکی شی سوار شەپۆلێک بوون و شەپۆلەکە زۆر باش بەرەو کەنارەکە بردنی. شی هەر ناڵەناڵی بوو، بەردەوامیش بە دەم هەناسەی دەدا. باوکی ئێدی ئاوی سوێری دەریاکەی تف دەکردەوە. باران هەر دەهاتە خوارەوە و کەفی سپیی شەپۆلەکانیش دەیدا بە دەموچاوی دوو پیاوەکەدا، کە بەردەوام قۆڵیان ڕادەوەشاند و هەر هاوارهاواریان بوو. لەوە دەچوو ئەمە تا هەتایە بخایەنێت، بەڵام لەکۆتاییدا، شەپۆلێکی بەرز شی و باوکی ئێدیی بەرز کردەوە و هەڵی دانە سەر لمەکە. باوکی ئێدی خۆی هەڵگێڕایەوە و دەستەکانی لە قۆڵی میکی گیر کرد،

بۆ ئەوەی شەپۆلەکە لەگەڵ خۆی نەیباتەوە ناو دەریاکە.
دوای ئەوەی شەپۆلەکە کشایەوە، باوکی ئێدی هێزی دایە
بەر خۆی و بەتوندی شیی ڕاکێشا، ئینجا خۆشی بە دەمدا
کەوت و دەمی پڕ بوو لە لمی تەڕی کەنارەکە.

بینینی ئێدی گەڕایەوە بۆ ئەو ساتەی تیایدا بوو. ئێدی
هەستی بە شەکەتی دەکرد، وەک ئەوەی خۆی لەناو
دەریاکەدا بووبێت. سەری تەواو قورس بووبوو. ئێستا چیی
تر ئەو شتانەی نەدەزانی، کە بە بڕوای خۆی پێشتر لەسەر
باوکی زانیبوونی.

ئێدی بە دەنگێکی نزم گوتی، "ئەوە باوکم چی دەکرد؟"

ڕووبی وەڵامی دایەوە، "هاوڕێکەی ڕزگار دەکرد."

ئێدی خێسەیەکی لە ڕووبی کرد، "لەم هاوڕێ باشە!
ئەگەر من دەبووم، ڕێک وازم لێ دەهێنا بخنکێ."

ڕووبی گوتی، "باوکیشت بیری لەوە کردەوە. لە ڕاستیدا،
ئەو دوای میکی شی کەوتبوو بۆ ئەوەی لێی بدا، ڕەنگە
مەبەستیشی بووبێ بیکوژێ، بەڵام دواجار ئەوەی پێ نەکرا.
ئەو میکی شیی باش دەناسی، دەیزانی خاڵە لاوازەکانی
چین، دەیزانی سەرخۆش بووە و هۆشی بە خۆیەوە نەبووە.
"چەندین ساڵ لەوەوبەر، کاتێک باوکت بەدوای ئیشدا
دەگەڕا، میکی شی بوو کە چوو بۆ لای خاوەنی شاری
یارییەکە و داوای لێ کرد باوکت وەر بگرێ. کاتێکیش تۆ
لەدایک بووی، هەر میکی شی بوو هەموو پارەکەی خۆی -
کە زۆریش نەبوو - دا بە دایک و باوکت، بۆ ئەوەی خۆراک
و پێداویستییەکانی تۆی پێ بکڕن. باوکت هاوڕێ کۆنەکانی

خۆی زۆر لەلا گرنگ و مەبەست بوو..."

ئێدی قسەکەی بە ڕووبی بڕی، "بەڵام خانم گیان، تۆ بینیت ئەو خوێڕییە چیی لە دایکم کرد؟"

ژنەکە بەخەمبارییەوە گوتی، "بەڵێ، بینیم. کارێکی هەڵە بوو، بەڵام شتەکان هەمیشە بەو شێوەیە نین، کە دەر دەکەون.

"میکی دیسان لەسەر ئیش بەسەرخۆشی خەوی لێ کەوتبوو، خاوەنکارەکانیشی چیی تر ئەوەیان پێ قبوڵ نەکرابوو، بۆیە ئەو دوانیوەڕۆیە لە ئیشەکەی دەریان کردبوو. شی، لەگەڵ ئەم هەواڵە ناخۆشەدا، هەمان ئەو مامەڵەیەی کرد، کە لەگەڵ هەر هەواڵێکی ناخۆشدا دەیکرد، ئەویش ئەوە بوو، پەنای بردە بەر خواردنەوە. ئەو کاتەش کە گەیشتە لای دایکت، ویسکییەکە خراپ لێی دابوو. دەپاڕایەوە یەکێک یارمەتیی بدات. دەیویست بچێتەوە سەر ئیشەکەی. ئەو شەوە باوکت تا شەو درەنگ لە ئیش دەمایەوە، بۆیە دایکت دەیویست خۆی بگۆڕێت و شی بەرێت بۆ لای باوکت.

"میکی شی سەرسەری دەر دەکەوت، بەڵام ناخی پیس نەبوو. لەو ساتەشدا سەری لێ شێوابوو، ئەوەی کە کردی، هۆکارەکەی تەنیایی و خەمباری بوو. بەبێ بیرکردنەوە کارەکەی کرد، باوکیشت بەبێ بیرکردنەوە ئەوەی کرد، کە کردی، بەڵام لە کاتێکدا بیرکردنەوەکەی یەکەم جاری کوشتنی میکی شی بوو، بیرکردنەوەی دووەمی ئەوە بوو، ڕزگاری بکا."

ڕووبی هەردوو دەستی خستە سەر نووکی چەترەکەی و بەردەوام بوو، "باوکت بەو شێوەیە نەخۆش کەوت. بۆ

چەند سەعاتێک بەتەڕی و بەشەکەتی لەسەر ئەو لمە مایەوە، بەڵام دواجار، هەرچۆنێک بێ، خۆی گەیاندەوە ماڵەوە. خۆت دەزانی باوکت چیی تر کوڕەکەی جاران نەمابوو، تەمەنی چووبووە پەنجاکانەوە."

ئێدی زۆر بەساردی گوتی، "پەنجاوشەش"

ڕووبی دووبارەی کردەوە، "پەنجاوشەش! جەستەشی لاواز ببوو، دەریا وای لێ کردبوو زۆر بەرگەی نەخۆشیی نەدەگرت. تووشی نەخۆشیی هەوکردنی سییەکان ببوو. دواجاریش، هەر بەوە مرد."

ئێدی پرسیی، "مەبەستت ئەوەیە، بە هۆی میکی شییەوە مرد؟"

ڕووبی وەڵامی دایەوە، "بە هۆی دڵسۆزی و وەفاوە."

ئێدی گوتی، "بەڵام خەڵک بە هۆی دڵسۆزی و وەفاوە نامرن."

ڕووبی زەردەخەنەیەکی کرد، "نامرن؟ ئەی ئایین و نیشتمان چی؟ ئەی ئێمە دڵسۆز نین بۆ ئەم شتانە؟ بە ڕادەیەک، کە هەندێک جار بە هۆیانەوە دەمرین؟"

ئێدی شانێکی بەرز کردەوە.

ڕووبی بەردەوام بوو، "باشترە دڵسۆزی و وەفاکەمان بۆ یەکتری بێ."

/

دوای ئەوە، ئێدی و ڕووبی بۆ ماوەیەکی درێژ – لانی کەم ئێدی وای هەست دەکرد درێژ بێت – لە دۆڵە بەفراوانییەکەدا مانەوە. ئێستا ئیتر ئێدی نەیدەزانی شتەکان چەندیان کات پێ دەچێت.

ئێدی پرسیی، "ئەی میکی شی چیی لێ هات؟"

ڕووبی وەڵامی دایەوە، "دوای چەند ساڵێکی کەم، بەتەنیا مرد. تا سەر لێواری گۆڕەکەشی هەر سەرخۆش بوو. بۆ ئەو شتەی بەرامبەر بە دایکت کردی، ئێستا و ئەوساش، لە خۆی خۆش نەبوو."

ئێدی دەستێکی بە ناوچاوانیدا هێنا، "بەڵام باوکم هەرگیز ئەمەی پێ نەگوتین."

"ڕاستە، هەرگیز باسی ئەو شەوەی نەکردەوە، نە لەگەڵ دایکت، نە لەگەڵ هیچ کەسێک. خۆی زۆر بە شەرمەزاری خۆی و دایکت و میکی شی دەزانی. لە نەخۆشخانە، بەتەواوی لە دەم کەوت. باوکت بێدەنگیی وەک ڕێگەیەکی ڕاکردن لە ژیانی خۆی بەکار دەهێنا، بەڵام هێشتا بیرکردنەوەکانی وازیان لێ نەدەهێنا. تۆ دەزانی بێدەنگی زۆر بەدەگمەن نەوایەکی ئارامە بۆ مرۆڤ.

"شەوێکیان، باوکت هەناسەکانی خاو بوونەوە و چاوەکانی داخران، ئیتر دوای ئەوە خەبەری نەبۆوە. دکتۆرەکان گوتیان چۆتە کۆماوە."

ئێدی ئەو شەوەی بیر کەوتەوە، شەوێک کە تیایدا تەلەفۆنێکی تر بۆ کاک نەیسانسۆن کرا، ئەویش هات و لە دەرگای ماڵی ئێدیی دا.

"دوای ئەوەی ئەو حاڵەتە ڕووی دا، دایکت بەردەوام لە ژوورسەری باوکت بوو، شەو و ڕۆژ. هەمیشە، وەک ئەوەی نزا بکات، بە دەنگێکی نزم دەیبۆڵاند و دەیگوت، 'دەبووایە شتێک بکەم، من دەبووایە شتێک بکەم.'

"دواجار، شەوێکیان، لەسەر قسەی دکتۆرەکە، دایکت

هاتەوە بۆ ماڵەوە تۆزێک بخەوێ. بۆ سبەی بەیانی زوو، پەرستارێک بینیبووی باوکت بەسەر پەنجەرەکەدا شۆڕ بۆتەوە و لە ناوقەد بۆ سەرەوەی کەوتۆتە ئەودیوەوە."

ئێدی چاوەکانی کز کرد، "چی؟ بەسەر پەنجەرەکەدا شۆڕ بۆتەوە؟"

ڕووبی سەری لەقاند و بەردەوام بوو، "باوکت ئەو شەوە خەبەری بووبووەوە و لە جێگەکەی هاتبووە دەرەوە و بە ژوورەکەدا ڕۆیشتبوو بۆ لای پەنجەرەکە، دواتریش هێزی دابووە بەر خۆی و پەنجەرەکەی بەرز کردبووەوە. ئینجا بەو دەنگە نزمەی تا ئەو کاتە لە قوڕگیەوە دەهاتە دەر، بانگی دایکتی کردبوو، بانگی تۆ و جەری براتی کردبوو، بانگی میکی شیی کردبوو. لەو ساتەدا، دڵی بووبوو بە ئاو و پڕ بووبوو لە پەشیمانی و هەستکردن بە تاوانباری. ڕەنگە خۆی هەستی کردبێ کە مردن تەواو لێی نزیک بۆتەوە. ڕەنگە وای زانیبێ هەمووتان لەو ناوەن، هەمووتان لەسەر شەقامەکە، لەژێر پەنجەرەی ژوورەکەیدا وەستاون. بەو شێوەیە خۆی بەسەر تاقی پەنجەرەکەدا شۆڕ کردبووەوە. شەوەکەش زۆر سارد بووبوو، ئەو شێ و بایەی ئەو شەوە بۆ ئەو - کە لە حاڵێکی ئاوا خراپدا بوو - زۆر زۆر بوو، بۆیە هەر ئەو شەوە، پێش بەرەبەیان، گیانی دەر چووبوو.

"ئەو پەرستارانەی دۆزیبیانەوە، خێرا ڕایان کێشایەوە بۆ سەر جێگەکەی. دەترسان لە ئیشەکەیان دەر بکرێن، بۆیە هیچیان لەسەر ڕاستیی مردنەکەی باوکت نەدرکاند، لەجیاتیی ئەوە، وا بڵاویان کردەوە کە لە خەودا مردووە و تەواو."

ئێدی، بەحەپەساوی، خۆی بۆ دواوە چەماندەوە و بیری

لەو دوادیمەنەی ژیانی باوکی کردەوە: هێنایە پێشچاوی، کە چۆن باوکە بەزەبروزەنگەکەی - کە دەتگوت ئەسپێکی پیری ناو مەیدانی جەنگە - هەوڵی داوە بەچنگەکرە بەو پەنجەرەیەدا هەڵبگەڕێ و بڕوات... ئەی باشە بۆ کوێ دەچوو؟ نیازی چی بوو؟ باشە ناڕوونبوونی کام لەم دووانە بەئازارترە: ژیانی کەسێک، یان مردنەکەی؟

ئێدی لە ڕووبیی پرسی، "تۆ چۆن ئەم هەموو شتانە دەزانی؟"

ڕووبی ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا، "باوکت پارەی ئەوەی پێ نەبوو، ژوورێکی نەخۆشخانەکە بەتەنیا بۆ خۆی بەکرێ بگرێ، پیاوەکەی تەنیشتیشی هەر بە هەمان شێوە."

ڕووبی بۆ ساتێک وەستا، "مەبەستم مێردەکەمە، *ئێمیلی* مێردم."

ئێدی، وەک ئەوەی وشەیەکی یەکتربڕی تەواو کردبێت، چاوەکانی زەق کرد و سەری بە دوادا خست.

"کەواتە تۆ باوکمت بینیوە."

"بەڵێ."

"دایکیشم؟"

"شەوان گوێم لە نرکە وناڵەی بوو، بەڵام هەرگیز پێکەوە قسەمان نەکرد. دوای مردنی باوکت، سۆراغی خێزانەکەتانم کرد. دوای ئەوەی زانیم باوکت لەکوێ کاری کردووە، لە ناخەوە زۆر ئازارم چەشت، وەک ئەوە وا بوو کەسێکی خۆمم لەدەست دابێ. هەستم کرد ئەو شاری یارییەی بە ناوی منەوە ناو نرابوو، بۆ زۆر کەس بووبوو بە بەڵا. بۆیە

دووبارە خۆزگەم خواستەوە، کە هەر دروست نەکرایە. ئەو خۆزگەیە تا بەهەشتیش لەگەڵم هات، تەنانەت لەو کاتەشدا کە چاوەڕێی تۆم دەکرد."

ئێدی شێواو دەهاتە بەرچاو.

ڕووبی بە دەست ئاماژەی بۆ ئەو تۆزە ڕووناکییە کرد، کە لەناو شاخەکاندا دەسووتا، ئینجا گوتی، "چێشتخانەکەت لەبیرە؟ بۆ لەو شوێنەدا بوو؟ لەبەر ئەوەی من دەمویست بگەڕێمەوە بۆ سەردەمێکی پێشووتری تەمەنی خۆم، ئەو کاتەی ژیانم سادە، بەڵام ئارام بوو. مەبەستیشم بوو هەموو ئەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە هۆی ئەو شاری یارییەوە ئازاریان چەشتووە - جا بە هۆی هەر ڕووداوێک، ئاگرێک، شەڕێک، یان کەوتنەخوارەوەی کورسییەکەوە بووبێ - سەلامەت و ئارام بن. دەمویست ئەوانیش، وەک ئێمیلی مێردم بن، گەرم و ئاسوودە و خۆشگوزەران بژین، دوور لە دەریا و لە باوەشی شوێنێکی خۆشدا بحەوێنەوە."

ڕووبی هەستایە سەر پێ و ئێدییش، کە هێشتا هەر بیری لای مردنەکەی باوکی بوو، بەدوایدا هەستا.

ئێدی لەژێر لێوەوە گوتی، "ڕقم لێی بوو."

ڕووبی سەری لەقاند.

"بەمنداڵی، زۆر لەگەڵم خراپ بوو، کە گەورەش بووم، خراپتر بوو."

ڕووبی بەرەو لای ئێدی هەنگاوی نا و بەنەرمی گوتی، "ئێدوارد؟"

ئەوە یەکەم جار بوو ڕووبی، ئێدی بە ناوی تەواوی خۆیەوە بانگ بکات.

"لە منی وەر بگرە! هێشتنەوەی توورەیی لە ناختدا، ژەهرێکی کوشندەیە و ناخت دەخوا. ئێمە وا دەزانین ڕق چەکێکە، کە دەتوانین بۆ هێرشکردنە سەر ئەو کەسە بەکاری بهێنین، کە ئازاری داوین، بەڵام ڕق تیغێکی چەماوەی هەیە، دوای ئەوەی بەرامبەرەکەمان دەبڕێ، دێتەوە و خۆشمان دەبڕێ.

"لێخۆشبوونت هەبێ، ئێدوارد، لێخۆشبوونت هەبێ. ئەو لەشسووکییەت بیرە، کە یەکەم جار هاتیتە بەهەشتەوە هەستت پێ کرد؟"

ئێدی ئەوەی بیر بوو، ئەو کاتەی بیر کەوتەوە کە دەیگوت، "ئازارەکەم بۆ کوێ چوو، چیی لێ هات ئازارەکەم؟"

"ئەوە هۆکارەکەی ئەوەیە، کاتێک لەدایک دەبین، هیچ کەسێکمان توورەیی لە ناخیدا نییە، ئەو کاتەش کە دەمرین، ڕووحمان خاڵی دەبێتەوە لە توورەیی، بەڵام ئێستا لێرە، لە بەهەشت، بۆ ئەوەی بەردەوام ببی، دەبێ بزانی بۆچی پێشتر ئەو هەستانەت بۆ دروست بوون، هەروەها دەبێ بزانی بۆچی ئیدی پێویست ناکا ئەو هەستانە لە ناختدا بهێڵیتەوە.

ڕووبی دەستی خستە سەر دەستی ئێدی، "تۆ دەبێ لە باوکت خۆش ببی."

ئێدی بیری لە ساڵانی دوای مردنی باوکی کردەوە: بیری لەوە کردەوە، کە هیچ شتێکی بەئاسانی بە دەستەوە نەهاتبوو، نەیدەتوانی بۆ هیچ کوێیەک بچێت... بەدرێژاییی ئەو ماوە زۆرە، ئێدی خۆزگەی بە ژیانێک خواستبوو - کە ئەگەر مردنی باوکی و تێکچوونی باری دەروونیی دایکی نەبوونایە

- دەیتوانی بەدەستی بهێنێت. بەدرێژاییی ئەو ساڵانە، ئێدی وەک شتێکی زۆر مەزن بیری لەو ژیانە خەیاڵییە دەکردەوە و لە هەمان کاتیشدا باوکی بە هۆکار دەزانی، کە نەیتوانیبوو لە ژیانیدا تامی ئازادی و هیوا و هەبوونی ئیشێکی باش بکات. هەتا مردیش، لەو ئیشە پیس و قورسە ڕزگاری نەبوو، کە باوکی بەمیراتی بۆی بەجێ هێشتبوو.

ئێدی گوتی، "ئەو کاتەی باوکم مرد، بەشێک لە منیشی لەگەڵ خۆی برد. لەدوای مردنی باوکمەوە، ژیانی منیش چەقی."

ڕووبی سەرێکی با دا. "هۆکاری ئەوەی تۆ تا مردن لەو شاری یارییە مایتەوە، باوکت نییە."

ئێدی سەرێکی هەڵبڕی. "ئەی کەواتە کێیە؟"

ڕووبی دەستێکی بە عەزییەکەیدا هێنا و عەینەکەی لەسەر لووتی ڕێک کردەوە، ئینجا بەدەم دوورکەوتنەوەوە لە ئێدی، گوتی، "هێشتا دوو کەسی تر ماون بیانبینی."

ئێدی هەوڵی دا بڵێت، "بوەستە،" بەڵام بایەکی سارد دەنگەکەی لە قوڕگی فڕاند و لە چاوتروووکانێکدا هەموو شتێک ڕەش بوو.

ڕووبی ون بوو، بەڵام ئێدی دووبارە لە دەرەوەی کافتریاکە، لەسەر لووتکەی شاخەکە، لە بەفرەکەدا وەستابوو.

ئێدی بۆ ماوەیەکی درێژ بەتەنیا لە بێدەنگییەکەدا مایەوە و جووڵەی نەکرد، تا ئەو کاتەی تێگەیشت ئیتر ژنە بەتەمەنەکە ناگەڕێتەوە بۆ لای، بۆیە لەسەرخۆ بەرەو دەرگای چێشتخانەکە ڕۆیشت و ڕای کێشا. گوێی لە دەنگی

قاپوقاچاخ و ئەو شتانە بوو. بۆنی خۆراکی تازەی بەسەردا هات، بۆنی نان و گۆشت و ساسی جۆراوجۆر. ڕووحی هەموو ئەوانەی لە شاری یارییەکە کۆچیان کردبوو، لەو ناوە بوون و سەریان نابوو بە سەری یەکەوە، دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و گفتوگۆیان دەکرد.

ئێدی دەیزانی بۆچی چووەتە ژوورەوە، لەبەر ئەوە، زۆر پەشۆکابوو. بەلای ڕاستدا لای کردەوە، بۆ مێزی سووچەکە، بۆ لای ڕووحی باوکی، کە خەریکی جگەرەکێشان بوو. تەزوویەک بە سەرتاپای جەستەیدا هات. ئێدی بیری لەو ساتە کردەوە، کە ئەو شەوە ئەو باوکە بەتەمەنەی بە پەنجەرەی نەخۆشخانەکەیەکدا شۆڕ بووەتەوە و لە نیوەشەودا بەتەنیا گیانی دەر چووە.

ئێدی بەچرپە بانگی کرد، "باوکە؟"

باوکی گوێی لێ نەبوو. ئێدی نزیکتر بووەوە و گوتی، "باوکە، ئێستا دەزانم چی ڕووی داوە."

ئێدی هەستی کرد خەریکە دەخنکێت. لەتەنیشت مێزەکەوە کەوتە سەر ئەژنۆ و ئەوەندە لە باوکی نزیک بووەوە، کە دەیتوانی لووتە چەماوەکەی، ئاوساویی ژێر چاوە هیلاکەکانی، ئێسقانی دەرپەڕیوی جومگەکانی دەستی، شانە پانەکانی - کە ڕێک هیی کرێکار بوون - لەگەڵ مووەکانی سەر دەموچاوی و سووتووی جگەرەکەی - کە هێشتا بەر نەبووبووەوە - هەموویان لە نزیکەوە ببینێت. ئینجا سەیری قۆڵەکانی خۆی کرد و بینیی لەو جەستەیەدایە، کە پێوەی مردبوو، بۆیە لەو کاتەدا لە باوکی پیرتر دیار بوو. لە ڕاستیدا، ئێدی، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە باوکی زیاتر ژیابوو.

"زۆر لێت پەست بووم، باوکە. ڕقم لێت بوو."

فرمێسک لە چاوەکانی ئێدیدا قەتیس مان و سینگی لەزی، وەک ئەوەی شتێکی تێدا بێت و بیەوێت لە ناخیەوە دەر بپەڕێتە دەرەوە.

"لێت دام و لە خۆتت دوور خستمەوە، نەمدەزانی بۆ، ئێستاش نازانم بۆ... بۆچی وات لێ کردم؟ بۆ؟"

ئێدی هەناسەیەکی درێژی بەئازارەوە هەڵکێشا و بەردەوام بوو، "ڕاستە من هیچم نەدەزانی، ڕاستە ئاگام لە ژیانی تۆ نەبوو، ئاگام لەو شتانە نەبوو کە بەسەرت هاتن، تۆم نەناسی، بەڵام تۆ باوکی منی، من ئێستا ئەو شتانە لەبیر دەکەم، باش؟ باش باوکە؟ ئاشت دەبیتەوە لەگەڵم؟"

دەنگی ئێدی کەوتە لەرزین، تا ئەوەی بوو بە شیوەن و بە شێوەیەک بەرز بووەوە، کە ئیتر لە دەنگی ئێدی نەدەچوو.

ئێدی هاواری کرد، "گوێت لێمە، باوکەەەەە؟" ئینجا هێواشتر، "گوێت لێمە... باوکە؟"

ئێدی خۆی چەماندەوە و لە باوکی نزیکتر بووەوە. چاوەکانی کەوتنە سەر دەستە پیسەکانی باوکی و ئینجا بەچرپەیەک ئاشناترین ڕستەی نێوانیانی گۆ کرد، "عەیبی نەما، باوکە!"

ئێدی یەکلەسەریەک بە مێزەکەیدا کێشا و کەوتە سەر زەوییەکە. کاتێک سەری بەرز کردەوە، بینیی ڕووبی بە گەنجی و جوانی بەسەر سەریەوە وەستاوە. هەر لەو ساتەدا ڕووبی سەری داخست و دەرگاکەی کردەوە، پاشان بۆ ناو ئاسمانە پیرۆزەییەکە بەرز بووەوە.

## پێنجشەممە، ١١ی بەیانی

ئێدی خزم و کەسی نەبوو، هیچ نووسراوێکیشی لەدوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو، کەواتە کێ تێچووی مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی لە ئەستۆ دەگرت؟ تەرمی ئێدی لە پزیشکی دادوەری مایەوە، جلوبەرگ و کەلوپەلەکانیشی بە هەمان شێوە: کراسەکەی، کە بۆ ئیش لەبەری دەکرد، گۆرەوی و پێڵاوەکانی، کڵاوە خامەکەی، ئەڵقەکەی، سیگارەکانی، ئەو تەلە باریکانەی بۆ دروستکردنی ئاژەڵی گاڵتینە بەکاری دەهێنان، هەموویان لەوێ مانەوە و هەر چاوەڕێی ئەوە بوون یەکێک بێت و وەریان بگرێتەوە.

لە کۆتاییدا، کاک بولۆک، کە خاوەنی شاری یارییەکە بوو، تێچووی مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی بەو چەکانە دا، کە لە داهاتوودا مووچەی خانەنشینییەکەی ئێدییان پێ وەر دەگیرا، بەڵام ئیتر جارێکی تر نەدەکران بە کاش! تابووتەکەی ئێدی تەختە بوو، کەنیسەکەش بەپێی نزیکی هەڵبژێردرابوو - نزیکیی لە شاری یارییەکەوە - لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی لە مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەدا ئامادە دەبوون، کارمەندی شاری یارییەکە بوون و دەبوو زوو بگەڕێنەوە سەر ئیشەکانیان.

چەند خولەکێک پێش ئەوەی مەراسیمەکە دەست پێ بکات، قەشەکە داوای لە دۆمینگێز - کە قەمسەڵەیەکی شین و پانتۆڵێکی ڕەشی تازەی لەبەردا بوو - کرد بچێت بۆ لای بۆ ژوورەکەی خۆی.

قەشەکە لە دۆمینگێزی پرسی، "وەک بیستوومە لەگەڵ خۆلێخۆشبوو پێکەوە ئیشتان کردووە، دەتوانی هەندێک لە سیفاتە باشەکانیم پێ بڵێی؟"

دۆمینگێز زۆر کەیفی بە قەشە و شتی وا نەدەهات. تفێکی قووت دا و بە دەموچاوێکی جیددیەوە پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا، وەک بڵێیی پێویست بێت بیر لە پرسیارەکە بکاتەوە، ئینجا بە هێمنییەکەوە - کە پێی وا بوو هەرکەسێک لەو بار و شوێنەدا بێت، دەبێت بەو هێمنییە قسە بکات - گوتی، "ئێدی ژنەکەی خۆی زۆر زۆر خۆش دەویست."

دۆمینگێز پەنجەکانی لەیەک دەر هێنانەوە و بەخێرایی ئەمەی بۆ ڕستەکەی زیاد کرد، "هەرچەندە من ژنەکەشیم نەناسیوە."

## چوارەم کەس، کە ئێدی لە بەهەشت دەیبینێت

ئێدی چەند جارێک چاوەکانی ترووکاند و بینیی کەوتووەتە ژوورێکی بازنەییی بچووکەوە. شاخەکان و ئاسمانە پیرۆزەییەکە نەمابوون. سەقفی ژوورەکە ئەوەندە نزم بوو، ئێدی خەریک بوو سەری بەری دەکەوت. ژوورەکە قاوەییەکی کاڵ بوو، جگە لە کورسییەکی ستووڵی* تەختە و ئاوێنەیەکی هێلکەییش لەسەر دیوارەکە، هیچی تری تێدا نەبوو.

ئێدی چووە بەر ئاوێنەکە، بەڵام ڕوخساری دەر نەچووەوە، تەنیا ئەمبەری ژوورەکە لە ئاوێنەکەدا دەر کەوت و لە کاتێکیشدا ئێدی لە ئاوێنەکەوە سەیری دەکرد، ڕیزێک دەرگای لەسەر دروست بوو. ئێدی لای کردەوە و کۆکی.

دەنگی کۆکەکە ڕای چڵەکاند، وەک ئەوەی کۆکەی کەسێکی تر بووبێت. ئێدی دووبارە کۆکییەوە، بەڵام ئەم جارە زۆر بەتوندی، بە شێوەیەک، جەستەی کەوتە لەرزە، وەک ئەوەی پێویست بێت دووبارە شتەکانی ناو سینگی بچنەوە جێی خۆیان.

ئێدی لە خۆی پرسی، "ئەرێ باشە من کەی تووشی

---

* کورسیی ستوول: کورسییەکی بەرزی بێپشتە.

ئەم کۆکەیە بووم؟" ئینجا دەستی لە پێستی جەستەی خۆی دا، کە بە بەراورد بەو کاتەی لەگەڵ ڕووبیدا بوو، پیرتر و تەنکتر و وشکتر بووبوو. ئەو کاتەی ئێدی لەگەڵ کاپتنەکەدا بوو، ناوقەدی، وەک لاستیکێکی کشاو، توند و پتەو بوو، بەڵام ئێستا ناوقەدیشی لەژێر کاریگەریی پیریدا چینچین چووبووە سەر یەک.

پێشتر ڕووبی گوتبووی، کە دوو کەسی تر ماون ئێدی بیانبینێت. ئێ باشە دوای بینینی ئەو دوو کەسە، چیی تر هەیە ڕوو بدات؟ بەشی خوارەوەی پشتی ئێدی، سووکەئازارێکی تێ گەڕا، جگە لەوەش، وردەوردە قاچە پێکراوەکەی گرژتر دەبوو. دواجار، ئێدی تێگەیشت کە ئەو شتەی بەسەردا دەهات، کە لەگەڵ هەر قۆناغێکی نوێی بەهەشتدا بەسەری دەهات، ئەویش لاوازبوون و لەبەریەکهەڵوەشانی جەستەی بوو.

ئێدی لە یەکێک لە دەرگاکان نزیک بووەوە و بە پاڵێک کردیەوە. لەناکاو، خۆی لە دەرەوە، لە حەوشەی ماڵێکدا بینییەوە، کە هەرگیز پێشتر نەیبینیبوو. ئێدی شوێنەکەی نەدەناسییەوە، بەڵام دەیزانی کەتووەتە ناوەڕاستی کۆمەڵێک خەڵکەوە - کە لەوە دەچوو بۆ زەماوەندێک کۆ بووبێتنەوە. میوانەکان چیمەنەکەیان پڕ کردبوو، هەمووش قاپی زیوییان بە دەستەوە بوو. لە لایەکی حەوشەکەوە دەروازەیەک هەبوو، کە بە گوڵی سوور و قەدی دارچنار داپۆشرابوو. لە لایەکەی تریشەوە، لەتەنیشت ئێدی، ئەو دەرگایە هەبوو کە ئێدی لێوەی هاتبووە ئەمدیو. بووکەکە، بووکێکی گەنج و جوان بوو. لە ناوەڕاستی میوانەکاندا وەستابوو، خەریک بوو تەوقەیەکی

بچووکی ئاسنی لە قژی، کە ڕەنگی وەک ڕەنگی کەرە وا بوو، دەکردەوە. زاواکە زۆر لاواز بوو. قاپووتێکی ڕەشی بۆنە و ئاهەنگی لەبەردا بوو، شمشێرێکیشی بە دەستەوە بوو. ئەڵقەیەکی هاوسەرگیریی بە دەسکی شمشێرەکەوە کرابوو. دواجار، زاوا شمێرەکەی ڕووەو بووکێ لار کردەوە و ئەڵقەکە خل بووەوە و گەیشتە بووکێ. لەم کاتەدا میوانەکان کەوتنە هاوارهاوار و خۆشیدەربڕین. ئێدی گوێی لە دەنگیان بوو، بەڵام لە زمانەکە تێنەدەگەیشت. لە ئەڵمانی و سویدی و شتی وا دەچوو.

ئێدی دووبارە کۆکییەوە. خەڵکەکە سەرێکیان بۆ هەڵبڕی. زەردەخەنەیەک لەسەر دەموچاوی هەموویان بوو. ئەمە ئێدیی ترساند، بۆیە بەپەلە ئاوڕی دایەوە و خۆی کردەوە بەو دەرگایەدا، کە لێوەی هاتبوو، بەو هیوایەش، بوو لێوەی بگەڕێتەوە بۆ ژووره بازنەییەکە، بەڵام کە لە دەرگاکە چوو بەودیودا، بینیی کەوتووەتە ناو ئاهەنگێکی ترەوە، بەڵام ئەم جارەیان ئاهەنگەکە لە ژوورەوە ساز کرابوو، نەک لە دەرەوە. شوێنەکە هۆڵێکی گەورە بوو، خەڵکەکەش لە ئیسپانی دەچوون. بووکەکە گوڵی دارپرتەقاڵی کردبوو بە قژیەوە و بەنۆرە لای ئەم میوانەوە دەچوو بۆ لای ئەو میوان و سەمای لەگەڵ دەکردن، هەر میوانێکیش پریاسکەیەک پارەی وردەی دەدایە دەست بووکێ.

ئێدی دووبارە کۆکی - بەدەست خۆی نەبوو - کاتێکیش هەندێک لە میوانەکان سەریان هەڵبڕی و سەیریان کرد، ئێدی دووبارە خۆی بە دەرگاکەدا کردەوە و چووە ناو ئاهەنگێکی ترەوە، کە وای بۆ دەچوو ئاهەنگی خەڵکی ئەفەریقا بێت. لە

ئاهەنگەکەدا، ئامادەبووان شەرابیان دەڕشتە سەر زەوییەکە و بووک و زاوا دەستی یەکتریان دەگرت و بەسەر گسکێکی کلکدرێژدا بازیان دەدا. ئێدی ئەویشی بەجێ هێشت و ئەم جارە چووە ناو بۆنەیەکی چینییەکانەوە، کە تیایدا یاریی ئاگرینی بچووک لە بەردەم ئامادەبووە کەیفخۆشەکاندا هەڵکرابوون. دوای ئەم ئاهەنگەش، ئێدی خۆی بە دەرگایەکی تردا کرد بۆ ئاهەنگێکی تر - کە بەوەدا، بووک و زاوا هەردووکیان پێکەوە لە پەرداخێکی دوودەسکیدا دەیانخواردەوە، دەشێت فەرەنسی بووبێت.

ئێدی لە دڵی خۆیدا گوتی، "بڵێی ئەم بەزمە چەندی تر بخایەنێ؟" لە هیچکام لە ئاهەنگەکاندا، هیچ شتێکی وا لەو دەوروبەرە نەدەبینرا، کە پێت بڵێت ئەو میوانانە چۆن هاتوون بۆ ئەو ئاهەنگە: نە سەیارەیەکی لێ بوو، نە پاسێک، نە ئەسپ و عەرەبانەیەک، نە هیچ. لەوە نەدەچوو کەس نیازی ڕۆیشتنی هەبێت. میوانەکان بەو ناوەدا بڵاو بووبوونەوە، ئێدییش وەک یەکێک لە ئەوان دەر دەکەوت. ئامادەبووان زەردەخەنەیان بۆ دەکرد، بەڵام کەسیان لەگەڵی نەدەدوان، هەر وەک ئەو ئاهەنگانەی لەسەر زەوی، ئێدی بۆیان چووبوو. بە بڕوای ئێدی، ئاهەنگەکان هەمیشە پڕ بوون لە ساتی شەرمەزارکەر، بۆ نموونە، وەک ئەو ساتەی داوا لە ژن و مێردانی ئامادەبوو دەکرا بەشداریی سەمای بووک و زاواکە بکەن و ئەوانیش بکەونە سەما، یان یارمەتیی زاوا بدەن و بووکێ بە کورسییەکەیەوە بەرز بکەنەوە. لەوە دەچوو لەو ساتانەدا قاچە شەلەکەی ئێدی بدرەوشێتەوە و سەرنجی هەمووان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، بە جۆرێک،

ئێدی وای هەست دەکرد لەوسەری هۆڵەکەوە خەڵک سەیری قاچی ئەو دەکەن.

لەبەر ئەم هۆکارەش، ئێدی بۆ زۆر بۆنە و ئاهەنگ نەدەچوو، کە دەشچوو، زۆر جار هەر لە گەراجەکە دەمایەوە و نەدەچووە ژوورەوە. لەوێ، بۆخۆی جگەرەیەکی دەکێشا و چاوەڕێی دەکرد کاتەکە بڕوات. ئەوەی باش بوو، بۆ ماوەی چەندین ساڵ هیچ ئاهەنگێک نەبوو پێویست بکات ئێدی بەشداریی تێدا بکات، ئەوە نەبێت کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا، کاتێک هەندێک لە هاوپیشەکانی گەورە بوون و هاوسەرگیرییان کرد، ئێدی دووبارە قاتە ڕەشەکەی لە کەنتۆرەکە دەر هێنایەوە - کە ئێستا ڕەنگەکەی کاڵ بووبووەوە - لەگەڵ کراسە کەشخەکەی - کە ئەویش ئێستا ئێخەکەی لە ملی توند دەبوو - لەبەری کردنەوە. لەو قۆناغەی ژیانیدا، ئێسکەکانی قاچی ئێدی، کە کاتی خۆی شکابوون، دەر پەڕیبوون و شێوەیان تێک چووبوو. نەخۆشیی هەوکردنی جومگەکانیش، بەتەواوی بڕستی لە ئەژنۆی بڕیبوو، لەبەر ئەوە، زۆر بەخراپی دەشەلی و ئەمەش وای کردبوو لە هەموو ئەو چالاکییانە ببەخشرێت، کە لە ئاهەنگەکاندا دەکران، وەک سەماکردن و مەراسیمی مۆمهەڵکردن و ئەو شتانە. ئێدی، دوای ئەوەی گەیشتبووە ئەو تەمەنە، ئیتر وەک *پیرەمێردێکی* تەنیا و دوورەپەرێز بانگهێشت دەکرا و تەماشا دەکرا، بۆیە کەس چاوەڕێی ئەوەی لێ نەدەکرد بەشداریی زۆر چالاکی بکات، تاکە شتێک لێی چاوەڕێ دەکرا، ئەوە بوو کاتێک وێنەگرەکە دێتە سەر مێزەکەی ئەوان، زەردەخەنەیەک بۆ کامێراکە بکات و تەواو.

ئێستا و لەم شوێنەدا لە بەهەشت، ئێدی بە خۆی و کراسی ئیشەکەیەوە لەم ئاهەنگەوە دەچوو بۆ ئەو ئاهەنگ، لەم زمانەوە دەچوو بۆ ئەو زمان، لەم کێک و لەم گۆرانییەوە دەچوو بۆ ئەو کێک و ئەو گۆرانی. لەو ئاهەنگانەدا، لێکچوونی شتەکان سەرنجی ئێدیی ڕانەدەکێشا، چونکە ئێدی پێشتریش هەر وا بیری لێ کردبووەوە، کە زەماوەندەکانی زەوی و بەهەشت جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ یەکتردا نەبێت، بەڵام ئەوەی سەری لێ دەر نەدەکرد، ئەوە بوو کە ئایا ئەم ئاهەنگانە چ پەیوەندییەکیان بە ئەوەوە هەبوو.

ئێدی یەک جاری تریش هەنگاوی بەناو دەرگاکەدا نا و ئەم جارەیان لە شوێنێکدا - کە لە گوندێکی ئیتاڵی دەچوو - خۆی لە ئاهەنگێکی تردا بینییەوە. لاپاڵی گردەکانی ئەو دەوروبەرە، هەموو ڕەزی گەورە بوون و چەندین خانووش، کە بە بەردی حەلـلان دروست کرابوون، بەو ناوەدا بڵاو بووبوونەوە. زۆربەی ئامادەبووە پیاوەکان قژێکی ڕەش و پڕیان هەبوو، کە بەتەڕی بۆ دواوە هەڵیان دابووەوە، ژنەکانیش چاوڕەش و دەموچاودرشت بوون. ئێدی پاڵی دا بە دیوارێکەوە و سەیری بووک و زاواکەی کرد - کە بە مشارێکی دوودەسکی خەریک بوون مووڕەدارێکیان دەبڕییەوە. مۆسیقا و گۆرانی ئیشی دەکرد، فلووتژەن و کەمانچەژەن و گیتارژەنەکان مۆسیقایان دەژەنی و میوانەکانیش بەرز دەبوونەوە و شێتانە سەمایان دەکرد. ئێدی چاوەکانی گواستەوە بۆ سەر کۆتاییی جانجاڵییەکە. لەوێ، یەکێک لە کچەیارمەتیدەرەکانی بووکێ بە عەزییەکی مۆری کاڵ و کڵاوێکی پانی حەسیرییەوە بەناو میوانەکاندا

دەهات و دەچوو. کچەکە سەبەتەیەکی بە دەستەوە بوو، کە نوقڵی هێلکەچۆلەکەبەبادەمی تێدا بوو. لە دوورەوە، کچەکە بیست ساڵان دەهاتە بەرچاو.

کچە بەدەم بەخشینەوەی نوقڵەکانیەوە، بە زمانی ئیتاڵی و لە شێوەی پرسیاردا دەیگوت، "لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکاندا"*؟ لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکاندا؟... لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکاندا؟..."

ئێدی، بە بیستنی دەنگی کچەکە، جەستەی کەوتە لەرزین و ئارەقەی کردەوە. شتێک لە ناوەوە پێی گوت ڕابکات، بەڵام شتێکی تر قاچەکانی بە زەوییەکەوە نووساند. کچەکە نزیکتر بووەوە و چاوەکانی لەژێر کڵاوەکەیەوە - کە هەمووی بە گوڵی وردی دەستکرد داپۆشرابوو - ڕۆیشتن و کەوتنە سەر ئێدی.

کچەکە بە زەردەخەنەیەکەوە سەبەتە نوقوڵەکەی بەرز کردەوە و سەرەتا بە ئیتاڵی و دواتر بە ئینگلیزی پرسییەوە، "لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکاندا؟"

قژە ڕەشەکەی کچەکە هاتە خوارەوە بۆ سەر چاوێکی و دڵی ئێدی خەریک بوو ببێت بە ئاو. ساتێکی ویست، تا لێوەکانی ئێدی لە یەکتری جیا بوونەوە، ساتێکی تریشی ویست، تا ئەو دەنگەی لە قووڵاییی قوڕگیدا دروست بووبوو وردەوردە سەر کەوتە سەرەوە. پاش ساتێک، دەنگەکە یەکەم پیتی ناوێکی لێ دروست بوو، ئەویش ئەو تاقە ناوە بوو، کە ئێدی هەرکاتێک گوێی بکردایە، ئەم هەستە سەیرەی بۆ

---

* بە زمانی ئیتاڵی (Per l'amaro e il dolce) بە زمانی ئینگلیزی دەبێت بە (For the sweet and the bitter).

دروست دەکرد. دواجار، ئێدی کەوتە سەر ئەژنۆ و بەچرپە گوتی، "مارگرێێێت!"

مارگرێت وەڵامی دایەوە، "لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکاندا."

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

ئێدی و براکەی لە وەرشەکە دانیشتوون.

جۆ درێلێکی بە دەستەوەیە، بەرزی دەکاتەوە و بەشانازییەوە دەڵێت، "ئەمە تازەترین مۆدێلیەتی."

جۆ قاپووتێکی وەرزشیی قوماش چوارگۆشەچوارگۆشەی لەبەردایە و جووتێك پێڵاوی قەیتانداری ڕەش و سپیشی لەپێیە. ئێدی پێی وایە براکەی زۆر کەشخەیە - کەشخەش واتا فریودەر. جۆ ئێستا لە کۆمپانیایەکی دروستکردنی کەلوپەلی بیناسازی کار دەکات، ئێدیی براشی چەندین ساڵە هەر لە هەمان شوێنە و هەمان جلی لەبەردایە، ئیی ئیتر چی بزانێت؟

جۆ دەڵێت، "سەیرێکی ئەمە بکە. بەم پاترییە ئیش دەکا."

ئێدی پاترییەکە لەنێوان پەنجەکانیدا دەگرێت، شتێکی بچووکە و لە نیکڵ دروست کراوە. بۆ ئێدی قورسە باوەڕ بە شتێکی وا بکات.

جۆ درێلەکە دەداتە دەست ئێدی و دەڵێت، "هەڵی بکە."

ئێدی دەست دەنێت بە دوگمەی هەڵکردنەکەدا. دەنگێکی گەورە لە درێلەکەوە دێت.

جۆ هاوار دەکات، "نایابە، ها!"

ئەو بەیانییە، جۆ بڕی مووچە نوێیەکەی خۆی بە ئێدی گوتبوو، کە سێ ئەوەندەی ئەوە بوو، کە ئێدی دەستی دەکەوت، کەچی هێشتا جۆ پیرۆزباییی لە ئێدی دەکرد بۆ بەرزبوونەوەی پلەکەی بۆ *لێپرسراوی چاودێرانی شاری یاریی ڕووبی* - ئیشە کۆنەکەی باوکی. ئەو کاتەی جۆ ئەو پیرۆزباییەی لە ئێدی کردبوو، ئێدی ویستبووی وەڵامی بداتەوە و بڵێت، "ئەگەر پێت وایە ئیشەکەم ئەوەندە باشە، بۆ تۆ نایەیتە جێی من و من بێمە جێی تۆ؟" بەڵام دەمی خۆی گرتبوو. ئێدی هیچکام لەو شتانەی نەدەدرکاند، کە لە قووڵاییی ناخیدا هەستی پێ دەکردن.

"سڵاو! کەسی لێیە؟"

مارگرێت لەناو دەرگاکەدا وەستاوە و چەند بلیتێکی پرتەقاڵیی بە دەستەوەیە. بلیتەکان لەسەر کاغەزێك، کە لەسەر شێوەی شریتی سینەمادایە، چاپ کراون. چاوەکانی ئێدی، وەك هەمیشە، دەڕۆنە سەر دەموچاوی مارگرێت، سەر پێستە زەیتوونییەکەی و چاوە قاوەییە تۆخەکانی. ئەو هاوینە، مارگرێت وەك بلیتبڕ ئیشێکی لە شاری یارییەکە دەست کەوتووە و ئەو بەرگەشی لەبەر کردووە، کە کارمەندەکانی ئەوێ لەبەری دەکەن: کراسێکی سپی، هێلەگێکی سوور، ستریچێکی ڕەش و بێرییەکی سوور، لەخوار ئێخەکەشیەوە، ناوەکەی لەسەر پارچەقوماشێکی بچووك نووسراوە. بینینی ئەو پارچەقوماشە و ناوی مارگرێت لەسەری، ئێدی تووڕە دەکات، بەتایبەت لە بەردەمی برا سەرکەتووەکەیدا.

جۆ بە ئێدی دەڵێت، "درێلەکەی پیشان بدە." ئینجا

ڕووەو مارگریت خۆی وەر دەگێڕێت و دەڵێت، "بە پاتری ئیش دەکا."

ئێدی دەست دەخاتەوە سەر دوگمەی هەڵکردنی درێلەکە. مارگریت گوێی خۆی دەگرێت و دەڵێت، "دەنگی لە دەنگی پرخەی تۆ بەرزترە."

جۆ بەپێکەنینەوە هاوار دەکات، "ها هاااای! چاك دەماری گرتی."

ئێدی بەشەرمەزارییەوە سەر دادەخات، پاش کەمێك دەبینێت ژنەکەی زەردەخەنە گرتوویەتی.

مارگریت ڕوو دەکاتە ئێدی و دەڵێت، "دەتوانی تا دەرەوە بێی؟"

ئێدی درێلەکە بەرز دەکاتەوە، "ئیشم هەیە."

"هەر یەك دەقە."

ئێدی بەهێواشی هەڵدەستێتە سەر پێ و بەدوای مارگریتدا دەچێتە دەرەوە. قاچ دەخاتە ئەودیو دەرگاکە و تیشکەکانی خۆر دەیدەن بەسەر دەموچاویدا.

لەو ساتەدا، گروپێك منداڵ بەکۆرس دەڵێن، "هەموووو ساڵێێ بەخۆشییی، کاك ئێدییییی."

ئێدی وەڵامیان دەداتەوە، "دەبێ، دەبێ، بەخۆشی دەبێ."

مارگریت هاوار دەکات، "دەی منداڵینە، مۆمەکان بخەنە سەر کێکەکە."

منداڵەکان بەڕاکردن دەڕۆن بۆ لای ئەو کێکە ڤانێلایەی لەو نزیکانە لەسەر مێزێك دانراوە. مارگریت خۆی لە ئێدی نزیك دەکاتەوە و بەچرپە دەڵێت، "بەڵێنم بە منداڵەکان داوە، هەر سیوهەشت مۆمەکەیان بە یەك فوو بۆ بکوژێنیتەوە."

ئێدی لە لووتیەوە هەناسەیەك دەكاتە دەرەوە و تەماشای هاوسەرەكەی دەكات، كە خەریكە ڕێكخستنی منداڵەكانە لە دەوری كێكەكە. ئێدی هەر كاتێك مارگریتی لەگەڵدایە و منداڵیان لەدەورەن، زۆر دڵی خۆش دەبێت بەو پەیوەندییە نزیكەی مارگرێت بەزوویی لەگەڵ منداڵەكاندا دروستی دەكات، بەڵام زۆریش بەو ڕاستییە دڵتەنگ دەبێت، كە مارگرێت خۆی ناتوانێت منداڵی ببێت. پزیشكێك دەیگوت، گوایە هۆكار ئەوە بووە، مارگرێت زۆر كەسێكی قەلەق و نیگەران بووە، یەكێكی تر دەیگوت، زۆر چاوەڕێی كردووە و دەبووایە لە بیستوپێنجساڵیدا منداڵی دروست بكردایە. شتەكە بەم شێوەیە بەردەوام بوو، تا وای لێ هات پارەیان پێ نەما بیخەنە چنگی پزیشكەكانەوە. ئیتر نسیبەكە هەر ئەوەندە بوو.

نزیكەی ساڵێكە، مارگرێت بیرۆكەی ئەوە هاتووەتە مێشكیەوە منداڵێك بگرنە خۆیان. ڕۆژێك چوو لە كتێبخانەیەك هەندێك گۆڤار و كاغەز و شتی وای هێنا. ئێدی پێی گوت كە خۆشی و ئەویش لەوە بەتەمەنترن منداڵ بگرنە خۆیان، بەڵام مارگرێت وەڵامی دایەوە، "لەوە بەتەمەنترین چییە؟ منداڵ كەی ئەو شتانە دەزانێ!"

ئێدی دانی پێدا نا، كە خۆشی بیری لە هەمان شت كردبووەوە.

مارگرێت، كە ئێستا گەیشتووەتە تەنیشت كێكە ڤانیلاكە، بە دەنگێكی بەرز دەڵێت، "زۆر باشە، دەی كاك ئێدی، مۆمەكان بكوژێنەرەوە... بوەستە، یەك دەقە!"

مارگرێت دەستێك لە جانتاكەیدا دەگێڕێت و كامێرایەك

دەر دەهێنێت، کە فلاشێکی خڕی پێوەیە.

"کوڕی باش، با ڕەسمێکت بگرم بەم کامێرا پۆلارۆیدە*."

مارگریت لە چاوی کامێراکەوە چێوەی وێنەکە ڕێك دەخات: ئێدی لەپشت کێکەکەوە، منداڵەکان بەدەوریدا بەچڕی خڕ بوونەتەوە و بەشەوقەوە سەیری ئەو سیوهەشت بڵێسە بچووکە دەکەن، کە لە بەردەمیاندا سەما دەکەن. یەکێك لە منداڵەکان دەستێك بە کەلەکەی ئێدیدا دەکێشێت و دەڵێت، "هەموویان بە یەك فوو بکوژێنیتەوە، باش؟"

ئێدی سەیری کێکەکە دەکات، کە ڕووی سەرەوەی تێك چووە و کریمەکەی سەریشی هەمووی جێپەنجەی بچووك بچووکە، ئینجا وەڵام دەداتەوە و دەڵێت، "هیچ خەمت نەبێ!" بەڵام چاوی لە چاوی مارگریت بڕیوە.

* پۆلارۆید: مارکەیەکی کۆنی کامێرایە.

ئێدی چاوی بڕییە چاوەکانی مارگرێتی گەنج و جوان و گوتی، "ئەوە تۆی!"

مارگرێت سەبەتە نوقڵەکەی داگرت و بەخەمبارییەوە زەردەخەنەیەکی کرد. خۆر خەریک بوو لەپشت قردێلەیەک هەوری سپییەوە دەتوایەوە، بەڵام سەماکە، کە سەمای ئیتاڵی بوو، تا دەهات، لەپشت ئێدی و مارگرێتەوە گەرمتر دەبوو.

ئێدی دووبارە گوتیەوە، "ئەوە تۆی!"

سەماکەران دەیانکێشا بە تەمبوورەکاندا و هاواریان دەکرد.

مارگرێت دەستی بۆ ئێدی ڕاکێشا. ئێدی خۆنەویستانە، خێرا دەستی مارگرێتی گرت، وەک ئەوەی دەستی بردبێت شتێک بگرێتەوە. پەنجەکانی ئێدی و مارگرێت بەیەک گەیشتن. ئێدی هەرگیز هەستێکی وا گەرموگوڕی بۆ دروست نەبووبوو. بە شێوەیەک هەستی بە دەستی مارگرێت دەکرد، دەتگوت ئێستا پێستی دەستی، بە پێستی دەستی مارگرێتەوە دەنووسێت، پێستێک، کە زۆر نەرم و گەرم بوو، تا ڕادەیەکیش ختووکەی ئێدیی دەدا.

مارگرێتیش لەتەنیشت ئێدییەوە کەوتە سەر ئەژنۆ.

ئینجا بەچرپە گوتی، "بەڵێ، منم، خۆمم!"

هاوارێکی تر لە سەماکەرانەوە بەرز بووەوە.

ئێدی لەبەر خۆیەوە گوتی، "ئەوە تۆی! تۆی! تۆی."
ئینجا سەری خستە سەر شانی مارگرێت و بۆ یەکەمین جار لەدوای مردنی، دەستی کرد بە گریان.

ئاهەنگەکەی ئێدی و مارگرێت لە شەوی سەری ساڵدا و لە ڕێستۆرانتێکی چینیی تاریک بە ناوی *سامی مۆنگ* ساز کرا. خاوەنی ڕێستۆرانتەکە، کە ناوی *سامی* بوو، ڕازی بووبوو بۆ ئەو شەوە ڕێستۆرانتەکەی بەکرێ بدا بە ئێدی، بەو هیوایەی ئیتر لەوەودوا خەڵکی تریش بۆنەکانیان بهێننە ئەوێ. ئێدی، هەموو ئەو پارەیەی لە پارەی خزمەتی سەربازی بۆی مابووەوە، لە ئاهەنگەکەدا خەرج کرد. خۆراک و خواردنەوەی ئاهەنگەکە، مریشکی برژاو و سەوزەواتی چینی و شەرابی پورتوگالی بوو، کابرایەکیش ئۆکۆردیۆنی دەژەند. ئەو کورسییانەی لەوێ بوون، هەم بۆ دانیشتنی میوانەکان و هەم بۆ خواردنی نانی ئێوارەش بەکار دەهاتن، بۆیە هەر کە بووک و زاوا سوێندیان خوارد و بەفەرمی بوون بە ژن و مێرد، شاگردەکان خێرا داوایان لە میوانەکان کرد هەستن بۆ ئەوەی کورسییەکان بەرنەوە خوارەوە بۆ پاڵ مێزەکان. ئەو کابرایەی ئۆکۆردیۆنەکەی دەژەند، لەسەر کورسییەکی ستووڵ دانیشتبوو. ساڵانێک دوای ئاهەنگەکە، جارجار مارگرێت هەر بۆ پێکەنین دەیگوت، تاکە شتێک کە لە ئاهەنگەکەیاندا کەم بووە، "یاریی دومبەڵە" بووە.
کاتێک نان خورا و هەندێک دیاریی بچووک پێشکەش کران، دواپێک بە خۆشیی بووک و زاواوە هەڵدرا، ئۆکۆردیۆنژەنەکەش ئۆکۆردیۆنەکەی خستەوە ناو جانتاکەی. ئێدی و مارگرێت لە

دەرگای پێشەوەوە ڕۆیشتن. باران نمەنمە دەباری، بارانێکی تۆزێک سارد، بەڵام بووک و زاواکە بەپێ ڕۆیشتنەوە بۆماڵەوە، چونکە ماڵەکەیان هەمووی چەند گەڕەکێک لە ڕێستۆرانتەکەوە دوور بوو. مارگرێت بلووزێکی پەمەیی ئەستووری هەر بەسەر عەزیی بووکێنییەکەیدا لەبەر کردبوو، ئێدییش چاکەتی قاتە سپییەکەی و کراسێکی لەبەردا بوو، کە لە ملی توند بووبوو. بووک و زاوا بەجووتە دەستی یەکترییان گرتبوو و بەسەر شەقامەکەدا، کە ئەمبەر و ئەوبەری هەمووی گڵۆپ بوو، دەڕۆیشتن. هەموو ئەو شتانەی لە دەوریان بوون، وا دەر دەکەوتن تا سەرەوە بە قۆپچە داخرابن.

خەڵک دەڵێن گوایە خۆشەویستی "دەدۆزنەوە،" وەک ئەوەی خۆشەویستی شتێک بێت و لەبن بەردێکدا شاردرابێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا خۆشەویستی زۆر شێوەی جیاواز وەر دەگرێت و بۆ هیچ ژن و پیاوێکیش هەمان شت و لە هەمان شێوەدا دەر ناکەوێت. بۆیە ئەوەی دەدۆزرێتەوە، خۆشەویستییەکی دیاریکراوە لەگەڵ کەسێکی دیاریکراو. ئێدی ئەو خۆشەویستییە دیاریکراوەی لەگەڵ مارگرێت پێکەوە نا، خۆشەویستییەکی پڕ لە سوپاسگوزارییەکی قووڵ، بەڵام بێدەنگ، خۆشەویستییەک، کە ئێدی دەیزانی هیچ شتێک ناتوانێت جێگەی بگرێتەوە. بۆیە هەر ڕاستەوخۆ دوای مردنی مارگرێت، ڕۆژەکانی ئێدی تۆزیان لەسەر نیشت و دڵیشی خەوی لێ کەوت.

بەڵام ئێستا دووبارە مارگرێت گەڕابووەوە و وەک ڕۆژی ئاهەنگەکەیان گەنج و جوان بوو.

مارگریت گوتی، "لەگەڵم وەرە."

ئێدی هەوڵی دا هەستێت، بەڵام ئەژنۆی لەگەڵی نەهات. مارگریت زۆر بەئاسانی هەڵی ستاند و بەدەم سەیرکردنی جێبرینە کاڵبووەوەکەی سەر ئەژنۆیەوە، پێی گوت، "قاچت..." ئینجا سەری هەڵبڕی و دەستێکی درێژ کرد بۆ ئەو چەپکە قژەی بەپشت گوێیەکانی ئێدییەوە بوو، پاشان بەزەردەخەنەوە گوتی، "ئەوە خۆ سپی بووە!"

ئێدی هەرچەندەی کرد، زمانی نەگەڕا، بۆیە جگە لە نۆڕین لە مارگریت، شتێکی تری پێ نەکرا. مارگریت بەتەواوی بەو شێوەیە بوو، کە ئێدی لە خەیاڵی خۆیدا هەڵی گرتبوو، لە ڕاستیدا لەوە جوانتر بوو، چونکە دواشێوەی مارگریت کە ئێدی بیری مابوو، شێوەی ژنێکی بەتەمەنی داماو بوو. ئێدی بەبێدەنگی لەتەنیشت مارگریتەوە وەستا، تا ئەو کاتەی چاوە قاوەییە تۆخەکانی مارگریت بچووک بوونەوە و لێوەکانی بەپێکەنینەوە ئەم وشانەیان لەسەر خزا، "ئێدی، هەر وا زوو شێوەمت بیر چووەوە؟"

ئێدی تفێکی قووت دا، "هیچ کاتێک شێوەتم بیر نەچۆتەوە."

مارگریت بەنەرمی دەستێکی لە دەموچاوی ئێدی دا و گەرمییەکەی بە جەستەیدا بڵاو کردەوە، ئینجا هەر بە دەست ئاماژەی بۆ گوندە ئیتاڵییەکە و سەماکەرەکانی ناو ئاهەنگەکە کرد.

مارگریت بەدڵخۆشییەوە گوتی، "ئەم دەوروبەرە هەمووی زەماوەندە! من خۆم ئەمەم هەڵبژارد، بەهەشتێکم لە ئاهەنگی هاوسەرگیری دەویست، ئاهەنگ لەپشت هەموو دەرگاکانەوە. ئێدی گیان، هەمووی هەر یەک شتن و ناگۆڕێن، بۆ نموونە،

کاتێک زاوا تاراکەی سەر ڕووی بووکێ لا دەدات، کاتێک بووکەکە داوای زاواکە قبوڵ دەکات و دەست دەبات زاوا ئەڵقەکە بکاتە پەنجەی، یان ئەو ئەگەرانەی لە چاوەکانیاندا دەخوێندرێنەوە... هەموو ئەمانە، لە هەموو دونیادا وەک یەکن. بووک و زاواکەش هەردووکیان بەڕاستی پێیان وایە کە خۆشەویستییەکەیان و هاوسەرگیرییەکەیان هەموو ڕیکۆردەکان دەشکێنێ."

مارگرێت زەردەخەنەیەکی کرد و لە ئێدیی پرسی، "تۆ پێت وایە ئاهەنگەکەی ئێمەش ئەوانەی تێدا بووبێ؟"

ئێدی نەیزانی چۆن وەڵام بداتەوە، بۆیە تەنیا پێی کرا بڵێت، "ئەوەی ئێمە ئۆکۆردیۆنژەنێکی تێدا بوو."

ئێدی و مارگرێت بەپێ ئاهەنگەکەیان بەجێ هێشت و بە ڕێگەیەکی چەودا دوور کەوتنەوە. دەنگی مۆسیقا و گۆرانییەکان کەوتنە باکگراوندی قسەکانیانەوە. ئێدی ویستی هەموو ئەو شتانە بۆ مارگرێت باس بکات، کە بینیبوونی، هەموو ئەو شتانەی ڕوویان دابوو، هەروەها دەشیویست چەندین پرسیار لەسەر هەموو شتە گەورە و بچووکەکان لە مارگرێت بکات. ئێدی لە ناخیدا هەستی بە لەرزێک کرد، دیسان هەمان ئەو قەلەقی و نیگەرانییەی بۆ گەڕابووەوە، کە زووزوو بۆی دروست دەبوو. ئێدی نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکات.

دواجار گوتی، "تۆش ئەمەت کرد؟ تۆش پێنج کەست بینی؟"

مارگرێت سەرێکی لەقاند.

ئێدی پرسییەوە، "پێنج کەسی جیا؟"

مارگرێت دووبارە سەری لەقاندەوە.

"ئەی هەموو شتێکیان بۆ ڕوون کردیتەوە؟ئایا بینینی ئەو کەسانە و قسەکردن لەگەڵیان گرنگ بوو؟"

مارگرێت زەردەخەنەیەکی کرد و وەڵامی دایەوە، "زۆر زۆر گرنگ بوو!" ئینجا دەستێکی لە چەناگەی ئێدی دا و بەردەوام بوو، "دوای ئەوەش کە تەواو بووم، چاوەڕێی تۆم کرد."

ئێدی سەیری چاوەکانی مارگرێتی کرد و لە زەردەخەنەکەی ورد بووەوە، ئینجا پرسیاری ئەوەی بە مێشکدا هات، کە تۆ بڵێی چاوەڕێکردنەکەی مارگرێتیش وەک چاوەڕێکردنەکەی ئەو ناخۆش بووبێت.

"چەندە دەزانی... دەربارەی من؟ مەبەستم ئەوەیە، چەندە دەزانی لەسەرم لەدوای ئەو کاتەوەی کە..."

هێشتا بەئاسانی بۆی نەدەگوترا.

"لەو کاتەوەی کە مردم؟"

مارگرێت شەپقە حەسیرەکەی بردە دواوە و قژە پڕەکەی لەسەر ناوچاوانی لا برد. "هەموو ئەو شتانە دەزانم، کە کاتێک پێکەوە بووین ڕوویان دا..."

ئینجا لێوەکانی توند کرد و بەردەوام بوو، "ئێستا ئەوەش دەزانم، کە بۆچی ئەو شتانە ڕوویان دا..."

مارگرێت دەستەکانی خستە سەر سینگی، "دەشزانم کە تۆ... منت زۆر خۆش دەویست."

ئینجا دەستەکەی تری ئێدیی گرت و ئەویش دووبارە ئەو هەستە گەرمەی لە دەستیدا هەست پێ کرد.

مارگریت گوتی، "بەلام نازانم تۆ بە چی مردووی."

ئێدی بۆ ساتێک بیری کردەوە، ئینجا گوتی، "لە ڕاستیدا خۆشم باش نازانم. کچێک، کچێکی بچووک، بۆ لای یارییەکەوە ڕۆیشتبوو، مەترسی لەسەر ژیانی بوو..."

مارگریت، کە زۆر گەنج دیار بوو، چاوەکانی زەق بوون. بۆ ئێدی، باسکردنی ئەو ڕۆژەی تیایدا مردبوو بۆ مارگریت، زۆر لەوە قورستر بوو، کە بیری لێ کردبووەوە.

"ئەم یارییانە هەن، یارییە تازەکان، هیچ لەوانەی ئەوسا ناچن – ئێستا هەموو دەیانەوێ سوار یارییەک ببن، کە بە خێراییی هەزار میل لە سەعاتێکدا بڕوات. بە هەرحاڵ، لەو یارییەدا یەک-دوو کورسی بەر دەبنە خوارەوە و لە دوایین ساتدا دەبێت ئیستۆپە هایدرۆلیکییەکان بیانگرنەوە و کورسییەکان بەهێواشی بێنەوە خوارەوە، بەلام شتێک کێبڵەکەی خواردبوو، لەبەر ئەوە، کورسییەکە بەر بووەوە، هێشتا نازانم چی ڕووی دابوو، بەلام بۆیە بەر بووەوە، چونکە من داوام لێ کرد بیخاتە خوارەوە – مەبەستم ئەوەیە داوای لە دۆم کرد، ئەو کوڕەی ئێستا لەگەڵم ئیش دەکات – هەڵەی ئەو نەبوو – من پێم گوتبوو وا بکا، بەلام دوایی ویستم نەهێڵم بەری بداتەوە، بەلام ئەو گوێی لێم نەبوو، ئەو کچە منداڵەش لەژێر یارییەکەدا دانیشتبوو، من هەوڵم دا بیگەمێ و ڕزگاری بکەم. هەستم بە دەستە بچووکەکانی کرد، بەلام دوای ئەوە، من..."

ئێدی وەستا، مارگریتیش سەری لار کردەوە و هانی دا تا بەردەوام ببێت. ئێدی هەناسەیەکی قووڵی دایەوە و گوتی، "لەو کاتەوەی هاتوومەتە بەهەشت، ئەوەندە قسەم

نەکـردووە.“

مارگرێت سـەری لەقانـد و زەردەخەنەیەکـی نەرمـی کـرد، کە کاتێک ئێدی ئەو ڕوخسـارەی مارگرێتی بینینی، چاوەکانی پڕ بـوون لـە فرمێسـک و خەمێکـی قـووڵ دای گـرت. لـە چاوتررووکانێکدا، هیچکام لـەو شـتانە لای ئێدی گرنـگ نەمـان: نـە مردنەکـەی و نـە شـاری یارییەکە و نـە ئـەو خەڵکەی ئێدی بەسـەریاندا هـاواری کـرد ”وەرنـە دواوە.“ ئـەی بۆچـی باسـی ئەمـەی دەکرد؟ خەریکی چی بوو؟ ئایا هـەر بەڕاستی لـەوێ، لەگـەڵ مارگرێتـدا بـوو؟ وەک خەمێکـی شـاراوە، کـە دووبـارە سـەر دەر دەهێنێتـەوە و دڵـت تەنـگ دەکات، هەمـوو هەسـتە کۆنـەکان بۆسـەیان بـۆ ڕووحـی ئێدی نایـەوە و چواردەوریـان لـێ گـرت. لێوەکانـی ئێـدی دەلەرزیـن و ئێدی کەوتـە نـاو گێـژاوی هەمـوو ئـەو شـتانەی لەدەسـتی دابـوون. سـەیری هاوسـەرەکەی دەکـرد، هاوسـەرە مردووەکـەی، هاوسـەرە گەنجەکەی، هاوسـەرە ونەکەی، تاکە هاوسـەرەکەی نـاو ژیانی و نەشـیدەتوانی لـەوە زیاتـر سـەیری بـکات.

ئێدی بەچرپە گوتی، ”ئای، خوایە، مارگرێت. ببوورە، زۆر ببوورە. لەوە زیاترم بۆ ناگوترێ، لەوە زیاترم بۆ ناگوترێ، بۆم ناگوترێ!“

ئێدی سـەری دانەواند و خستیە نێوان هـەردوو دەستیەوە، ئینجا هەرچۆنێک بێت، توانیـی ئـەو ڕسـتەیە بڵێـت، کـە هەرکەسێک بووایە دەیگوت، ”مارگرێت، زۆرم بیر دەکردی.“

## ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

هاوینە و مەیدانی پێشبڕکێکە پڕە لە سەردانکەر. ژنەکان کڵاوی حەسیریی پانیان لەسەردایە و پیاوەکانیش جگەرە دەکێشن. ئێدی و نۆل زوو دەست لە ئیش هەڵدەگرن و دەڕۆن بۆ مەیدانی پێشبڕکێکە، بۆ ئەوەی گرەو لەسەر ئەسپی ژمارە ٣٩ بکەن، کە ژمارەی ساڵەکانی تەمەنی ئێدییە. لەوێ بەتەنیشت یەکەوە، لەسەر کورسییەکان - کە پشتەکەیان بە کۆنکرێتەکەوە داکوتراوە و شوێنی دانیشتنەکەشیان هەڵدراوەتەوە - دادەنیشن. لە بەرپێیاندا و لەسەر ئەو فەرشەی بە بلیتی فڕێدراو دروست بووە، دوو پەرداخی کاغەزی پڕ لە بیرە دادەنێن.

ئێدی گرەوی یەکەمی ئەو ڕۆژەی بردبووەوە، دواتریش دووبارە گرەویان کردبووەوە و ئەویش هەر بۆ ئێدی بووبوو - ئەوە یەکەم جار بوو ئاوا شانسی هەبێت. ئێدی بەو دوو گرەوە، ٢٠٩ دۆلاری دەست کەوتبوو، بەڵام دواتر، دوو جار لە گرەوی بچووکتردا دۆڕاندبووی، بۆیە بڕیاری دابوو ئەوەی لە پارەکەی مابووەوە، بیخاتە گرەوی شەشەمەوە، لەبەر ئەوەی - وەك خۆی و نۆل لەسەری ڕێك کەوتبوون و لەو ساتە خۆشەشدا پێیان لۆژیکی بوو - کاتێك ئێدی

هاتبـوو بـۆ پێشبڕکێکە، هیچـی لـە گیرفانـدا نەبووبـوو، کەواتـە چ کێشـەیەکی تێـدا بـوو، ئەگـەر ئێـوارەش بـە هەمـان شـێوە بگەڕایەتـەوە بـۆ ماڵـەوە؟

نـۆل بـە ئێـدی دەڵێـت، "جـا تـۆ بیـری لـێ بکـەرەوە! ئەگـەر بیبەیتـەوە، ئـەو هەمـوو پارەیـەت دەسـت دەکـەوێ بـۆ منداڵەکـە."

زەنگەکـە لێـدەدا. ئەسـپەکان دەر دەپـەڕن و بەتەنیشـت یەکـەوە، بەسـەر ڕێگـە ڕێکەکـەدا غـار دەدەن، قـژە ئاوریشـمییە ڕەنگاوڕەنگەکەیـان بـەرز دەبێتـەوە و بـە هـۆی جووڵـە و غاردانەکەیانـەوە، ڕەنگـەکان لێـڵ دێنـە بەرچـاو. ئێـدی ئەسـپی ژمـارە ٨ی دەستنیشـان کـردووە. ئەسـپەکە نـاوی *جێرسـی فینچـە* و هیـی ئەوەیـە پیـاو گـرەوی لەسـەر بـکات. ئـەوەی نـۆل لەسـەر منداڵەکـە گوتـی – ئـەو منداڵـەی ئێـدی و مارگرێـت بەنیـازن بیگرنـە خۆیـان - ئێـدی نیگـەران دەکات، بـە شـێوەیەك، ئێـدی وای لـێ دێـت هەسـت بـە تاوانبـاری بـکات. کـەی ڕەوا بـوو ئـەو پارەیـەش هـەر لـەو بابەتـەدا خەرج بکـەن. جـا باشـە ئێـدی بـۆ شـتی وای دەکـرد؟

قەرەباڵغییەکـە هەڵدەسـتێتە سـەر پـێ. ئەسـپەکان بەسـەر بەربەسـتی یەکەمـدا بـاز دەدەن. جێرسـی فینـچ لـە ڕێگەکـە لا دەدات و یـەك بـازی درێـژ و تـەواو دەدات. دەنگـی جۆشوخرۆشـی ئامادەبـووان لەگـەڵ دەنگـی ناڵـی ئەسـپەکان تێکـەڵ دەبێـت. نـۆل هاوارێکـی لـێ بـەرز دەبێتـەوە. ئێـدی بلیتەکـەی تونـد لـە مسـتیدا دەگووشـێت. ئێسـتا قەلەقییەکـەی گەیشـتووەتە ئاسـتێکی زیاتـر لـەوەی خـۆی دەیەوێـت. مووەکانـی گـرژ دەبـن. ئەسـپێك، پێـش تـەواوی ئەسـپەکانی

تــر دەکەوێــت.

ئەو ئەسپەش جێرسی فینچە!

ئێستا ئێدی ٨٠٠ دۆلاری لە باخەڵدایە.

ئێدی دەڵێت، "دەبێ تەلەفۆن بۆ ماڵەوە بکەم."

نۆل دەڵێت، "لە خۆتی تێك مەدە!".

"چییی؟"

"کە بە یەکێکت گوت، بەختەکەت کورت دەهێنێ."

"ئەوە تۆ تەواوی، ڕۆڵە!"

"بە قسەم بکە، بە کەس مەڵێ."

"تەلەفۆنی بۆ دەکەم و دڵی خۆش دەکەم."

"بە شتی وا دڵی خۆش نابێ."

ئێـدی بەشەلەشـەل دەڕوات بـۆ لای کابینەیەکـی تەلەفـۆن و پێنـج سـەنتییەکی ئاسـنی تـێ دەکات. مارگرێـت وەڵام دەداتەوە. ئێـدی هەواڵەکـەی پـێ دەڵێـت. نـۆل ڕاسـت دەکات. هەواڵەکـە دڵـی مارگرێـت خـۆش نـاکا. مارگرێـت داوا لـە ئێـدی دەکات بچێتـەوە بـۆ ماڵـەوە. ئێدییـش پێـی دەڵێـت کـە ئەوەنـدە پێـی نەڵێـت چـی بـکات و چـی نـەکات.

مارگرێــت بەسەرزەنشــتکردنەوە دەڵێــت، "ئێمــە خەریکــە دەبیــن بــە خاوەنــی منــداڵ، نابــێ هــەر ئــاوا لێــی بخــوڕی."

ئێـدی تەلەفۆنەکـە دادەخاتـەوە. پشـتی گوێیەکانـی گـەرم بـووە. دەگەڕێتـەوە بـۆ لای نـۆل، کـە ئێسـتا لەسـەر سـیاجی شـوێنی ئامادەبـووان دانیشـتووە و عەلـی بابـا دەخـوات.

نۆل دەڵێت، "من بزانم، پێی خۆش نەبووە."

ئێـدی و نـۆل دەگەڕێتـەوە بـۆ لای شـوێنی بلیتبڕینەکـە و بلیتـی گرەوکـردن لەسـەر ئەسپێکی تـر دەکـڕن. ئێـدی پارەکـە

لە گیرفانی دەر دەهێنێت. نیوەی ئێدی ئەو پارەیەی ناوێت و نیوەکەی تری دووئەوەندەی دەوێت، ئەویش بۆ ئەوەی کە گەیشتەوە ماڵەوە، هەڵی بداتە سەر سیسەمەکە و بە ژنەکەی بڵێت، "ها! چیت دەوێ، بیدە بە ئەوە."

ئێدی بەناو پەنجەرە بچووکەکەدا پارەکەی پاڵ پێوە دەنێ بۆ ناوەوە. نۆل سەیری دەکات و برۆکانی بەرز دەکاتەوە.

ئێدی دەڵێت، "باشە، باش! دەزانم."

بەڵام ئەوەی ئێدی نایزانێت، ئەوەیە کە مارگرێت ناتوانێت پەیوەندیی پێوە بکاتەوە، بۆیە ئێستا بڕیاری داوە بە ئوتومبێلەکەیان بێت بۆ ئەو شوێنەی ئێدیی لێیە و بیدۆزێتەوە. مارگرێت بێتاقەتە لەوەی لە ئێدی تووڕە بووە، بەتایبەتییش لە ڕۆژی یادی لەدایکبوونەکەیدا. مارگرێت دەیەوێت بچێت بۆ مەیدانی پێشبڕکێکە و داوای لێبووردن لە ئێدی بکات، هەروەها دەشیەوێت وای لێ بکات واز لە گرەوکردن بهێنێت. مارگرێت بە ئێوارەکانی پێشوودا دەزانێت، کە نۆل سوور دەبێت لەسەر ئەوەی لەگەڵ ئێدی تا دواخولەکی پێشبڕکێکە لە مەیدانەکە بمێننەوە - ئیتر ئەوە سروشتی نۆلە. لەبەر ئەوەی شوێنی پێشبڕکێکە تەنیا دە خولەك بە ئوتومبێل لە گۆڕەپانی نمایشەکەوە دوورە، مارگرێت دەست دەداتە جانتاکەی و ئوتومبێلە *لادا* کۆنەکەیان بەرەو *گۆڕەپانی ئۆوشن پارکەوەی* دەئاژوێت. مارگرێت لە شەقامی لێستەرەوە پێچ دەکاتەوە. خۆر ئاوا بووە و ئاسمان هەور و تاریکە. زۆربەی ئوتومبێلەکان لە سایدەکەی ئەوبەرەوە دێن. مارگرێت لەو پردی پەڕینەوەیە

نزیك دەبێتەوە، كە لەسەر شەقامی لێستەر دروست كراوە. پێشتر خەڵك بەو پردەدا خۆیان دەگەیاندە گۆڕەپانەكە، سەرەتا لەمبەر بە پلیكانەكاندا سەر دەكەوتن، ئینجا بەسەر شاقامەكەدا دەڕۆیشتن و لەوبەریش بە پلیكانەكاندا دەهاتنەوە خوارەوە، بەڵام دواتر ڕێكخەرانی پێشبڕكێكە پارەیان كۆ كردەوە و ترافیكێكیان لەولاترەوە دروست كرد، ئەمەش پردی پەڕینەوەكەی تەواو تەنیا كرد.

بەڵام پردەكە لەم شەوەدا تەنیا نییە. دوو هەرزەكاری تەمەن حەڤدە ساڵی بەسەرەوەیە. دوو هەرزەكارەكە پێش چەند كاتژمێرێك لە دوكانێكی مەیفرۆشی پێنج پاكەت جگەرە و سێ چارەك ویسكییماركەی *ئۆڵد هارپەر*یان دزیوە و ڕایان كردووە، ئێستاش لەسەر پردەكە خۆیان شاردووەتەوە. دوای ئەوەی هەرسێ چارەكە ویسكییەكەیان خواردووتەوە و چەندین جگەرەیان كێشاوە، دوو هەرزەكارەكە تاقەتیان لە ئێوارەی ئەو ڕۆژە چووە و خۆیان بەسەر محەجەرە ژەنگاوییەكەی پردەكەدا شۆڕ كردووەتەوە و شووشەی بەتاڵی ویسكییەكان بە دەستیانەوە ڕادەژەنن.

یەكێكیان دەڵێت، "ئەگەر ئازای، بەری بدەرەوە."

ئەوی تریان بۆی دەستێنێتەوە، "تۆ یەكەم جار بەری بدەرەوە."

هەرزەكاری یەكەم شووشە ویسكییەكەی بەر دەداتەوە و هەردووكیان زیاتر خۆیان بەسەر محاجەرەكەدا دەنووشتێننەوە، بۆ ئەوەی سەیری بەربوونەوە و پارچەپارچەبوونی شووشەكە بكەن. شووشەكە موویەكی دەمێنێت بەر ئوتومبێلێك بكەوێت. دواجار، دەیدا بە قیرەكەدا و دەبێت بە هەزار

پارچـەوە.

هـەرزەکاری دووەم هـاوار دەکات، "جوانـەەەەەەە! گوێـت لـەو ناڵەیـە بـووا"

"دەی ترسنۆك، تۆش ئەوەی خۆت بەر بدەرەوە."

هـەرزەکاری دووەم شووشـەی ویسـکییەکەی بـەرز دەکاتەوە و بڕیـار دەدات بـەری بداتـەوە بـۆ سـەر سایدی دەستەڕاست. بـەدەم ئەمدیووئەودیوپێکردنـی شووشـەکەوە لـە لەپـی دەسـتیدا، هەرزەکارەکـە بـۆ سـاتەوەختێك دەگەڕێـت، تیایـدا بـە شـێوەیەك شووشـەکە بـەر بداتـەوە، کـە بیـدا بەنێـوان دوو ئۆتومبێلـدا، وەك ئـەوەی ئیشـەکەی ئیشـێکی هونـەری بێـت و خۆشـی هونەرمەنـد بێـت.

پەنجەکانـی هەرزەکارەکـە لـە شووشـەکە بـەر دەبـن و زەردەخەنەیـەك دەکات.

چـل پـێ لـە خـوارەوە، مارگریـت لـە ئۆتومبێلەیدایـە و هەرگیـز بیـری لای ئـەوەی نییـە سـەر هەڵببڕێـت، هەرگیـز پێـی وا نییـە لەسـەر ئـەو پـردی پەڕینەوەیـەوە شـتێك بکەوێتـە خـوارەوە، بیـری لای هیـچ شـتێك نییـە، جگـە لـەوەی خـۆی بگەیەنێتـە گۆڕەپانـی پێشـبڕکێکە و ئێـدی بـە پارەکـەوە، جـا هەرچەندێکـی تـا ئـەو کاتـە پـێ مابێـت، بهێنێتـەوە بـۆ ماڵـەوە. مارگریـت بیـر لـەوە دەکاتـەوە، کـە دەبێـت یەکـەم جـار چ بەشـێك لـە شـوێنی دانیشـتنی هانـدەران بـۆ ئێـدی بگەڕێـت، لـەو سـاتەدا شووشـە ویسـکییە ئۆلـد هارپەرەکـە دەیـدا بـە جامـی پێشـەوەی لاداکـەی مارگریتـدا و هـەر پارچەشووشـەی بچووکـە و بـاڵ دەگرێـت. ئۆتومبێلەکـە دەیـدا بـە شۆسـتەکەدا. مارگریـت وەك بووکەشووشـەیەك بەمـلا و بـەولادا دەدرێـت،

سـەرەتا دەدرێـت بـە دەرگای ئوتومبێلەکـە و دواتریـش بـە داشـبوڵ و سـووکانەکەدا. بەمـە جگـەری مارگرێـت لـە نـاوەوە زیانـی پـێ دەگات و قۆڵیشـی دەشـکێت، جگـە لـەوەش، سـەری ئەوەنـدە بەقاییمـی بـەر شـتێك دەکەوێـت، کـە دەسـتبەجێ گوێـی لـە هیچـکام لـە دەنگەکانـی نـاو ئـەو ئێوارەیـە نامێنێـت، نـە قریشـکەی تایـەی هیـچ ئوتومبێلێـك، نـە دەنگـی هیـچ هۆڕینێـك و نـە دەنگـی تەپەتەپـی پێـڵاوی هیـچ کەسـێك لـەو کەسانەی لـەو کاتـەدا بەسـەر پردێکـی سـەر شـەقامی لێسـتەردا ڕادەکـەن و خۆیـان دەکـەن بەنـاو شـەوە تاریکەکـەدا.

/

دەکرێت خۆشەویستی، وەک باران، لە سەرەوە بۆ خوارەوە ببارێت و خۆشەویستەکان شەلاڵ بکات لە ئاسوودەیی، بەڵام هەندێک جار دەکەوێتە سەر بڵێسە گەرم و توورەکانی ژیان، بۆیە دەبێت بە هەڵم و وشک دەبێتەوە. لەم کاتانەدا، پێویستە لە خوارەوە ئاو بدرێت، بۆ ئەوەی هەر زوو ڕەگەکانی ببووژێنەوە و بەزیندوویی بمێنێتەوە.

ئەو ڕووداوەی لەسەر شەقامی لیستەر ڕووی دا، مارگرێتی ڕەوانەی نەخۆشخانە کرد. مارگرێت شەش مانگی بۆ دانرا، تا لەسەر جێگە بمێنێتەوە و پشوو بدات. دواجار، جگەری، کە برینداربووبوو، چاک بووەوە، بەڵام خەرجییەکانی چارەسەرکردنەکەی خۆی و ئێدیی مێردی بێبەش کرد لەوەی منداڵەکە بگرنە خۆیان، لەبەر ئەوە، ئەو منداڵەی ئێدی و مارگرێت چاوەڕێیان دەکرد، درا بە کەسێکی تر. ئەو سەرزەنشتکردنە بێدەنگەی ڕووداوەکەی مارگرێت بەدوای خۆیدا هێنای، بەردەوام لەنێوان ژن و مێردەکەدا، وەک تارماییەک، هاتوچۆی بوو. مارگرێت بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگیی هەڵبژارد، ئێدییش خۆی لە ئیشەکەیدا نوقوم کرد. سێبەری سەرزەنشتکردنەکە لەگەڵیان دەهاتە سەر سفرە، لەنێوان قاپ و کەوچک و چەتاڵەکاندا دادەنیشت و ئێدی و مارگرێتیش نانیان لەگەڵ دەخوارد. کاتێکیش ژن

و مێردەکە پێکەوە قسەیان دەکرد، باسی شتی سادە و بچووکیان دەکرد. بەم شێوەیە ناوی خۆشەویستییەکەی ئێدی و مارگریت لەژێر ڕەگەکانەوە شاردرابووەوە. ئیتر ئێدی گرەوی لەسەر ئەسپەکان نەکردەوە، وردەوردەش سەردانەکانی بۆ لای نۆل کەم بوونەوە، چونکە ئیتر ئەو دووانە هیچی وایان پێکەوە نەمابوو لەسەر نانی بەیانی لەگەڵ یەکتر باسی بکەن.

شارێکی یاری لە کالیفۆرنیا، بۆ یەکەم جار یارییەکی *ڕەورەوەی مەرگی* نوێی خستە کار، کە سکەکەی لە ستیل دروست کرابوو. یارییەکە بە گۆشەی وا تیژ پێچی دەکردەوە، کە ئەستەم بوو بە تەختە دروست بکرێت. بەم شێوەیە، یاریی ڕەورەوەی مەرگ - کە خەریک بوو لەبیر دەچووەوە - دووبارە ناوی هاتەوە سەر زاران. کاک بولۆکیش، کە خاوەنی شاری یاریی ڕووبی بوو، دانەیەک لە یارییەکەی داوا کردبوو بۆ شاری یارییەکەی خۆی و ئێدیی ڕاسپاردبوو چاوێریی بنیاتنان و بەکارخستنەکەی بکات. بۆیە زۆر جار ئێدی بەسەر کرێکارەکاندا دەینەڕاند و پێی دەگوتن چی بکەن و چی نەکەن، هەرچییەکیشیان بکردایە، دواتر خۆی سەیری دەکردەوە. ئێدی متمانەی بە هیچ شتێکی ئەوەندە خێرا نەدەکرد. *گۆشەی ٦٠ پلە؟ شتی وا نییە!* ئێدی دڵنیا بوو کەسێک ئازاری پێ دەگات، ئەمەش دڵەی دەبرد و نەیدەهێشت زۆر بیر لە نێوانی خۆی و مارگریت بکاتەوە. *سەکۆی ستاردەست* و *یاریی کورسییە فڕیوەکە* و *یاریی تونێلی خۆشەویستی* - کە ئێستا منداڵان گاڵتەیان لێ دەهات - هەموو لا بران. دوای چەند

ساڵێکی کەم، یاریی بەلەمەکە دروست کرا و بە پێچەوانەی پێشبینییەکانی ئێدییەوە، پێشوازییەکی زۆر باشی لێ کرا. ئەوانەی سواری یارییەکە دەبوون بە بەلەم بەناو ئاوی خوڕ و پێچاوپێچدا دەڕۆیشتن و لە کۆتاییدا دەکەوتنە ناو مەلەوانگەیەکی گەورەوە. ئێدی تێنەدەگەیشت ئەو خەڵکە بۆ ئەوەندەیان حەز لەوە بوو سواری ئەو یارییە ببن و تەڕ ببن، لە کاتێکدا زەریاکە سێ سەد مەتر لەولای خۆیانەوە بوو. بە هەمان شێوەی یارییەکانی تر، ئێدی بەباشی چاودێریی ئەم یارییەشی دەکرد، بە پێی پەتی دەچووە ناو ئاوەکەوە و دڵنیا دەبووەوە لەوەی بەلەمەکان لە ڕێی خۆیان دەر ناچن و ناپەڕن.

وردەوردە، ئێدی و مارگرێت ئاشت بوونەوە و دەستیان کردەوە بە قسەکردن لەگەڵ یەکتر. تەنانەت شەوێکیان، ئێدی دووبارە منداڵەخۆگرتنی هێنایەوە ناو باسان. مارگرێت دەستێکی بە ناوچاوانیدا هێنا و گوتی، "ئێستا لەوە پیرترین شتی وا بکەین."

ئێدی گوتی، "جا منداڵ پیری چووزانێ؟"

ساڵ هاتن و ساڵ ڕۆیشتن، بەڵام ئەو منداڵە هەر نەهات، هێواش هێواش برینی ئێدی و مارگرێتیش سارێژ بووەوە، پەیوەندییەکەشیان باییی ئەوەندە گەشەی کرد، کە ئەو بۆشاییەی پڕ کردەوە، کە بۆ یەکێکی تریان دانابوو. بەیانییان، مارگرێت قاوە و تۆستی بۆ ئێدی ئامادە دەکرد و دواتریش ئێدی مارگرێتی دەبرد بۆ سەر ئیشەکەی – کە کارگوزاری بوو – ئینجا دەگەڕایەوە بۆ شاری یارییەکە. هەندێک جار، لە دوانیوەڕۆیاندا، مارگرێت زوو دەستی

هەڵدەگرت و دەهات لەگەڵ ئێدی پیاسەیەکی بەسەر ڕێگە دارینەکەدا دەکرد، یان لەگەڵیدا سواری یاریی بابەخولێی ئەسپ یان یاریی دەمەشوفڵ دەبوو، ئێدییش بۆخۆی گوێی لە گرمەگرمی یارییەکان دەگرت و باسی چۆنێتیی کارکردنی کێبڵ و ڕۆت و شتی وای بۆ مارگرێت دەکرد.

ئێوارەیەکی مانگی تەمموز، ئێدی و مارگرێت بە کەناردەریاکەدا، بە پێی پەتی پیاسەیان دەکرد، لە خوارەوە قاچەکانیان دەچەقینە لمە تەڕەکەوە و لە سەریشەوە چلوورەیان دەخوارد. هەردووکیان سەیرێکی چواردەوری خۆیان کرد و تێبینییان کرد بەتەمەنترین دوو کەسی سەر کەنارەکە ئەوانن.

مارگرێت شتێکی دەربارەی ئەو جلوبەرگە ڕووتانە گوت، کە کچە گەنجەکان لەسەر کەنارەکە بۆ مەلە لەبەریان کردبوون، گوتیشی کە ئەو خۆی هەرگیز ئامادە نەبوو شتی وا لەبەر بکات. ئێدی وەڵامی دایەوە و پێی گوت، کە کچەکانی سەر کەنارەکە بەختیان هەبوو، چونکە ئەگەر مارگرێت جلی وەک ئەوەی ئەوانی لەبەر بکردایە، ئەوا یەک پیاو سەیری ئەو کچانەی نەدەکرد. هەرچەندە ئەو کاتە مارگرێت چووبووە ناوەڕاستی چلەکانی تەمەنییەوە و سمتەکانی پان بووبوون و ڕیزێک هێڵی بچووکیش لەدەوری چاوەکانی دروست بووبوون، بەڵام هێشتا سوپاسێکی گەرمی ئێدیی کرد و سەیرێکی لووتە چەماوەکەی و شەویلگە پانەکەی کرد. بەم شێوەیە، دووبارە بارانی خۆشەویستییەکەیان لە سەرەوە دای کردەوە و سەرتاپا شەڵاڵی کردنەوە، هەر وەک چۆن دەریاکەی ژێر پێیان قاچەکانیانی خووساندبوو.

ئێدی، تەنانەت دوای مردنی دایکیشی، شوقەکەیانی هێشتەوە و نەیفرۆشت، لەبەر ئەوەی مارگریت دەیگوت ئەو شوقەیە ئەو کاتەی بیر دەهێنایەوە، کە گەنج بوون، زۆریشی پێ خۆش بوو کە هەر لە پەنجەرەکەی مەتبەخی ئەو شوقەیەوە دەیتوانی سەیری یاریی بابەخولێی ئەسپەکە بکات. ڕۆژێکیان، دوای سێ ساڵ لەو ڕۆژەی ئێدی و مارگریت لەسەر کەنارەکە بەسەریان برد، مارگریت لە مەتبەخی شوقەکەیاندا خەریک بوو کنتاکیی مریشکی ئامادە دەکرد، لەناکاو، بەبێ هیچ نیشانەیەکی پێشوەختە، پەنجەکانی دەستی ڕاستی کرانەوە و بەرەو دواوە هەڵگەڕاندەوە. مارگریت دەستی بۆ نەدەنووقێندرایەوە. پارچەمریشکەکە لەسەر لەپی دەستی خزا و کەوتە ناو سینگەکەوە. دەماری قۆڵی لێی دەدا، هەناسەدانی خێرا بووبوو. مارگریت بۆ ساتێک لە دەست و پەنجە کراوەکانی خۆی ڕاما. پەنجەکانی بەجۆرێک کرابوونەوە و بۆ دواوە پێچیان کردبووەوە، کە دەتگوت هیی کەسێکی ترن و لە بەردەمی مارگریتدا شووشەیەکی مرەبای نەبینراویان هەڵگرتووە. دوای ساتێک، مارگریت هەموو شتێک لە بەرچاوی ڕەش بوو.

مارگریت هەر ئەوەندەی توانی بانگی مێردەکەی بکات و بڵێت، "ئێدییی؟" بەڵام پێش ئەوەی ئێدی بگاتە سەری، مارگریت بەبووراوەیی لەسەر زەوییەکە کەوتبوو.

پزیشکەکان گوتیان لوو لە مێشکیدایە. خراپبوونی باری تەندروستیی مارگریت، بە هەمان شێوەی خراپبوونی

باری تەندروستیی ئەو کەسانە بوو، کە ئەو نەخۆشییەیان هەبوو: سەرەتا هەندێک دەرمانی وەر گرت، کە تا ڕادەیەک کاریگەریی نەخۆشییەکەیان کەم کردەوە، دواتر قژی بە تۆپەڵ هەڵدەوەری، بەیانییانەکانی لەگەڵ ئامێری تیشکە دەنگناخۆشەکەدا بەسەر دەبرد و ئێوارانیش لە تەوالێتی نەخۆشخانەکەدا دەڕشایەوە.

لە دواڕۆژەکانی جەنگەکەدا - کە شێرپەنجە تیایدا وەک *براوە* ناوی ئاشکرا کرا - پزیشکەکان تەنیا یەک شتیان بە مارگرێت گوت، ئەویش "پشوو بدە و ئاسایی وەری بگرە" بوو. کاتێک مارگرێت پرسیاری لە پزیشکەکان دەکرد، هەموو بەبەزەییپێداهاتنەوەوە سەریان دەلەقاند، وەک ئەوەی سەرلەقاندنەکەیان دەرمان بێت و دڵۆپبەدڵۆپ بیدەن بە مارگرێت. مارگرێت تێگەیشت ئەمە پرۆتۆکۆڵێکە و پزیشکەکان جێبەجێی دەکەن، پرۆتۆکۆڵی ئەوەی لەگەڵ مارگرێتدا زۆر باش بن، لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی زۆری بۆ بکەن. کاتێک یەکێک لە پزیشکەکان بە مارگرێتی گوت، "بە کاروبار و پەیوەندییەکانتدا بچۆرەوە و ڕێکیان بخەرەوە،" دەستبەجێ مارگرێت داوای کرد لە نەخۆشخانە دەری بکەن. لە ڕاستیدا، قسەکەی زیاتر لە فەرمان دەچوو وەک لە داواکاری!

ئێدی مارگرێتی هەڵگرت و بە پلیکانەکاندا بردیە سەرەوە، لە سەریشەوە خێرا قاپووتەکەی لەبەر داکەند و بۆی هەڵواسی. مارگرێت چاوی بە شوقەکەدا دەگێڕا. سەرەتا ویستی چێشت لێبنێت، بەلام ئێدی دای نیشاند و چاییەکی بۆ لێنا. ئێدی ڕۆژی پێشتر گۆشتی بەرخی کڕیبوو، ئەو

ئێوارەیە خۆی و چەند هاوڕێ و هاوپیشەیەکی بەشلەژاوی ئەو نانی ئێوارەیەیان بەسەر برد. زۆربەی میوانەکان بە ڕستەی وەک "سەیر بکەن کێ هاتۆتەوە!" سڵاویان لە مارگرێت و دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەکەی دەکرد، وەک ئەوەی هاتنەوەی مارگرێت بۆ ماڵەوە، ئاهەنگی یەکتربینینەوە بێت نەک ئاهەنگی ماڵئاوایی.

هەموو میوانەکان گۆشت و پەتاتەی هاڕاویان لەسەر قاپی سیرامیک خوارد و دوای نانخواردنیش *کێکی براونیان* خوارد. کاتێکیش مارگرێت دووەم پەرداخ شەرابی هەڵدا، ئێدی دەستی برد شووشە شەرابەکەی هەڵگرت و پەرداخەکەی بۆ پڕ کردەوە.

پاش دوو ڕۆژ، بەرەبەیان مارگرێت بەهاوارەوە لەخەو ڕاپەڕی. لە بێدەنگیی ئەو بەیانییە زووەدا، ئێدی بەپەلە گەیاندیە نەخۆشخانە. ئێدی و مارگرێت بە ڕستەی کورت لەگەڵ یەک دەدوان: *دەبێ پزیشکی ئێشککر کێ بێ، دەبێ ئێدی تەلەفۆن بۆ کێ بکا*، ئەم پرسیار و وەڵامە کورتانە. هەرچەندە مارگرێت لەتەنیشت ئێدییەوە دانیشتبوو، بەڵام ئێدی لە هەموو شتێکدا هەستی بە بوونی هاوسەرەکەی دەکرد: لە سووکانەکەدا، لەسەر سکلێتەری بەنزینەکە، لە چاوترووکاندن و قوڕگپاککردنەوەکانیدا. مەبەست لە هەرشتێک کە ئێدی لەو کاتەدا دەیکرد، ئەوە بوو دەستی لە دەستی مارگرێت بەر نەبێت.

مارگرێت چلوحەوت ساڵ بوو. لە ئێدیی پرسی، "کارتەکەت پێیە؟"

ئێدی بەبێتاقەتییەوە گوتی، "کارتی چی؟"

مارگرێت هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چاوەکانی داخست، کاتێک دەستی بە قسە کردەوە، دەنگی لاوازتر دەهاتە بەرگوێ، وەک ئەوەی ئەو هەناسەهەڵکێشانە زۆر لەسەری کەوتبێت.

مارگرێت بە دەنگێکی نزمی زیقن گوتی، " کارتی بیمەی تەندر..."

ئێدی خێرا گوتی، "ئا! ئا! پێمە."

لە گەراجی نەخۆشخانەکە وەستان. ئێدی لاداکەی کوژاندەوە. دونیا زۆر خامۆش بوو، ئەوەندە خامۆش، کە ئێدی گوێی لە هەموو دەنگەکانی ئەو ناوە بوو: دەنگی خشانی جەستەی لە کوشنەکە، دەنگی قرتەی دەسکی دەرگای لای شۆفێر، خشەخشی کزەباکەی دەرەوە، دەنگی هەنگاوەکانی خۆی لەسەر قیرەکە و دەنگی خرینگەی کلیلەکانی.

ئێدی دەرگاکەی بۆ مارگرێت کردەوە و یارمەتیی دا دابەزێت. مارگرێتیش - وەک منداڵێک کە خەریک بێت ڕەق ببێتەوە - شانەکانی تا ئاستی شەویلگەی بەرز کردبووەوە و قژی هاتبووە سەر دەموچاوی. مارگرێت لووشکەیەکی کرد و سەری بەرز کردەوە تا سەیری ئەو ئاسۆیە بکات، کە لێی دیار بوو. لەو ساتەدا، دەستی بۆ بەشی سەری سەرەوەی یارییەکی بەرزی سپی، کە کورسیی سوور وەک تۆپی ڕازاندنەوەی داری سەری ساڵ پێیەوە ڕادەژەنین، ڕاکێشا و سەرێکی لەقاند، "ئەها! لێرەوە دیارە!"

ئێدی گوتی، "*یاریی چەرخوفەلەکـ*ـەکە دەڵێی؟"

مارگرێت ڕووی وەر گێڕا، "نا،ماڵەوە!"

ئێدی، لەبەر ئەوەی تا ئەم کاتە لە بەهەشتدا نەخەوتبوو، وای دەزانی لەگەڵ هەریەکێک لەو کەسانەی بینیبوونی، چەند کاتژمێرێک زیاتری بەسەر نەبردووە، بەڵام بەبێ شەو و ڕۆژ، بەبێ خەوتن و خەبەربوونەوە، بەبێ خۆرهەڵهاتن و بەبێ بەرزەشەپۆل، بەبێ نانخواردن و بەرنامەی ڕۆژانە، ئیتر چۆن بیزانییایە چەندەی لەگەڵیان بەسەر بردووە؟

ئێدی لەگەڵ مارگرێتدا تەنیا کاتی دەویست، کاتی زیاتر و زیاتر و هیچی تر نا، پێشی بەخشرابوو. شەو و ڕۆژ و ڕۆژ و شەوی تری پێ بەخشرابوو. ئێدی و مارگرێت خۆیان دەکرد بەناو دەرگای ئاهەنگە جیاجیاکاندا و ئێدییش بەدەم ڕۆیشتنەوە باسی هەموو ئەو شتانەی بۆ مارگرێت دەکرد، کە ئارەزووی بوو باسیان بکات. لە بۆنەیەکی سویدییەکاندا، ئێدی باسی جۆری برای بۆ مارگرێت کرد، کە دە ساڵ پێش خۆی و مانگێک دوای کڕینی ڤێلا تازەکەی لە فلۆریدا بە جەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کردبوو. لە بۆنەیەکی ڕوسییەکاندا، مارگرێت دەربارەی شوقە کۆنەکەیان پرسیاری لە ئێدی کرد و ویستی بزانێت ئێدی فرۆشتبووی یان نا، ئێدی بە مارگرێتی ڕاگەیاند، کە نەیفرۆشتبوو، مارگرێتیش ئەوەی پێ خۆش بوو. لە بۆنەیەکی تردا - کە لە دەرەوە و لە گوندێکی لوبنانی ساز کرابوو - ئێدی باسی ئەو شتانەی بۆ مارگرێت کرد، کە لە بەهەشتدا بەسەری هاتبوون، کاتێکیش قسەی دەکرد، لە یەک کاتدا مارگرێت وا دەر دەکەوت هەم گوێشی گرتبێت و هەم خۆشی پێشتر ئەو شتانەی زانیبێت. ئێدی باسی پیاوە شینەکە و چیرۆکەکەی بۆ مارگرێت کرد،

باسی ئەوەی کرد، کە بۆچی هەندێک دەمرن و هەندێکی تر لە ژیان بەردەوام دەبن، ئینجا باسی کاپتنەکە و چیرۆکی قوربانیدانەکەی بۆ کرد. کاتێکیش ئێدی هاتە سەر باسی باوکی، مارگرێت هەموو ئەو شەوانەی بیر هاتەوە، کە ئێدی زۆر زۆر لە باوکی پەست بووبوو، ئەوەشی بیر کەوتەوە، کە بێدەنگییەکەی باوکی چەندە ئێدیی بێزار کردبوو. ئێدی بە مارگرێتی گوت، کە هەموو شتێکی لەگەڵ باوکی هێناوەتەوە جێی خۆی، بە بیستنی ئەوەش، مارگرێت لە خۆشیدا برۆکانی بەرز بوونەوە و لێوەکانی کشان. لەم ساتەدا، ئێدی هەستێکی زۆر خۆش و ئاشنای بۆ دروست بووەوە، هەستێک، کە چەندین ساڵ بوو بۆی دروست نەبووبوو، ئەویش هەستی دڵخۆشکردنی هاوسەرەکەی بوو.

شەوێکیان، ئێدی باسی گۆڕانکارییەکانی شاری یاریی رووبی کرد، باسی ئەوەی کرد، کە چۆن یارییە کۆنەکان لا برابوون و یاریی تازە جێی گرتبوونەوە، باسی ئەوەی کرد، چۆن مۆسیقای رۆک ئەند رۆڵ جێی بەو شمشاڵە چۆڵ کردبوو، کە لە هۆڵی داخراوی یارییەکاندا لێدەدرا، هەروەها باسی ئەوەی چۆن یاریی رەورەوەی مەرگ هەڵگەڕانەوە و پێچی قورسی تێ کەوتبوو، ناوبەناویش نەفەرەکانی سەرەونوقوم دەکرد، ئێدی باسی ئەوەی کرد، چۆن یارییە "ترسناکەکان،" کە کاتی خۆی وێنەی گاوانیان تێدا بوو و بە بۆیەی درەوشاوە کرابوون، ئێستا گۆڕابوون بە سکرینی گەورە و کاتێک دەچوویت بۆ شاری یارییەکە، وەک ئەوە وا بوو بەردەوام سەیری تەلەفزیۆن بکەیت.

یاریی کورسیی فڕیو و یاریی زریان و ئەو جۆرە

یارییانە هیچیان نەمابوون، بۆیە ئێدی ناوە تازەکانی بە مارگرێت دەگوت. ئێستا باو باوی هەندێک ناوی تازەی وەک *خلیسکێنەی ئاو ئاو* و *یاریی گێژکەر* و *یاریی فڕۆکەی جەنگی* و *یاریی گێژەڵووکە* بوو.

ئێدی گوتی، "سەیرە، ها؟"

مارگرێت بەدەم بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە گوتی، "دەڵێی باسی هاوینی ژیانی کەسێکی ترم بۆ دەکەی، نەک هی خۆت!"

دەستبەجێ ئێدی تێگەیشت، کە ئەو قسەیەی مارگرێت بەتەواوی ئەو شتە بوو، کە ئێدی خۆی بۆ ماوەی چەندین ساڵ بوو هەستی پێ کردبوو.

ئێدی بە مارگرێتی گوت، "دەزانم، دەبووایە ئیتر لە شوێنێکی تر ئیش بکەم، بەڵام بەداخەوە، نەمتوانی ئەو شاری یارییە بەجێ بهێڵم. ئەوە باوکم، ئەوە قاچە شەلەکەی خۆم... دوای جەنگ هەمیشە هەستم بە نەگبەتی و داماوی دەکرد."

ئێدی خەمبارییەکی بینی بەسەر دەموچاوی مارگرێتدا هات و ڕۆیشت.

مارگرێت پرسیی، "لە ماوەی ئەو جەنگەدا چی ڕووی دا؟"

ئێدی هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارەی بەتەواوی نەدابوو بە مارگرێت، خۆی شتەکان ڕوون بوون. لەو سەردەمەی ئێدیدا، سەربازەکان ئەوەیان دەکرد کە دەبوو بیکەن، ئەویش ئەوە بوو، هەر کە دەگەیشتنەوە نیشتمان، ئیتر بە هیچ شێوەیەک باسی بابەتی جەنگیان لای هیچ کەسێک نەدەکردەوە. ئێدی بیری لەو پیاوانە کردەوە، کە کوشتبوونی، لەو سەربازانەی

لەلایـان زیندانـی بـوو، لـە خوێنـی سـەر دەسـتەکانی خـۆی... لـەوەش، کـە تـۆ بلێی هەرگیز لێخۆشـبوون بیگرێتـەوە.

ئێدی گوتی، "خۆمم ون کرد."

هاوسەرەکەی گوتی، "نا، وا نییە."

ئێدی بەچرپە گوتی، "با، وایە."

مارگرێت هیچی تری نەگوت.

جارجارە، لـەوێ، لـە بەهەشـت، ئێدی و مارگرێت بەتەنیشـت یەکـەوە پـاڵ دەکەوتـن، بـەڵام نەدەخەوتـن. مارگرێـت باسـی ئـەوەی کـرد، کـە لەسـەر زەوی، کاتێـک خـەوت لـێ دەکەوێـت، هەندێـک جـار خـەو بـە بەهەشـتەکەی خۆتـەوە دەبینـی و دواجاریـش ئـەو خەونانـە یارمەتیـت دەدەن تـا بەڕاسـتی ئـەو بەهەشـتە بـۆ خـۆت دروسـت بکەیت، بـەڵام لـە بەهەشـت، هیـچ هۆکارێـک نییـە تـا ئـەو جـۆرە خەونانـە ببینیـت.

ئێـدی شـانی مارگرێتـی گـرت و زۆر بەقووڵـی بۆنـی قـژی کـرد. دوای ماوەیـەک، ئێـدی پرسـیاری لـە هاوسـەرەکەی کـرد دەربـارەی ئـەوەی ئایـا خـودا دەزانێت ئێدی هاتـووە بـۆ ئـەوێ، مارگرێتیـش بەزەردەخەنـەوە وەڵامـی دایـەوە و گوتـی، "بەدڵنیاییـەوە دەزانـێ." هەرچەنـدە دواتـر ئێدی لای مارگرێت دانـی بـەوەدا نـا، کـە بـۆ ماوەیـەک لـە ژیانیـدا خـۆی لـە خـودا شـاردووەتەوە، دوای ئـەوەش تـا کاتـی مردنـی هـەر پێـی وا بـووە، کـە خـودا نایبینێـت و ئـاگای لێـی نەمـاوە.

## وانەی چوارەم

دوای چەندین گفتوگۆ، دواجار مارگرێت ئێدیی بەناو دەرگایەکی تریشدا برد. دووبارە بەجووتە هاتنەوە ناو ژوورە بازنەییە بچووکەکەوە. مارگرێت لەسەر کورسییە ستوولەکە دانیشت و پەنجەکانی هەردوو دەستی خستە سەر یەک، ئینجا ئاوڕی دایەوە بۆ ئاوێنەکە. ئێدی دەرچوونەوەی ڕوخساری مارگرێتی لە ئاوێنەکەدا بینی، بەڵام هیی خۆی نەبینی.

مارگرێت لە بەردەم ئاوێنەکەدا دەستێکی بە قژیدا هێنا و سەیرێکی خۆی کرد، پاشان – لە کاتێکدا وا دەر دەکەوت خەیاڵی ڕۆیشتبێت - گوتی، "بووک لێرە چاوەڕێ دەکات. ئەمە ئەو ساتەیە، کە تیایدا بیر لەو کارە دەکەیتەوە، کە خەریکە بیکەی، بیر لەو کەسە دەکەیتەوە، کە هەڵیدەبژێری و خۆشت دەوێ. ئێدی گیان! ئەگەر لەو هەڵبژاردنەدا ڕاست بکەی، ئەوە ئەم ساتە دەبێ بە ساتێکی زۆر نایاب بۆت."

مارگرێت لای کردەوە، "بۆ چەندین ساڵ ناچار بووی بەبێ خۆشەویستی بژیت، وا نییە؟"

ئێدی هیچی نەگوت.

"هەستت دەکرد خۆشەویستیت بەزۆر لێ فڕێندراوە، هەستت دەکرد من زۆر زوو جێم هێشتووی."

ئێدی بەهێمنی خۆی نرم کردەوە. عەزییە مۆرە کاڵە درێژەکەی مارگرێت لە بەردەمیدا پەخشان بووبوو.

ئێدی گوتی، "هەر بەڕاستی زۆر زوو ڕۆیشتی."

"لێم پەست بووی؟"

"نەخێر."

مارگرێت چاوەکانی زەق کرد.

ئێدی خێرا گوتی، "ئێ باشە، بەڵێ."

مارگرێت گوتی، "هەموو ئەوانە هۆکاری خۆیان هەبوو."

ئێدی گوتی، "هۆکاری چی؟ چ وانەیەک لەوەدا هەیە؟ تۆ بە چلوحەوت ساڵی مردی، باشترین کەس و ناسیاوی ئێمە بووی، بەڵام مردی و ژیانت بە هەموو شتەکانی ناویەوە لەدەست چوو. منیش هەموو شتێکم لەدەست چوو، ئەو تاقە کچەم لەدەست چوو، کە لە ژیانمدا خۆشم ویستبوو."

مارگرێت دەستەکانی ئێدیی گرت، "نەخێر، لەدەستت نەچوو، من لێرە بووم و تۆش بەردەوام لەوێوە خۆشت دەویستم.

"خۆشەویستیی لەدەستچووش هێشتا هەر خۆشەویستییە، بەڵام لە فۆڕمێکی تردا، جیاوازییەکە هەر ئەمەندەیە و هیچی تر. دوای ئەوەی خۆشەویستەکەت دەڕوا، ئیدی ناتوانی زەردەخەنەکەی ببینی، یان خۆراکی بۆ بهێنی، یان دەست بە قژیدا بهێنی، یان لەسەر سەکۆیەک سەمای لەگەڵ بکەی، بەڵام کاتێکیش ئەو شتانە نامێنن، شتێکی نوێ دروست دەبێ، کە ئەویش *یادەوەرییە*. ئیتر لەوەبەدوا یادەوەری دەبێتە هاوسەرت و دەیلاوێنیتەوە، باوەشی دەکەی و سەمای لەگەڵ دەکەی.

"ژیان هەر دەبێ تەواو ببێ، بەڵام خۆشەویستی نا."

ئێدی بیری لە ساڵەکانی دوای مردنی مارگرێت کردەوە، کە وەک ئەوە وا بوون لەسەر پەرژینێکەوە سەیری شوێنێکی دوور بکەیت. ئێدی دەیزانی لەولاتر، ژیانێکی جیاواز هەیە، بەڵام هەمیشە وای دانابوو، کە ئەو هەرگیز نابێت بە بەشێک لەو ژیانە.

ئێدی بەهێمنی گوتی، "دوای تۆ، کەسی ترم نەویست."

مارگرێت گوتی، "دەزانم."

"ئەو کاتەش هەر تۆم خۆش دەویست."

مارگرێت سەری لەقاند، "دەزانم، هەستم پێ دەکرد."

ئێدی پرسیی، "لێرەوە؟"

مارگرێت بەزەردەخەنەوە وەڵامی دایەوە، "بەڵێ، تەنانەت لێرەشەوە. خۆشەویستیی لەدەستچوو دەتوانێ ئەمەندە بەهێز بێ!"

مارگرێت هەستایە سەر پێ، دەرگایەکی کردەوە و خۆی پێدا کرد، ئێدییش بەچاوتروکانەوە بەدوایدا ڕۆیشت. هەردووکیان چوونە ژوورێکی کەمێک تاریکەوە. ژوورەکە لەو کورسییانەی تێدا بوو، کە دەکرێنەوە و دادەخرێنەوە، ئۆکۆردیۆنژەنێکیش لە سووچێکدا دانیشتبوو.

مارگرێت گوتی، "ئەم ژوورەیانم هەڵگرتبوو بۆ ئێستا."

مارگرێت قۆڵەکانی بڵاو کردەوە و ئێدییش بۆ یەکەمین جار لە بەهەشت، دەستپێشخەریی کرد و بەرەو مارگرێت هەنگاوی ناو لێی نزیک بووەوە. ئێدی قاچە شەلەکەی و هەموو ئەو شتە ناخۆشانەشی کە بە سەما و مۆسیقا و زەماوەندەکانەوە بەستبوونیەوە، پشتگوێ خست، چونکە

بۆی دەر کەوت، لەسەر زەوی هۆکاری هەموو ئەو شتانە تەنیاییەکەی بوو.

ماگریت گوتی، "بەس لە دومبەڵەی کەمە، ها!"

ئێدی سووکەپێکەنینێک گرتی و دەستێکی لە ناوقەدی مارگرێت ئالاند، ئینجا گوتی، "دەتوانم شتێکت لێ بپرسم؟"

"بەڵێ."

"چۆنە تا ئێستاش بەتەواوی لەو ڕۆژە دەچی، کە هاوسەرگیریم لەگەڵ کردی؟"

"پێم وا بوو تۆ حەز دەکەی ئاوا بمبینی."

ئێدی بۆ ساتێک بیری کردەوە، "ئەی دەتوانی بیگۆڕی."

مارگرێت کەیفی بە پرسیارەکە هات، "بیگۆڕم؟ بیگۆڕم بۆ چی؟"

"بۆ شێوە و ڕوخساری کۆتاییی تەمەنت."

مارگرێت قۆڵەکانی کەمێک هێنایە خوارەوە، "ئاخر ئەو کاتە زۆر جوان نەبووم."

ئێدی سەرێکی با دا، وەک ئەوەی بڵێ شتی وا ڕاست نییە.

"ئێستا پێم بڵێ دەتوانی بیگۆڕی؟"

مارگرێت ساتێکی وەر گرت، ئینجا هاتەوە ناو باوەشی ئێدی. ئۆکۆردیۆنژەنەکە دەستی کرد بە ژەنینی ئاوازێکی ئاشنا بە گوێیەکانی مارگرێت و ئێدی. مارگرێت کەوتە گمەگم بە گوێی ئێدیدا و هەردووکیان بەجووتە و بەهێواشی کەوتنە سەما، سەمایەکی خاو و ئاشنا، کە مێرد تەنیا لەگەڵ هاوسەری خۆیدا دەیکات. گمەگمەکەی مارگرێت بوو بە گۆرانی:

تۆ وات کرد خۆشم بوێیت
من ئەوەم نەدەویست
من ئەوەم نەدەویست
تۆ وات کرد خۆشم بوێیت
تۆش خۆشت باش دەتزانی
تۆ خۆشت باش دەتزانی...

کاتێک ئێدی سەری هێنایەوە دواوە. بینیی مارگرێت دووبارە بووەتەوە بە چلوحەوت ساڵ، هێڵەکان لەدەوری چاوەکانی دەر کەوتوونەتەوە، قژی تەنکتر بووەتەوە و پێستی چەناگەشی کەمێک شۆڕ بووەتەوە. مارگرێت پێکەنی و ئێدییش بەدوایدا پێکەنییەوە. لای ئێدی، مارگرێت وەک هەمیشە شۆخوشەنگ بوو. ئێدی چاوەکانی داخست و بۆ یەکەمین جار ئەو شتەی درکاند، کە لە یەکەم ساتی بینیی مارگرێتەوە لە بەهەشت لە ناخیدا هەڵی گرتبوو، "نامەوێ لەمە زیاتر بڕۆم، دەمەوێ لێرە، لای تۆ بمێنمەوە." کاتێک ئێدی چاوەکانی کردەوە، هێشتا شێوەی وەستانی جەستەی مارگرێت لەنێوان قۆڵەکانیدا مابوو، بەڵام مارگرێت خۆی و هەموو شتەکانی تریش ون بووبوون.

## هەینی، ۳:۱٥ی پاشنیوەڕۆ

دۆمینگێز دەستی بە دوگمەی بەرزکەرەوەکەدا نا و دەرگاکە داخرایەوە. پەنجەرەیەکی بچووک لەسەر ڕووی بەرزکەرەوەکە بوو. وردەوردە بەرز بووەوە و دۆمینگێز لە شووشەی لێڵی پەنجەرە بچووکەکەوە هەر لە دالانەکەی دەڕوانی، تا ئەو کاتەی لە بەرچاو ون بوو.

دۆمینگێز گوتی، "زۆر سەیرە تا ئێستاش ئەم بەرزکەرەوەیە هەر ئیش دەکا. وا بزانم تەمەنی هەزار ساڵ دەبێ."

پیاوەکەی تەنیشتی، کە پارێزەرێکی موڵکدارێتی بوو، سەرێکی لەقاند و خۆی وا نیشان دا قسەکەی دۆمینگێزی پێ خۆش بووە، ئینجا کڵاوەکەی داکەند - شوێنەکە داخراو بوو، سەری پیاوەکە ئارەقەی کردبووەوە - پاشان سەیری ئەو ژمارانەی کرد، کە لەسەر شاشەی بەرزکەرەوەکە زیادیان دەکرد. ئەمە سێیەم دانیشتنی پارێزەرەکە بوو لەگەڵ داواکارەکانی ئەو ڕۆژەی و یەک دانەی تر و دەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە.

دۆمینگێز گوتی، "ئیدی موڵک و ماڵی زۆری نەبوو."

پارێزەرەکە بە کلینێکسێک ناوچاوانی سڕی و گوتی، "ئێ، ئێ، باشە. کەواتە زۆرمان پێ ناچێ."

بەرزکەرەوەکە وەستا و دەرگاکەی کرایەوە. دۆمینگێز و پارێزەرەکە خۆیان کرد بە *شوقەی 7 بی*دا. ڕاڕەوەکە هێشتا هەر کاشییە ڕەش و سپییە شەترەنجییەکانی سالانی شەستەکان بوو، بۆنی چێشتی ماڵێکیشی لێ دەهات - بۆنی سیر و پەتاتەی سوورەوەکراو. لێپرسراوی بیناکە پێشتر کلیکی ژوورەکەی دابوونێ و چوارشەممەی دواتریشی بۆ دیاری کردبوون وەک دوامۆڵەت بۆ گەڕاندنەوەی و چۆڵکردنی شوقەکە بۆ کەسێکی تر.

دۆمینگێز، لەگەڵ کردنەوەی دەرگای مەتبەخەکە و چوونە ژوورەوەیدا، گوتی، "تۆ سەیر بکە! لەچاو ئەوەدا کە پیرەمێردێکی هەشتا ساڵەی تێدا ژیاوە، زۆر پاکوخاوێنە."

سینکەکە پاک بوو، کەوانتەرەکە سڕابووەوە. دۆمینگێز لە دڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە، کە مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت ئێستا ماڵەکەی خۆی چەندە پیسە.

پارێزەرەکە پرسیاری لە دۆمینگێز کرد، "نووسراوەکان لەکوێن؟ نووسراوی بانک یان ئاڵتوون و خشڵ و شتی وای هەبووە؟"

دۆمینگێز ئێدیی بە ئاڵتوون و خشڵەوە هێنایە پێشچاوی خۆی و زەردەخەنە گرتی. لەو ساتەدا هەستی کرد زۆر بیری ئەو پیرەمێردە کۆچکردووە دەکات و زۆریش نامۆ بوو لەلای، کە ئیتر ئەو پیرەمێردە نەدەگەڕایەوە بۆ شاری یارییەکە، تا بنەڕێنێ و فەرمان دەر بکات، یان وەک هەڵۆیەکی دایکە چاو بگێڕێت و لە هەموو شتێک ورد ببێتەوە. لۆکەرەکەی ئێدی بەتاڵ نەکرابووەوە، کەس دڵی نەهاتبوو ئەو ئیشە بکات، بۆیە کەلوپەکانی ئێدی هەر لە وەرشەکە بوون، وەک ئەوەی ئێدی سبەینێ بگەڕێتەوە.

"نازانم، ئەو شتەی ژووری خەوتنەکە گەڕای؟"

"مێزەکە دەڵێی؟"

"بەڵێ... من خۆشم یەک جار هاتووم بۆ ئێرە. ئیدییم هەر لە ڕێی ئیش و ئەوانەوە ناسیوە."

دۆمینگێز خۆی بەسەر مێزی نانخواردنەکەدا چەماندەوە و لە پەنجەرەی مەتبەخەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کرد. یاریی بابەخولێی ئەسپەکەی بینی، ئینجا سەیرێکی کاتژمێرەکەی دەستی کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی، "ئاگام لە ئیشەکەم بێ، درەنگ نەبێ."

پارێزەرەکە یەکەم چەکمەجەی ئەو مێزەی کردەوە، کە لە ژووری خەوتنەکەدا دانرابوو. بە دەست، جووتە گۆرەوییەکانی ئێدی، کە زۆر بەڕێکوپێکی هەڵگیرابوون و هەرتاکە خرابووە تاکەکەی ترەوە، بردە ئەولاوە، ئینجا شۆرتە سپییە فشەکانی، کە بەجوانی لەسەر یەک قەد کرابوون. قووتوویەکی بچووکی تەختە لەژێر شۆرتەکانەوە بوو. لەوە دەچوو شتێکی گرنگ بێت. پارێزەرەکە، بەو هیوایەی خێرا ئەو شتانە بدۆزێتەوە کە بۆیان دەگەڕا، دەستبەجێ قووتووەکەی کردەوە، بەڵام هیچی گرنگی وای تێدا نەبوو، هیچ نووسراوێکی بانکیی یان نووسراوێکی دڵنیاییی داراییی تێدا نەبینی. ئەو شتانەی لە قووتووەکەدا بوون، بریتی بوون لە پاپیۆنێکی ڕەش، مینیۆی خۆراکەکانی ڕێستورانێکی چینی، دەستەیەک کۆنکەنی کۆن، نامەیەک بە مەدالیایەکی سەربازییەوە، وێنەیەکی کاڵبووەوەی گیراو بە کامێرایەکی پۆلەراید - کە وێنەی پیاوێک بوو لە ناوەڕاستی کۆمەڵێک منداڵدا و کێکێکی یادی لەدایکبوون لە بەردەمیدا دانرابوو.

دۆمینگێز لە ژوورەکەی ترەوە هاواری کرد، "ئەرێ دەڵێم... بەدوای ئەم شتەدا دەگەڕێی؟"

دۆمینگێز بە خۆی و یەک باوەش نامەوە، کە لە چەکمەجەیەکی مەتبەخەکە دۆزیبوونیەوە، لە مەتبەخەکەوە دەر کەوت. هەندێک لە نامەکان هیی بانکێکی ناوخۆیی بوون و هەندێکیشیان لە *بەڕێوەبەرایەتیی سەربازە دێرینەکانەوە* نێردرابوون. پارێزەرەکە چاوێکی پێیاندا گێڕا و بەبێ ئەوەی سەر هەڵببڕێت گوتی، "ئەوەیان بەکەڵکی ئیشەکەی ئێمە دێ." ئینجا یەکێک لە نامەکانی بانکەکەی دەر هێنا و هەر بە چاوخشاندن بڕەپارەی سەر حیسابەکەی لەبەر کرد، پاشان، هەر وەک چۆن زۆر جار لەو جۆرە سەردانانەدا ڕووی دەدا، پارێزەرەکە لەژێر لێوەوە پیرۆزباییی لە خۆی کرد لەسەر ئەوەی چەندین پشک و گرێبەندی هەبوو، لەگەڵ بەرنامەیەکی خانەنشینبوونی توندوتۆڵیش. بێگومان، ئەمانەش لە ئاییندەدا نەیاندەهێشت ئەو پارێزە وەک ئەم پیرەمێردە داماوەی لێ بێت، کە جگە لە مەتبەخێکی پاکوخاوێن، هیچی تری نەبوو پیشانی خەڵکی بدات.

## پێنجەم کەس، کە ئێدی لە بەهەشت دەیبینێت

تا چاو بڕی دەکرد، ڕەنگی سپی بوو، تەنیا ڕەنگی سپی و هیچی تر، نە زەوی هەبوو، نە ئاسمان، نە ئاسۆیەکیش لەنێوان ئەو دووانەدا. ئەوەی هەبوو، تەنیا ڕەنگێکی سپیی بێگەرد و بێدەنگ بوو، بێدەنگ وەک بەفری باریوی بەر تیشکی خۆری گزنگێک.

ئێدی تەنیا ڕەنگی سپیی دەبینی، تاکە شتێکیش کە گوێی لێی بوو هەناسە قورسەکانی خۆی بوون، کە لەو بێدەنگییە قووڵەدا دەنگیان دەدایەوە. بۆیە ئێدی کە هەناسەیەکی هەڵمژی، گوێی لە هەناسەهەڵمژینێکی تریش بوو، کە هەناسەی دایەوە، گوێی لە هەناسەدانەوەیەکی تریش بوو.

ئێدی چاوەکانی توند نووقاند. کاتێک بێدەنگییەک هەیە و تۆش دەزانیت هیچ شتێک نییە بیشکێنێت، بێدەنگییەکە ترسناکتر دەبێت. ئێدییش دەیزانی هیچ شتێک نییە ئەو بێدەنگییە بشکێنێت، کە تێی کەوتبوو. مارگرێت ڕۆیشتبوو، ئێدییش زۆر تامەزرۆی بوو، تامەزرۆی بەسەربردنی یەک خولەکی تر، نیوخولەکی تر، پێنج چرکەی تر لەگەڵی، بەڵام ئێستا ئیتر هیچ ڕێگەیەک نەبوو ئێدی دەستی پێی بگاتەوە، یان بانگی بکات و دەستی بۆ ڕابوەشێنێت، یان تەنانەت سەیری وێنەدانەوەکەشی

بکات لە ئاوێنەیەکدا. ئێدی وای هەست دەکرد لەسەر ڕیزە پلیکانەیەکەوە کەوتبێت و بەتەقلە تا خوارەوە نەوەستابێتەوە. ڕووحی چۆڵوهۆڵ بووبوو، هیچ ویستێکی نەمابوو. لەو بۆشاییە سپییەدا، وەک ئەوەی بووبێت بە قولاپەوە و هەموو تەڕاییی گیانی چۆڕابێتەوە، بەبێ ژیان هەڵواسرابوو. ڕەنگە بۆ ماوەی ڕۆژێک، یان مانگێک، خۆ ڕەنگیشە بۆ ماوەی سەدەیەک بووبێت، بۆخۆی لەوێ بەو شێوەیە هەڵواسرابێت.

دواجار، دەنگێکی نزم، بەڵام ترسناک، ڕایچڵەکاند و بەزەحمەت پێڵووەکانی پێ هەڵبڕی. تا ئێستا ئێدی چوار لە گیرفانەکانی بەهەشت گەڕابوو، چوار کەسی بینیبوو، ڕاستە هەریەک لەو چوار کەسە بە شێوەیەکی سەیر هاتبوونە سەر ڕێی، بەڵام هەستی کرد ئەمەیان هەر زۆر سەیر و جیاوازە.

ئێدی بۆ جاری دووەم هەستی بە لەرزەی دەنگەکە کردەوە. ئەم جارەیان دەنگەکە بەرزتر بوو. ئێدی، کە بەدرێژاییی ژیانی هەمیشە هەستی بەرگریی تیایدا ئامادە بوو، مستەکانی خڕ کرد. هەر لەو ساتەدا هەستی کرد گۆچانێک لەناو لەپی دەستی ڕاستیدایە. قۆڵەکانی هەموو پەڵەی قاوەییی کاڵیان لەسەر دروست بووبوو، نینۆکەکانی بچووک و زەردباو بوون، قاچەکانیشی تلۆقی سووریان کردبوو - ڕێک وەک ئەو تلۆقانەی لە ماوەی هەفتەکانی کۆتاییی ژیانیدا لەسەر زەوی بۆی دروست بووبوون. ئێدی چاوی لەسەر ئەو پیربوونە خێرایەی خۆی لا برد. بەپێی پێوەرەکانی سەر زەوی، ئێستا جەستەی جەستەیەک بوو، کە نزیک بووبێتەوە لە کۆتایی.

دەنگەکە دووبارە هاتەوە، ئەم جارەیان دەنگێکی بەرزی

تێکەڵ بە زریکە و بێدەنگبوونی پچڕپچڕ. ئێدی لە دێوەزمەکانی شەوانیدا، لەسەر زەوی گوێی لەم دەنگە بووبوو، هەموو جارێکیش لەگەڵ بینینی ئەو خەونەدا دەلەزری و گوندەکە و ئاگرەکە و سمیتیی دەهاتەوە بەرچاو، کاتێکیش هەوڵی دەدا قسە بکات، هاوار و قیژەقیژەکە لە قوڕگی خۆیەوە دەهاتە دەرەوە.

ئێدی ددانەکانی خستە سەریەک و جیڕی کردنەوە، وەک ئەوەی دەنگەکە بەوە بوەستێت، بەڵام دەنگەکە، وەک کاتژمێرێک زەنگ لێبدات و کەس نەچێت بەلایەوە، هەر بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی ئێدی هاوارێکی بەناو ڕەنگە سپییە خنکێنەرەکەدا کرد و گوتی، "چییەههه؟ چیت دەوێ؟"

دەنگەکە کەوتە باکگراوندی دەنگێکی ترەوە، کە دەنگی هاژەیەکی بڵاو و خوڕ بوو – لە دەنگی ڕووبار دەچوو. پاشان ڕەنگە سپییەکە کرایەوە و تیشکەکانی خۆرێک کەوتنە سەر ئاوێکی درەوشاوە. لەژێر پێیەکانی ئێدیدا، زەوی دروست بوو، گۆچانەکەشی بەر شتێکی ڕەق کەوت. ئێدی بینیی لەسەر تەپۆڵکەیەکە و شەماڵێک لە دەموچاوی دەدات، تەمێکیش خەریکە پێستی جەستەی شێدار و بەڕەونەق دەکات. ئێدی سەیرێکی خوارەوەی کرد و لە ڕووبارەکەدا سەرچاوەی هاوار و قیژەکانی بینی. ئێدی، بە بینی ئەو دیمەنەی ناو ڕووبارەکە، وەک پیاوێک کە دارێکی بەیسبۆڵی بە دەستەوە گرتووە و دواجار تێدەگات دز نەهاتۆتە سەریان، هێور بووەوە. دەنگەکە، قیژەکە، هاوارەکە، دەنگی منداڵان بوو، منداڵێک و دووان نا، بەڵکوو هەزاران منداڵ، کە بەیەکەوە خەریکی یاری بوون و لە ڕووبارەکەدا شڵپەشڵپیان نابووەوە

و بە پێکەنینێکی پڕ لە پاکێتییەوە دەیانزریکاند.

ئێدی لە دڵی خۆیدا گوتی، "تۆ بڵێی ئەمە ئەو شتە بێ، کە ئەو هەموو شەوە خەونم پێوە بینیوە؟ ئێ باشە بۆ؟" ئێدی سەیری جەستە بچووکەکانی ناو ڕووبارەکەی کرد، کە هەندێک بازیان دەدا، هەندێک بەناو ئاوەکەدا دەڕۆیشتن، هەندێک سەتڵیان بە دەستەوە بوو، هەندێکی تریش لە دەرەوەی ڕووبارەکە و لەناو سەوزەگیاکەدا تلیان دەدا. ئێدی هەستی کرد دیمەنەکان هێمنییەکی تایبەتییان تێدایە. یەک منداڵ ئازاری منداڵێکی تری نەدەدا - کە ئەمە زۆر جار لەناو منداڵاندا ڕوو دەدات. ئێدی تێبینیی شتێکی تری کرد: منداڵەکان تاکە یەک کەسی پێگەیشتوویان لەناودا نەبوو، تەنانەت هەرزەکارێکیشیان لەگەڵ نەبوو، هەموویان منداڵی بچکۆلە و گەنمڕەنگ بوون و وا دەر دەکەوت خۆیان چاودێریی خۆیان بکەن.

چاوەکانی ئێدی کەوتنە سەر تاشەبەردێکی سپیی گەورە. کچێکی گەنجی بەژنڕێک لە منداڵەکانی تر جیا بووبووەوە و لەسەر تاشەبەردەکە وەستابوو و سەیری لای ئێدییەوەی دەکرد. کچەکە هەردوو دەستی بەرز کردەوە و بە ئاماژەیەک ئێدیی بۆ لای خۆی بانگ کرد. ئێدی دوودڵ وەستا، کچەکە زەردەخەنەیەکی کرد و دووبارە دەستی بۆ ئێدی بەرز کردەوە، ئینجا سەرێکی لەقاند، وەک ئەوەی بڵێت "ئا، ئا، تۆ دەڵێم!"

ئێدی وردەوردە نووکی گۆچانەکەی لە زەوییەکە هەڵچەقاند، بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بە سەرەولێژییەکەدا بێتە خوارەوە. ئێدی خزا و ئەژنۆ برینداره‌کەی چەمایەوە،

پێیەکانی خزان، بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوی بکەوێتە سەر زەوییەکە، هەستی کرد بایەکی زۆر بەهێز لە پشتی دا. بایەکە بەپێشدا پاڵی نا و خستیەوە سەر پێی خۆی. بەو شێوەیە ئێدی دووبارە هەستایەوە سەر پێ و بینیی گەیشتووەتە بەردەمی کچە بچووکەکە، وەستانەکەی بە شێوەیەک بوو، دەتگوت زۆر دەمێکە لەوێ وەستاوە.

# ئەمڕۆ یادی لەدایکبوونی ئێدییە

تەمەنی پەنجاویەك ساڵە. ڕۆژ، ڕۆژی شەممەیە. ئەمە یەکەم یادی لەدایکبوونیەتی بەبێ مارگریت. قاوەیەکی بێ کافاین دەکاتە پەرداخێکی کاغەزەوە و دوو پارچەسەموون بە کەرەوە دەخوات. لەدوای ئەو ساڵەوەی هاوسەرەکەی تووشی ئەو ڕووداوە بوو، ئێدی هەمیشە بەبێ ئاهەنگگێڕان کشەی لە هەموو یادەکانی لەدایکبوونی خۆی دەکرد و دەیگوت، "چ پێویست دەکا ئەو ڕۆژە بیری خۆم بخەمەوە؟" بەڵام مارگریت هەمیشە سوور بوو لەسەر یادکردنەوەی یادی لەدایکبوونی مێردەکەی، هەر خۆشی کێکەکەی دروست دەکرد و هاوڕێ و دۆستانی بانگهێشت دەکرد، پاکەتێك *نوقڵی تۆفی*شی دەکڕی و بە قردێلەیەك دەیبەست. هەموو جارێکیش بە ئێدیی دەگوت، "ناکرێ هەر وا بەئاسانی واز لە ڕۆژی لەدایکبوونەکەت بێنی."

ئێستا کە مارگریت نەماوە، ئێدی هەوڵ دەدات ڕۆژی لەدایکبوونەکەی لەبیر خۆی بەرێتەوە. لەسەر ئیش - وەك ئەوەی بەسەر شاخێکدا سەر بکەوێت - بەتەنیا خۆی بە پێچێکی یاریی ڕەوڕەوەی مەرگەکەوە هەڵدەواسێت، شەویش، لە شوقەکە سەیری تەلەفزیۆن دەکات. زووش دەخەوێت، نە

کێـك هەیـە، نـە میـوان، نـە هیـچ. ئەگـەر مـرۆڤ هەستی کـرد کەسێکی ئاسـاییە، ئـەوا بەئاسـاییش مامەڵـە دەکات، ئیتـر بـەم شێوەیە ڕۆژەکانـی ئێـدی یەکەیەکە خۆیـان دەدەن بەدەستەوە.

تەمەنـی شەسـت سـاڵە. ڕۆژ، ڕۆژی چوارشـەممەیە. زوو دەچێـت بـۆ وەرشـەکە. عەللاگەیەکـی قاوەیـی، کـە نانـی نیـوەڕۆی تێدایـە، دەکاتـەوە و لەتێـك لـە سۆسـجی نـاو لەفەکـە لێدەکاتـەوە و دەیـکات بـە قولاپێکـەوە، ئینجـا لـە کونـی سـەر ڕێگـە دارینەکـەوە قولاپەکـە شـۆڕ دەکاتـە خـوارەوە بـۆ نـاو ئاوەکـە. پـاش ماوەیـەك، دەبینێـت لەتـە سۆسـجەگە سـەرئاو دەکەوێـت، دواتریـش دەریاکـە قووتـی دەدات و دیـار نامێنێـت.

تەمەنـی شەستوهەشـت سـاڵە. ڕۆژ، ڕۆژی شـەممەیە. حەبەکانـی لەسـەر کەوانتەرەکـە بـڵاو دەکاتـەوە. تەلەفۆنەکـە لێدەدات. جـۆری برایەتـی لـە فلۆریـداوە. جـۆ هیـوای تەمەنێکـی درێـژ بـۆ ئێـدی دەخوازێـت، ئینجـا باسـی کوڕەزاکـەی خـۆی بۆ دەکات، پاشـانیش باسـی ڤێلـلا تازەکـەی. بەدرێژاییـی پەیوەندییـە تەلەفۆنییەکـە، ئێـدی پەنجـا جارێـك دەڵێـت، "ئەهـا! ئـێ، ئـێ!"

تەمەنـی حەفتاوپێنـج سـاڵە. ڕۆژ، ڕۆژی دووشـەممەیە. چاویلکەکـەی لەچـاو دەکات و سـەیری ڕاپۆرتەکانـی وەرشـەکە دەکات. تێبینیی دەکات یەکێك لە کارمەندەکان، شـەوی پێشـوو نەهاتـووە بـۆ ئیـش، بـەو هۆیەشـەوە ئیسـتۆپی *یاریـی کرمـی پێچاوپێـچ* تاقـی نەکراوەتـەوە. ئێـدی ئاهێـك هەڵدەکێشـێت و یەکێـك لـە ئاگادارکردنەوەکانـی سـەر دیوارەکـە، کـە لەسـەری

نووسـراوە *"لـە ئێسـتادا ئـەم یارییـە لەژێـر چاککردنەوەدایە."* هەڵدەگرێـت و دەیبـات لـە بـەردەم دەرگای چوونـەژوورەوەی یارییەکــەدا دای دەنێــت. دواتریــش، هــەر خــۆی ئیســتۆپی یارییەکـە تاقـی دەکاتـەوە و دڵنیـا دەبێـت کـە سـەلامەتە.

تەمەنــی هەشــتاودوو ســاڵە. ڕۆژ، ڕۆژی سێشــەممەیە. تاکسـییەك دەگاتـە بـەردەم دەروازەی شـاری یارییەکـە. ئێـدی خــۆی دەخزێنێتــە پێشــەوە و گۆچانەکــەی بــەدوای خۆیــدا ڕادەکێشــێت.

شــۆفێرەکە دەڵێــت، "زۆر جــار نەفــەرەکان حــەز دەکــەن بچنــە دواوە دابنیشــن."

ئێدی لێی دەپرسێت، "پێت ناخۆشە هاتوومەتە پێشەوە؟"

شۆفێرەکە شانێك بەرز دەکاتەوە، "نا، نا، زۆر ئاساییە."

ئێدی لە جامەکەوە سـەیری پێشـەوە دەکات و بە شـۆفێرەکە ناڵێـت کـە بۆیـە دێتـە پێشـەوە، چونکـە بـەم شـێوەیە هەسـت دەکات خــۆی ئوتومبێلەکــە لێدەخوڕێــت. دوو ســاڵە مۆڵەتــی شـۆفێرییەکەیان لـێ سـەندووەتەوە و لـەو کاتـەوە دەسـتی بـە سـووکانەوە نەگرتووەتـەوە.

تاکسـییەکە دەیبـات بـۆ گۆڕسـتانێك. ئێـدی لەوێ سـەردانی گـۆڕی دایکـی و گـۆڕی براکـەی دەکات، دواتریـش بـۆ چەنـد سـاتێك لەسـەر گـۆڕی باوکـی دەوەسـتێت، بەڵام وەك هەمیشـە، سـەردانکردنی گـۆڕی هاوسـەرەکەی دەخاتە کۆتاییـەوە. ئێدی، لەسـەر گـۆڕی مارگرێـت، بەسـەر گۆچانەکەیـدا دەنووشـتێتەوە، ئینجــا ســەیرێکی کێلەکــە دەکات و دونیایــەك شــتی بیــر دەکەوێتـەوە، لەسـەروو هەمووشـیانەوە، نوقوڵـی تۆفـی. ئێـدی

**بیـر لـەوە دەکاتـەوە، کـە ئەگـەر ئێسـتا نوقوڵـی تۆفـی بخـوات، ددانەکانـی هەڵـدەوەرن، بـەڵام ئەگـەر لەگـەڵ مارگرێـت بێـت، بەبـێ دوودڵـی دەکەوێتـە خواردنیـان.**

## دواوانە

کچە بچووکەکە لە خەڵکی وڵاتانی ئاسیا دەچوو، تەمەنیشی هەر شەش-حەوت ساڵێک دەبوو. پێستێکی جوان و گەنمڕەنگی هەبوو، ڕەنگی قژیشی، وەک ڕەنگی هەڵوژەڕەشە وا بوو. لووتی بچووک و تەخت بوو، لێوەکانیشی پڕ بوون و بەسەر ددانە شاشەکانیدا بڵاو بووبوونەوە. چاوەکانی کچەکە زۆر جوان بوون و دەتگوت قەترانی ڕەشن، یەک بریقەی سپییشیان کەوتبووە سەر. کچەکە زەردەخەنەی کرد و بەخۆشییەوە کەوتە هەلەکەسەما. دواجار، ئێدی هەنگاوێک لێی نزیک بووەوە و کچەش خۆی پێ ناساند.

کچەکە دەستەکانی خستە سەر سینگی و ناوی خۆی گوت، "تالا."

ئێدی ناوەکەی دووبارە گوتەوە، "تالا، تالا!"

کچەکە زەردەخەنەیەکی تری کرد، وەک ئەوەی یارییەک دەستی پێ کردبێت. کراسکێکی کەتانی نەخشداری لەبەردا بوو، کە بەشلی بەسەر شان و ملیدا بڵاو بووبووەوە و بە ئاوی ڕووبارەکەش تەڕ بووبوو. کچەکە دەستی خستە سەر کراسەکەی و گوتی، "بارۆ."

"بارۆ."

ئینجا دەستی لەو قوماشە سوورە چنراوە دا، کە لە سینگ و قاچەکانی ئالاندبوو، "سایا."

"سایا."

پاشان دەستی بۆ قاپقاپەکانی پێی ڕاکێشا، "باکیا،" دواتر بۆ گوێچکەماسییەکانی بەر قاچی، "کاپیز،" دواجاریش بۆ پارچەحەسیرێکی لە داربامبوو چنراو - کە لە بەردەمیدا ڕاخرابوو، "بانیگ." کچەکە ئاماژەی بۆ ئێدی کرد لەسەر حەسیرەکە دابنیشێت. خۆشی هات و چوارمشقی لەسەری دانیشت.

وا دەر دەکەوت هیچکام لە منداڵەکانی تر ئێدییان نەبینیبێت، بۆیە بۆخۆیان لەناو ئاوەکە شڵپەشڵپیان دەکرد و تلیان دەدا و بەردی ژێر ڕووبارەکەیان دەر دەهێنا. ئێدی سەیری کرد کوڕێک، بەردێک بە پشت و قوڵەکانی کوڕێکی تردا دەهێنێت.

کچەکە گوتی، "ئەوە پێی دەگوترێ شتن، هەر وەکوو ئەوەی ئیناسەکانمان پێشتر پەیڕەوییان کردووە."

ئێدی گوتی، "ئیناس؟"

کچەکە لە دەموچاوی ئێدی ورد بووەوە، ئینجا گوتی، "دایکمان."

ئێدی لە ژیانیدا دەنگی هەزاران منداڵی بیستبوو، بەڵام بە پێچەوانەی منداڵانی ترەوە، کە کاتێک لەگەڵ کەسێکی گەورەدا قسە دەکەن، دەترسن و دەشڵەژێن، ئەم منداڵەیان هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەک لە دەنگیدا نەدەخوێندرایەوە. ئێدی بیری لەوە کردەوە، کە تۆ بڵێی ئەم کچە و ئەم منداڵانە خۆیان ئەم قەراغ ڕووبارەیان وەک بەهەشت بۆ خۆیان هەڵبژاردبێت، یان بڵێی لەسەر بنەمای یادگارییە تەمەنکورتەکانیان ئەو

دیمەنە جوان و ئارامەیان بۆ هەڵبژێردرابێت.

کچەکە ئاماژەی بۆ گیرفانی کراسەکەی ئێدی کرد. ئێدی سەیری گیرفانەکەی کرد و بینیی ئەو تەلە بچووکانەی تێدان، کە ئێدی بۆ دروستکردنی ئاژەڵی بچووک بۆ منداڵان بەکاری دەهێنان.

ئێدی گوتی، "ئەمانە دەڵێی؟"

ئینجا تەلە بچووکەکانی دەر هێنا و لەگەڵ یەک تێکەڵی کردن، بە هەمان شێوەی ئەو کاتەی لە شاری یارییەکە تێکەڵی دەکردن و دەیکردن بەناو یەکدا. کچەکە خۆی بەرز کردەوە و هاتە سەر ئەژنۆ بۆ ئەوەی پرۆسەکە بەتەواوی ببینێت. دەستەکانی ئێدی دەلەرزین، بەڵام هەرچۆنێک بێت، لەگەڵ دواتێکەهەڵکێشکردنی تەلەکاندا گوتی، "چاوت لێیە؟ ئەوە بوو بە... سەەەەگ."

کچەکە تەلەکانی - کە ئێستا سەگێکیان لێ دروست بووبوو - لە ئێدی وەر گرت و پێکەنی، پێکەنینێک، کە ئێدی هەزاران جار بینیبووی.

ئێدی پرسیی، "بەدڵتە؟"

کچەکە، کە جوان قسەی نەدەزانی، وەڵامی دایەوە، "تۆ من دەسووتێنی."

ئێدی هەستی کرد شەویلگەی ڕەق بوو.

"گوتت چی؟"

"تۆ من دەسووتێنی، تۆ من دەکەی ئاگر."

دەنگی کچەکە لەسەر یەک تۆن دەڕۆیشت، وەک دەنگی منداڵێک، کە وانەی پێشوو بۆ مامۆستاکەی بڵێتەوە.

"ئیناکەم گوتی من لەناو نیپاکەدا چاوەڕێ بکەم. ئیناکەم دەڵێ من خۆم بشارمەوە."

ئێدی دەنگی نزم کردەوە و بە ڕستەیەکی زۆر خاو و ڕوون بە کچەی گوت، "خۆت لە چی بشاریتەوە، کچە بچکۆلە؟"

کچەکە دەستی لە سەگە لەتەلدروستکراوەکەوە دا و بە ئاوەکەدا هێنای و بردی، ئینجا وەڵامی دایەوە، "سەندالۆنگ."

"سەندالۆنگ چییە؟"

کچەکە سەری بەرز کردەوە و گوتی، "سەرباز."

وشەکە وەک چەقۆ لە زمانی ئێدی هەڵچەقی. دەستبەجێش چەندین وێنە و دیمەن بەهوروژم خۆیان کرد بەناو مێشکی ئێدیدا: دیمەنی سەربازەکان، دیمەنی تەقینەوەکان، مۆرتۆن، سمیتی، کاپتنەکە، ئاگرپرژێنەکان...

ئێدی بەچرپە گوتی، "تالا..."

تالا بەدەم پێکەنین بە ناوەکەی خۆیەوە، ناوەکەی دووبارە کردەوە، "تالا."

"تۆ بۆچی لەم شوێنەدای لە بەهەشت؟"

کچەکە ئاژەڵەکەی دەستی داگرتە خوارەوە.

"تۆ من دەسووتێنی. تۆ من دەکەی ئاگر."

ئێدی هەستی کرد چاوەکانی خەریکە دەر بپەڕن. خوێن بە هورووژم دەهات بۆ سەری و هەناسەکانی خێرا بوون، ئینجا گوتی، "تۆ لە فلیپین بووی... تارماییەکە... ناو کووخە دارینەکە..."

"ناو نیپاکە. ئینا دەڵێ لەوێ سەلامەت دەبم. لەوێ چاوەڕێی بکەم، سەلامەت دەبم. دوایی دەنگێکی زۆر گەورە.

ئاگرێکی گەورە، ئیتر تۆ من دەسووتێنی."

کچەکە شانە بچووکەکانی هەڵتەکاند و بەردەوام بوو، "نیپا سەلامەت نەبوو."

دەستەکانی ئێدی دەلەرزین. ئێدی تفێکی قووت دا و سەیری چاوە ڕەشەکانی کچەکەی کرد، ئینجا هەوڵی دا زەردەخەنەیەک بکات - وەک ئەوەی زەردەخەنەکەی چارەسەرێک بێت و پێویست بێت بیدات بە کچە بچووکەکە. کچەکە زەردەخەنەی بۆ کردەوە، بەڵام ئەوە ئێدیی لەتلەت کرد. ئێدی دەموچاوی شێوا و خستیە ناو دەستەکانیەوە، هەر لەو ساتەشدا شان و سییەکانی شل بوون. دواجار، ئەو تارماییەی تەواوی ژیانی ئێدیی تاریک کردبوو، خۆی دەر خست و لە تارماییەوە بوو بە ڕاستەقینە، بوو بە گۆشت و خوێن، بوو بەم منداڵە، ئەم منداڵە جوانەی ئێدی بە دەستەکانی خۆی کوشتبووی، بە دەستەکانی خۆی سووتاندبووی. بۆیە ئێدی پێی وا بوو شایانی دانەبەدانەی ئەو خەونە ترسناکانە بوو، کە بینیبوونی. ئێدی شتێکی بینیبوو، تارماییەکی لەنێوان بڵێسەکاندا بینیبوو! مردنێک لەسەر دەستە ئاگراوییەکانی ئەو ڕووی دابوو. لافاوێک فرمسێک بەنێوان پەنجەکانی ئێدیدا هاتە خوارەوە و ڕووحی خەریک بوو دەبووە وێرانە.

ئێدی دەستی کرد بە شیوەن و ناڵەوهاوارێکی لێ بەرز بووەوە، کە خۆشی پێشتر هەرگیز گوێی لێ نەبووبوو، ناڵەوهاوارێک، کە لە قووڵاییی بوونیەوە دەهاتە دەرەوە و ڕووبارەکەی دەهەژاند و هەوا شێدارەکەی بەهەشتی پەرش دەکردەوە. جەستەی ئێدی گرژ بوو، سەریشی شێتانە بەملاولادا دەکەوت، تا ئەو کاتەی ناڵەوهاوارەکەی گۆڕا بۆ

دەنگێکی نزائاسا و چەند وشەیەک، وەک دانپێدانانێکی قورس، لە قورگە وشکەکەیەوە هاتنە دەر، "من... تۆم کوشت، من... تۆم... کوشت."

پاشان ئێدی "بمبەخشە"یەکی بەچرپە بۆ وشەکانی پێشووی زیاد کرد و دووبارە گوتیەوە، "بم... بەخشەەەە... ئەی هاوار خوایە گیااان، چیم کردووە من، چ کارەساتێکم ناوەتەوە؟" ئێدی هەر دەگریا و دەگریا، هەتا ئەوەی گریانەکە تەواو وشکی کردەوە و خستیە لەرزەلەرز، پاشان بۆخۆی بەبێدەنگی دەلەرزی و بەملاولادا دەشنایەوە. ئێدی لەسەر حەسیرێک، لە بەردەمی کچە بچووکە قژڕەشەکەدا کەوتبووە سەر ئەژنۆ، کچەکەش بۆخۆی لەقەراغی ئەو ڕووبارە خوڕەدا یاریی بەو ئاژەڵە دەکرد، کە بە تەلی باریک بۆی دروست کرابوو.

پاش ماوەیەک، ئێدی- دوای ئەوەی ئازارەکەی دامرکابووەوە - هەستی کرد دەستێک هاتووەتە سەر شانی. سەری بەرز کردەوە و بینیی تالایە و بەردێکیشی بە دەستەوە گرتووە.

تالا گوتی، "تۆ من بشۆ." ئینجا هەنگاوی نا بۆ ناو ئاوەکە و پشتی کردە ئێدی. پاشان، کراسە کەتانەکەی بەری هەڵکرد و لەپشتەوە هێنایەوە بۆ سەر سەری.

ئێدی بە بینی پشتی کچە بچووکەکە، هەموو گیانی گرژ بوو. پێستی تالا زۆر خراپ سووتابوو، سینگ و ناوشانەکانی ڕەش بووبوون و تلۆقیان کردبوو. کاتێکیش لای کردەوە، هەندێک شوێنبرینی قورس لەسەر دەموچاوە جوان

و منداڵانەکەی دەر کەوتن و لێوەکانی شۆڕ بووبوونەوە. تەنیا یەک چاوی کرابووەوە، بە هۆی ئەوەشەوە کە پێستی سەری سووتابوو، قژی بووبوو بە پەڵەپەڵە، سەریشی بە برین و سووتاویی لینج داپۆشرابوو.

تالا بەردەکەی ناو دەستی بەرز کردەوە و دووبارە گوتی، "تۆ من بشۆ."

ئێدی هەرچۆنێک بێت چووە ناو ڕووبارەکە و بەردەکەی لە کچەکە وەر گرت. پەنجەکانی دەلەرزین. بۆڵەیەکی لێوە هات، کە بەئەستەم دەبیسترا، "نازانم چۆن بتشۆم، من قەت منداڵم نەبووە..."

کچەکە قۆڵی - کە بووبوو بە خەڵووز - بەرز کردەوە. ئێدی قۆڵی گرت و بەهێواشی بەردەکەی پێدا هێنا، تا ئەوەی برینەکان یەک بەدوای یەکدا پروان. ئێدی بەردەکەی توندتر بە قۆڵی کچەکەدا هێنا و برینەکانی بەردایەوە. هەر بەردەوام بوو لەسەر ئەم کارە، تا ئەو کاتەی گۆشت و پێستی تەندروست و پاک لەسەر جەستەی تالا دەر کەوتنەوە. ئێدی بەردەکەی هەڵگێڕایەوە و بە پشتەمل و شانەکان و پشتی تالایدا هێنا، کە ئێسقەکەکانی دەر پەڕیبوون، دواجاریش گەیشتە ڕوومەتەکانی و ناوچاوانی و پشت گوێیەکانی.

کچەکە بەپشتدا بۆ لای ئێدی خۆی چەماندەوە و سەری خستە سەر بەشی پێشەوەی شانی ئێدی، ئینجا، وەک ئەوەی بیەوێت سەرخەوێک بشکێنێت، چاوی نووقاند. ئێدی بەهێمنی بەردەکەی بە پێڵووی چاوەکانی تالادا دەهێنا، ئینجا سەیری لێوە شۆڕەوەبووەکانی و بەشە سووتاو و ڕووتەکانی پێستی سەری کرد، تا لەناکاو قژە ڕەشەکەی لەو شوێنە ڕووتاوە و

سافانەوە سەری دەر هێنایەوە و دووبارە ئەو دەموچاوەشی بۆ دروست بووەوە، کە ئێدی لە سەرەتادا بینیبووی.

کاتێک کچەکە چاوی کردەوە، چاوەکانی وەک قوللەی سەر کەشتی و قەلاکان ڕووناکییان لێوە پەخش دەبوو، ئینجا گوتی، "من پێنجم."

ئێدی بەردەکەی دەستی داگرت، هەڵدەلەرزی و هەناسەکانی کورت و قورس بوون، "پێنج... ئی، ئی، پێنج سالان؟..."

کچە هەر بە سەربادان گوتی، "نا" ئینجا پێنج پەنجەی یەکێک لە دەستەکانی کردنەوە و خستنیە سەر سینگی ئێدی، وەک ئەوەی پێی بڵێت، "پێنجەم کەسی تۆ."

شەماڵێکی گەرم هات. فرمێسکێک بەسەر ڕوومەتی ئێدیدا هاتە خوار. تالا بە چاو، دوای فرمێسکەکە کەوت، هەر وەک چۆن منداڵ لەناو پەلە گیایەکدا بە چاو دوای خاڵخاڵۆکە دەکەون. کچەکە کەوتەوە قسە، "بۆچی دڵتەنگ؟"

ئێدی بە دەنگێکی نزم گوتی، "مەبەستت ئەوەیە بۆچی دڵتەنگم؟ تەنانەت لێرەش، لە بەهەشت؟"

کچەکە بەدەست ئاماژەیەکی بۆ خوارەوە کرد، "نا، بۆچی لەوێ دڵتەنگ!"

ئێدی دایە پرمەی گریان، پرمەی گریانێکی بەتاڵ، وەک ئەوەی سینگی بەتاڵ بووبێتەوە. ئێدی خۆی دابوو بەدەست هەموو لەمپەرەکانەوە و ئێستا ئیدی گفتوگۆکە، گفتوگۆی نێوان منداڵێک و کەسێکی پێگەیشتوو نەبوو. ئێدی وەلامی کچەکەی دایەوە و ئەوەی پێ گوت، کە بە هەرکەسێکی تری گوتبوو: بە مارگرێت، بە ڕووبی، بە کاپتنەکە، بە پیاوە

شینەکە، لە هەموو کەسێکیش زیاتر، بە خۆی.

"بۆیە دڵتەنگ بووم، چونکە هیچ سوودێکم لە ژیانی خۆم نەبینی. چی بووم؟ هیچ نەبووم، هیچم بەدەست نەهێنا، سەرلێشێواو بووم، وام هەست دەکرد هەر لە سەرەتاوە هیی ئەوە نەبووم بچمە ئەوێ."

تالا سەگە بەتەلدروستکراوەکەی لە ئاوەکەدا نوقم کرد.

"دەبووایە بچیتە ئەوێ."

"کوێ؟ شاری یاریی ڕووبی؟"

کچەکە سەرێکی لەقاند.

"بۆ ئەوەی یارییە شکاوەکان چاک بکەمەوە؟ من بۆ ئەوە دروست کرابووم؟"

ئێدی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەردەوام بوو، "ئێ باشە بۆ؟ بۆ؟"

کچەکە سەری لار کردەوە، وەک ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی ئێدی زۆر ڕوون بێت.

کچەکە گوتی، "منداڵان. تۆ دەیانپارێزی، تۆ بۆ من باش دەکەی."

کچەکە، سەگەکە بەتەلدروستکراوەکەی بەسەر کراسەکەی ئێدیدا هێنا و برد، ئینجا گوتی، "تۆ پێویستە لەو شوێنە بی،" پاشان بە سووکەپێکەنینێکەوە دەستی لەو پارچەقوماشە بچووکە دا، کە کرابوو بە کراسەکەی ئێدییەوە و ئەم دوو وشەیەی گوت، "ئێدی/ چاودێر."

ئێدی زیاتر چووە ناو ئاوی خوڕی ڕووبارەکەوە. بەردی ناو هەموو چیرۆکەکانی ژیانی لەدەوری بوون، لەژێر ئاوەکەدا

بوون و پاڵیان بەیەکەوە دابوو. ئێدی هەستی دەکرد خەریکە جەستەی دەتوێتەوە و دەبێت بە هەوا، ئینجا ئەوەشی بیر کەوتەوە، کە کاتی زۆری نەماوە و دوای بینینی ئەو پێنج کەسە، هەموو شتێک دەکەوێتە سەر شانی خۆی.

ئێدی بەچرپە گوتی، "تالا؟"

تالا سەری هەڵبڕی.

"ئەو کچە بچووکەی لە شاری یارییەکە بوو؟ تۆ هیچی لەسەر دەزانی؟"

تالا لە پەنجەکانی خۆی ورد بووەوە و بە سەرلەقاندنێک بە *بەڵێ* وەڵامی دایەوە.

"ئەی ڕزگارم کرد؟ توانیم ڕای بکێشم و نەهێڵم کورسییەکە بەری بکەوێ؟"

تالا سەری با دا، "ڕات نەکێشا."

ئێدی لەرزی و سەری داخست. ئەوەی دەیویست، بیستی، ئەوە کۆتاییی چیرۆکەکە بوو.

تالا گوتی، "پاڵت پێوە نا."

ئێدی سەری بەرز کردەوە، "پاڵ؟"

"پاڵ بە قاچەکانیەوە نا. ڕاکێشان نەبوو. تۆ پاڵ نا. شتی گەورە کەوتە خوارەوە. تۆ ئەوت سەلامەت کرد."

ئێدی چاوەکانی بەنکووڵیکردنەوە لە قسەکانی کچەکە نووقاند و گوتی، "بەڵام من هەستم بە دەستەکانی کرد. ئەوە تەنیا شتە، کە بیرمە. ناکرێ پاڵم پێوە نابێ، هەستم بە دەستەکانی کرد."

تالا زەردەخەنەیەکی کرد و دەستەکانی پڕ کرد لە ئاوی ڕووبارەکە، ئینجا پەنجە بچووک و تەڕەکانی خستە ناو

دەستە گەورەکانی ئێدییەوە. ئێدی دەستبەجێ هەستی کرد پێشتر دەستی بەر ئەو پەنجانە کەوتووە.
تالا گوتی، "دەستەکانی نا، دەستەکانم! من تۆ هێنا بۆ بەهەشت، تۆ سەلامەت دەبی."

لەگەڵ ئەو دواڕستەیەدا، ئاستی ئاوی ڕووبارەکە تا کەمەری ئێدی بەرز بووەوە و وردەوردە تا سینگ و شانەکانیشی سەر کەوت. پێش ئەوەی هەناسەیەکی تر هەڵبکێشێت، دەنگەدەنگی منداڵەکان لەسەر سەریەوە کپ بوو، ئینجا شەپۆلێکی بەهێز، بەڵام بێدەنگ، تەواو نوقمی کرد. هێشتا دەستی ئێدی هەر لە دەستی تالادا بوو، بەڵام هەستی کرد جەستەی لە ڕووحی داماڵرا، گۆشتەکەی لە ئێسکەکانی بووەوە و لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەو ئازار و بێتاقەتییانەی لە ناخیدا پەنگیان خواردبووەوە، هەموو جێسووتاوییەکانی، هەموو برینەکانی، هەموو یادەوەرییە تاڵەکانی هاتنە دەرەوە لێی.
ئێدی ئێستا هیچ نەبوو، هەر وەک گەڵایەک وا بوو بەسەر ئاوەکەوە، تالاش بەنەرمی بەناو تیشک و سێبەرەکاندا دەیهێنا و دەیبرد، بەناو ڕەنگی شین و سەوز و کایی و ڕەش و لیمۆییدا پیاسەی پێ دەکرد. ئێدی ئێستا درکی بەوە کرد، کە ڕەنگەکان هەموو هەستەکانی ناو ژیانی بوون. تالا بەناو شەپۆلەکانی زەریایەکی خۆڵەمێشیی بەریندا ئێدیی بەرەو سەرەوە هێنا و ئێدی لەناو ڕووناکییەکی زۆر قەشەنگەوە و بەسەر دیمەنێکی چاوەڕواننەکراو و جواندا سەری دەر هێنایەوە.

دیمەنەکە شارێکی یاریی گەورەی سەر زەریایەکی خۆڵەمێشیی بەرین بوو، هەزاران کەس تیایدا بڵاو بووبوونەوە، ژن و پیاو، دایکان و باوکان و منداڵان - منداڵەکان زۆر زۆر بوون - منداڵانی ئێستا و ڕابردوو، ئەوانەی هێشتا لەدایک نەبووبوون، هەموو بەتەنیشت یەکەوە، دەستلەناودەست، هەریەکە بە جلوبەرگێکەوە، یەکێک بە کڵاوەوە، یەکێک بە شۆرتەوە، سەر ڕێگە دارینەکە و کورسیی ناو یارییەکانی سەکۆی چاوەڕێکردنی بەردەم یارییەکانیان پڕ کردبوو، هەندێک چووبوونە قەڵاندۆشکانی ئەوانی تر و هەندێکیش چووبوونە باوەشی یەکترەوە. ئەو منداڵانە یان پێشتر لەو شوێنە بووبوون، یان لە ئایندەدا دەهاتن بۆی، هۆکاری سەرەکیی ئەمەش ئەو کارە سادە و ڕۆتینییانە بوون، کە ئێدی لە ژیانیدا لەو شاری یارییەدا کردبوونی و ڕێی لە ڕوودانی چەندین ڕووداوی دڵتەزێن گرتبوو، چەندین یاریی چاک کردبووەوە و بەسەلامەتی هێشتبوونیەوە، هەموو ڕۆژێکیش چەندین پێچی نەبینراوی بە ژیانی ئەو منداڵانە کردبووەوە و پاراستبوونی.

هەرچەندە ئامادەبووانی شارە یارییەکە، لێوەکانیان نەدەجووڵاند، بەڵام ئێدی گوێی لە دەنگیان بوو، دەنگەکان ئەوەندە زۆر بوون، کە ئێدی هەرگیز دەنگەدەنگی وا زۆری گوێ لێ نەبووبوو، بەڵام لە ساتێکدا خامۆشی و ئارامییەک باڵی بەسەردا کێشا، کە هەرگیز پێشتر تامی نەکردبوو. ئێستا ئیتر دەستی لە دەستی تالا بەر بووبوو، پاشانیش بەرز بووەوە، بەرزتر لە کەنارەکە، ئینجا بەرزتر لە ڕێگە دارینەکە و خێمە و گومەزەکانیش، تا ئەوەی بەرەو لووتکەی بەرز و

سپیی چەرخوفەلەکەکە ڕۆیشت و گەیشتە سەری سەرەوە. لەوێ، یەکێک لە کابینەکانی چەرخوفەلەکەکە لەسەرخۆ ڕادەژەنی و ژنێکی تێدا بوو، ژنێک بە عەزییەکی زەردەوە: هاوسەرەکەی خۆی، مارگرێت، کە لەوێ بە باوەشی کراوەوە چاوەڕێی ئێدیی دەکرد. ئێدی خێرا خۆی گەیاندە مارگرێت، دەستی گرت و دووبارە زەردەخەنەکەی بینییەوە. هەر لەو ساتەشدا هەموو دەنگەکان لە تاقە یەک دەنگ و یەک وشەی خودادا توانەوە:

"ماڵەوەەەە!"

# کۆتایی

سێ ڕۆژ دوای ڕووداوەکە، شاری یاریی ڕووبی کرایەوە. چیرۆکی مردنی ئێدی بۆ ماوەی هەفتەیەک لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەکان مایەوە، بەڵام دواتر، چیرۆکی مردنی تر شوێنیان گرتەوە.

ئەو یارییەی ناوی *یاریی کەوتنەخوارەوەی سەربەست* بوو، بۆ ئەو وەرزە داخرا، بەڵام ساڵی دواتر، بە ناوێکی تازە و بە ناوی *سەرکێشییە گەورەکە*وە کرایەوە. هەرزەکاران وەک بەڵگەی ئازایەتی سەیریان دەکرد. یارییەکە زۆر سەردانکەری بۆ لای خۆی ڕاکێشا و خاوەنەکانی شارە یارییەکەش زۆر دڵخۆش بوون بەوە.

شوقەکەی ئێدی – ئەو شوقەیەی تیایدا گەورە بووبوو – درا بەکرێ بە کەسێکی تر، ئەو کەسەش شووشەیەکی نەخشداری ڕەنگاوڕەنگی گرتە پەنجەرەی مەتبەخەکە و دیمەنی یاریی بابەخولێی ئەسپەکەی لێڵ کرد. دۆمینگێز، کە ڕازی بووبوو ئیشەکەی ئێدی وەر بگرێت، هەموو ئەو شتومەکە کەمانەی کۆ کردەوە، کە لەدوای ئێدی بەجێ مابوون، پاشان خستنیە سندوقێکەوە و لە وەرشەکە هەڵی گرتن، سندوقەکەشی خستە تەنیشت یادگارییەکانی تری

شاری یاریی ڕووبی، کە یەکێکیان وێنەی یەکەمین دەروازەی شاری یارییەکە بوو.

نیکی، ئەو کوڕە گەنجەی سویچەکەی بەر بووبووەوە و کێبڵەکەی خوارد، سویچێکی تری دروست کردەوە و دوای چوار مانگ، ئۆتومبێلەکەی فرۆشت. نیکی زوو زوو دەهاتەوە بۆ شاری یاریی ڕووبی و لای هاوڕێکانی خۆی بەوەوە با دەدا، کە شاری یارییەکە بە ناوی داپیرەگەورەی ئەوەوە ناو نراوە.

وەرز هاتن و وەرز تێپەڕین. کاتێکیش قوتابخانە بڕایەوە و ڕۆژ درێژ بوو، دیسان جەنجاڵی کەوتەوە ناو ئەو شارە یارییەی سەر کەناری زەریا خۆڵەمێشییەکە - هەرچەندە ئێستا ئیدی شارێکی یاریی ئەوەندە گەورەش نەبوو، بەڵام هەر باش بوو. هاوین هات، جۆشوخرۆش لە دەمارەکان گەڕایەوە، کەنارەکە پڕ بووەوە لە نەغمەی شەپۆلەکان، سەردانکەرانی شاری یارییەکە دووبارە ڕیزیان بەستەوە بۆ یاریی بابەخولێی ئەسپەکە و چەرخوفەلەکەکە و دووبارە چوونەوە ڕیزەوە بۆ کڕینی پەشمەک و ئەزبەرید.

خەڵک لە شاری یاریی ڕووبی ڕیزیان بەستبوو - هەر وەک چۆن لە شوێنێکی تر پێنج کەس بە پێنج یادگاریی دیاریکراوەوە ڕیزیان بەستبوو، هەمووشیان پێکەوە چاوەڕێیان دەکرد کچێکی بچووک - کە ناوی *ئەیمی* یان *ئانی* بوو - گەورە ببێت، خۆشەویستی بکات، پیر ببێت، بمرێت و دواجار وەڵامی پرسیارەکانی بدرێتەوە، پاشان تێبگات بۆچی ژیا و بۆ چ شتێک ژیا! لەو ڕیزە پێنجکەسییەشدا کە چاوەڕێی ئەو کچەکە بچووکە بوون، پیاوێکی سەر و ڕیش سپی، بە

لووتێکی چەماوە و کڵاوێکی کەتانەوە، لە شوێنێک بە ناوی *سەکۆی ستاردەست* چاوەڕێ بوو، تا کاتی خۆی بێت و نهێنییەک لە نهێنییەکانی بەهەشت بۆ کچەکە بگێڕێتەوە، نهێنیی ئەوەی ژیانی *هەریەکەمان کار دەکاتە سەر ژیانی ئەوەی دوای خۆی و ژیانی ئەویش کار دەکاتە سەر ژیانی ئەوەی دواتر، نهێنیی ئەوەی کە دونیا لێوانلێوە لە چیرۆک، بەلام لە بنەڕەتدا هەموو چیرۆکەکان یەکێکن.*

دەمەوێت زۆر سوپاسی جانینی هاوسەرم بکەم، کە چەندین جار ئەم کتێبەم بە دەنگی بەرز بۆ خوێندەوە و ئەویش بەئارامگرییەوە گوێی لێ گرتم، هەروەها سوپاسی زۆرم بۆ هاوڕێیانم، ڕۆدا و ئیرا و کارا و پیتەر، کە بۆ یەکەمین جار پێکەوە چووین بۆ سواری چەرخوفەلەك، دواجاریش، سوپاس بۆ مامی خۆشەویستم، ئێدیی ڕاستەقینە، کە زۆر پێش ئەوەی من چیرۆکەکانی خۆم بگێڕمەوە، ئەو چیرۆکەکانی خۆی بۆ گێڕامەوە.

میچ ئەلبوم

ئێدی سەربازێکی دێرینی تەنیایە. لە یادی لەدایکبوونی هەشتاوسێ ساڵەیدا، کاتێک هەوڵ دەدات کچێکی بچووک لە مردن ڕزگار بکات، لە *شاری یاریی ڕووبی* بە کارەساتێکی تراژیدی دەمرێت. لەگەڵ هەڵکێشانی دواهەناسەیدا، ئێدی هەست بە دوو دەستی بچووک دەکات لە دەستەکانیدا و دوای ئەوە هەموو شتێک خامۆش دەبێت. دواتر لە بەهەشت بەئاگا دێتەوە و تێدەگات کە بەهەشت تەنیا خۆشی و دیمەنی جوان نییە، بەڵکوو شوێنێکە تیایدا لەلایەن پێنج کەسەوە وەڵامی پرسیارەکانت دەدرێتەوە و ژیانی دونیات بۆ ڕوون دەکرێتەوە. دەکرێت ئەو پێنج کەسە دۆست و کەسی نزیکت بن، دەشکرێت نەناسیاو بن، بەڵام هەریەکەیان بە هۆکارێکی گرنگ هاتووەتە ژیانتەوە و کاریگەریی گەورەی هەبووە لەسەری.






٦٠٠٠ دینار